# وتەیەك

غەریبیی (نسێ)یەو خۆرەتاوی نیشتمان لێی ناداو تین و تاوو گەرمای ڕۆحی وڵات نایگرێتەوە. جگە لە یەکدوو شیعرێ ئیتر هەر هەموو ئەو شیعرانەی لەم دیوانەدا کۆبوونەتەوە لەو نسێ نسرم و کۆسارە ساردانەی ئاوارەییدا لەنێوان ساڵانی 1997/1996 و سەرەتای 1998 دا لەدایکبوون و بەدەم هەڵ لەرزینی جەستەی خەونە پەرت پەرت و زڕاوەکانیانەوە پێڵوی وشەیان هەڵهێناوە. هەر لەبەر ئەوەیش (نسێ) بوو بە ناونیشانیان. وائیستەیش لەو نسێیەوە گەڕاونەتەوە بەردەم بەربەرۆچکەی چاوی ئێوەو لە ساڵی تازەی 1999 دا ئەبنە ئاوێنە ڕووناکەکانی بەردەمتان!.

شێرکۆ بێکەس
سلێمانی – کۆتایی ساڵی 1998

# سروودەکانی (مەلەك تاووس)

لە کەناری شەوێکی سپییەوە کەوتمە ڕێ و
هەنگاوم زەمینی داچڵەکان
هەوا ڕەنگین و خەیاڵم کەژێکی
دەم بە خەندەی ئاسۆگەی بینین بوو.
لەڕۆخی شەوێکی زیوییینەوە
پەڕیمەوە ئەو بەری:
ولاَتی تەلیسم و
ئەفسوونی فڕین و خەوبینین.
چوارگۆشەیەك
پەنجەرەی بوونم بوو.
چوارگۆشەیەك بنەماو
چوارگۆشەیەك مەوداکانی ڕوانینم بوو:
هەواو دەنگی هەواو
گڵ و نیگای گڵ و
ئاوو زیندەگی ئاو بوو.

هەموو چوكڵەی ئەستێرەیەك بۆ من جۆلانەیەك و
هەموو كوێستانەكانی شەختە بەند ئاوێنەم بوون.
من كوانوو بووم
بۆ ئاگرێكی تازە زاو.
هێلانە بووم
بۆ باڵندە بەردینەكان و لەنگەرێك بووم
لەناو تەمی گومانێكدا هەڵپڕوزاو
لەشم لەشی بەرانە كێوییەكی تەڕی
بەر ڕێژنەی پرسیارو گژەبای دوو دڵی و
چاوەكانم دوو بازی باڵ داگیرساو بوون.
من ئەو دەمە
گۆرانیی گێژەنێكی خوێن گەرم و
شەتاوێكی لاساری كاوانەكان بووم:
لە تەوقە سەری ئەوینێكی كەف چرێنی چاو نەترسەوە
ئەڕژامە گۆلاوەكانی كازیوەوە.
سامێك بووم
لە شێوەی گەرداوێكی شێت و وێتدا
تین و تاوێك بووم
لە شێوەی شمشێری سوورە هەتاودا.
لە ئەشكەنجەدا هاژەم ئەكردو
لە مەحاڵدا باڵم ئەگرت.
من ئەو دەمە

باهۆزێ بووم
کلاَوی هەورە تریشقەم لەسەر ئەکرد.
من هەر لەبەردی هەتاوو
لە کێوی خۆڵەمێشی خۆم
یەزدانی خۆم دروستکردو
لە دارستانی زمانە چەند جار سووتاوەکەی خۆمدا هەڵمکرد.
من بەفرێکی ڕەش هەڵگەڕاوی
یاخی بووم و لە سوورەتەکانی
خوای بیابان جیابوومەوە.
داربەڕووە هەرە پیرەکانی شەوگار
منیان نووسییەوەو هاوڕێ و هاودەمی بە ئەمەکی
پۆلە کەوی پەرەوازەو سەرگەردانی جەستەی خۆم بووم.
سەرم نەدایە دەست گوڵەکانی بەهەشتی ئارام و دڵنیایی.
لە وەیشوومەکانی مەرگدا
مزگێنییەکی دەم و لێو خوێناویی بووم.
من ئەو دەمە
ئەسپی ڕۆژگارە چەمووشەکانم ڕام ئەکردو
لەچەرمی بلێسە
(زین)م بۆ دروست ئەکردن و سواریان ئەبووم.
من کارەساتم ئەئاژوو
(بەلاَ)م جڵەو ئەکردو
دەستم بەیاڵی دوارۆژدا ئەهێناو

پەیامی ڕەهێڵە کەسکەکان و
مژدەی گوناهە زیندانیەکان و
ناو هەناوی تاریکیی بووم.
برین بە برین
شاخ بە شاخ و
مەرگ بە مەرگ
(سنجاق)ە پەیکەری (مەلەك تاوس)م
لەگەڵ هاوارە ڕوناکەکانی خۆمدا ئەگێڕاو
ئازارێکی ڕەوان بێژ بووم.
من (قەوال)ی گەڕۆکی
خۆڵ و پرشنگ و ئاو بووم.
بە دەم لێدانی تەپڵی بەردوو
ژەنینی بلوێری ڕەوەزەکانەوە
دەرگای ماڵ بە ماڵی:
فرمێسکە قەتیس ماوەکانی شاخم ئەقڵێشاندەوە.
بەدەم لرفەوە
کڵپەم ئەگێڕایەوەو
گەرداوم ئەخوێندەوەو
بوومەلەرزەم ئەنووسیەوە.
من (قەوال)ی ئاینێکی دەرکراوی
بەهەشتە گەورەکان بووم.
لەسەر (ئاگر)و خۆشەویستیی (ئاگر)

بە نەفرەت کرام.
(قەوال)ی (مەلەك تاوس) بووم.
ڕۆژژمێری دەست و پەنجەی
هەڵوەریوی میدیەکان و
(کەلام خوێنی) (میترا) بووم.
ئای میترای دۆزەخەکەم!
چەند خوا پەلاماریان دایت و
چەند ئەهریمەن دابەشیان کردی!..
من (کەلام خوێنی) سنەوبەرو
کەلام خوێنی پشکۆکانی ئاگردانی ناو گیانت بووم.
هەرچی بەیت و حیکایەت و سەر گوزشتەی حەوت
خواوەندەکانی خۆمە لەبەرم بوون.
ئەو حەوت خواوەندەی
وەك حەوت لاولاوی تەلیسماویی
لە ئاخافتنم ئالأبوون.
(خواوەندی هەتاو، خواوەندی مانگ،
خواوەندی فەلەك، خواوەندی ئەستێرەی بەیان،
خواوەندی بەهەشت، خواوەندی دۆزەخ.
خواوەندی گیانلەبەرو ئادەمیزاد.)
حەوت خواوەندەکەم
هەموو گەردوو گوڵی بەیانییەك
حەوت زەریایان بۆ ئەهێنام

حەوت چەپکە گوڵی ئاگرو

حەوت پرشنگیان بۆ ئەهێنام.

منیش لە حەوت گۆشەی دەروونمدا دامنابوون.

بە حەوت توێژاڵە ئەوین دامئەپۆشین.

بە حەوت چاو تەماشام ئەکردن و

حەوتەوانەی گەردوونم بوون.

حەوتەوانەی درەوشاوەی ناو سەرم بوون.

من ئەڕۆیشتم و ئەوان باڵیان لێ ئەڕواندم.

من ئەفڕیم و خوێنی خۆم

لە دوو توێی هەوایەکی سورمەچنی قەدکراودا

هەڵئەگرت.

سەفەرەکانم

سەفەری سەری بڕڕاوم بوون.

دوورگەی بەفرێ بووم

چوار دەورم بە لوورەی بتەکان تەنرابوو.

مەنجەنیقی سورەتی بیابانەکان بە شوێنمەوە بوون.

لم بەشوێنمەوە بوو.

سەفەرەکانم

سەفەری ڕووباری سەرهەڵگرتووی

ناو ئۆقیانووسێکی نادیار بوو.

سەفەری شەپۆلی خودایی و

ژانی خودایی و

سەفەری

گەوهەرێکی سپیی بێ کۆتایی بوو.

(من ئەهلی خودام و باڵندەی زۆزان)

بە فڕینی مەلەك تاوسەکەی من

ئاسمان قووڵ بۆوە.

هەر بە باڵەکانی ئەویش بوو

هەتاو یەکەمین نامەی خۆی بۆ باران نوسیی.

لە (یەك شەممەیەکی) سپیدا

لەیەکەم ڕۆژی زایینی دنیادا

یەکەمین خواوەند ئەوبوو

کە لە دامێنی بروسکەیەکی هەلا هەلاوە

کەوتە خوارەوە

خودام باڵدار بوو.

(جوبرائیل) باڵداربوو.

ئەی باڵداری پیرۆز لە ئاگرستانی عەشقدا!

ئەی دەنگی پەیوەستی نێوان بەردو هەور،

نمەو کێڵگەو

چەخماخەو کێوان!

ئەی هەوانامەو خاکنامەو

ئەوینی ئاوێتە بووی خوداو مرۆڤ لەیەك کاتدا!

ئەی باڵداری پیرۆز!

ئەی هاودەمی یەزدان لە بەرزاییەکانی تەنیاییداو

**ئەی هاودەمی (فەقیران) لە نزماییەکانی کلۆڵێدا!**

**ئەی (مەلەك تاوس)ی جوانیی و**

**شای پەرییانی چیانشین!.**

**رۆحم بخەرە سەر فەنەری باڵە ڕووناکەکانت!.**

**رۆحم داگیرسێنە!**

**تاپاکژبێتەوە بلووری گەردگرتووی جەستەم و**

**گزنگ بگرێ باسکەکانم.**

**ئەی گەوهەرە سپیەکەی یەکەم ڕۆژی خەڵقی دونیا!**

**ئەی سەفەری باڵندە شەنگارەکەی**

**یەکەم ڕۆژی خەڵقی دونیا!**

**تیشکم تیا بچێنە!.**

**بۆ ئەوەی ببمە مێرگی نووری دەنگ و ڕەنگت.**

**تریفەم تیا هەڵقولێنە!.**

**بۆ ئەوەی لەگەڵ خودای (مانگ)دا**

**خەرمانەی دەوری سەرمان بکەین بە هەواری هەژاران!.**

**لەکەناری شەوێکی سپییەوە کەوتمە ڕێ.**

**لە خۆڵەمێشی خۆمەوە.**

**گەورە فریشتەی خۆم**

**(مەلەك تاوس)م زانەوە.**

**(مەسحەفا ڕەش)یشم هەر بە نووکە کلێپەی سووتانی خۆم**

**نوسیەوە، گەلاَ ئەڵێ:**

**(مەسحەفا ڕەش) مەسحەفا خەونی بێشەلاَنمانە**

**ئاو ئەڵێ: مەسحەفا ڕەش ویردی پەلکەگیاو**
**نزای وردە شەپۆلی کانیەکانمانە.**
**بەرد ئەڵێ: مەسحەفا ڕەش، بەفرە کتێبی منە،**
**هەتاونامەیە لە بەیانیانی نوێژکردندا**
**بۆ تاوسە میهرەبانەکەم.**
**ماچنامەی نێوان یەزدان و سروشتە**
**پشکۆنامەی کوورەکانی نێوان کوژانەوەو هەڵگیرسانە.**
**هەناسەمە لە توانەوەدا.**
**پەنجەمە لە وەختی گەلاکردندا.**
**دەم و لێومە لە وەختی پشکوتنی پەیڤدا.**
**ئاسمان نامەی فڕینە:**
**فڕینی گوڵ و ئەستێرەو منداڵ.**
**گەڕانی ئازارە بە تووناو توونەکانی دەنگی یەزداندا!.**
**گەشتی چاوە لە قوڵایی نابینایی گوناهەکاندا.**
**سەما کردنی کلووی خۆشەویستییە**
**بە دەوری مەرگی پەپوولە جوانەکاندا.**
**لە ڕۆخی شەوێکی زیوییینەوە هەڵفڕیم:**
**باڵندەی گەوهەری شەوچراخ بووم.**
**درەوشانەوەی تێل و پەڕوو باڵم،**
**بریسك و هووڕی ناسۆرە ئاوێنەکانی بەر سینگ و گەردنم،**
**شەوقدانەوەی هەزارو یەك ڕەنگەی چریکەو سەداکانم،**
**یەکەمین پەیڤینی بێ دەنگ و هێمای نێوان من و**

(خوداوەندی فەلەك)بوو
هێمای سەرمدیی.
پەیقی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون.
وتووێژی ئاوو کەنارەکان.
سەرەتا ئەوەی هەبوو هەر ئاوی سامداری
خوداو بوونم بوو.
زەریا.. زەریا.
سەرەتا لە گوڵدانی ئاڤزینەوە
لە زاری ڕۆشنی ئاوەوە
نەمامە گوڵێکی شەرمنۆك سەری دەرهێناو
چاوی شەپۆلی پشکووت.
من (میری گوڵان) بووم
من لە شێوەی هەڵۆیەکی سپیدا ئەخولامەوە
هەورەکانم ڕەنگ ئەکرد.
بارانم فێری بارین ئەکرد.
لە شێوەی خۆم و ڕەنگی خۆم بەفرم خوڵقاند.
لە تووڕەبوونما باهۆزێکی قژ لوولی
چاو ڕەش لە دایك بوو!.
لە هێوریمدا شەماڵێکی پێست تەنك و
لە پێکەنینمدا هەتاوو
لە دڵ تەنگیمدا شەوی نامۆ لە دایك بوو!
سەرەتا ئەوەی هەبوو هەر زەریایەکی مەزن بوو.

زەریا.. زەریا.
هەر سرودەکانی شەپۆل و شەقژنی باڵی
گۆرانیە فڕیوەکانی من بوون.
لە کەناری شەوێکی سپیەوە کەوتمە ڕێ
لەو شەوەدا، تەواوی ئەستێرەکان
هاتبوونە سەر کەپکی کەژەکان
ئەمبینین: چۆن گەمە بە تۆپی جریوەی یەکتر ئەکەن و
لەسەر بەفرەوە چراکانی خۆیان
تا تەختایی بنار خل ئەکەنەوە.
سەرەتابوو
یەکەم هەواری خواوەندەکەم بەرزترین لوتکە بوو.
خواوەندەکەم لەو بەرزەوە
هاواری لێ ئەکردم. تالەسەر ئەم زەوییە
ئادەمیزادی تازە زاو بدۆزمەوە کڕنووشی بۆ بەرم
هاوارم کردەوە وتم (من جگە لە نووری خودا،
لە چاوی خودا، لە دەنگی خودا،
کڕنووش بۆ کەسی دی نابەم)
من (مەلەك تاوس)م.
من یەکەم باڵداری گەردوون و یەکەم فریشتەی (بوون)م.
ئەو دەمە خودا مات بوو.
لە دواییدا لە یاخیبوونم ڕازی بوو.
لەو ساتەوە فەرمانی دا و

کردمی بە گەورەی گشت فریشتەکان.
لە کەناری شەوێکی زیوییینەوە کەوتمە ڕێ.
خواوەندی (ئەستێرەی بەربەیانم) لەگەڵدا بوو.
پێکەوە ئەڕۆیشتین و تاریکیمان گسك ئەدا.
پێکەوە تۆوی گوڵەبەڕۆژەی ڕوناکیمان تۆو ئەکرد.
پێکەوە بەرپێی ئاومان ڕۆشن ئەکردەوە.
پێکەوە پڕ بە باوەشمان پەپوولەی خۆشەویستیمان،
بەو دەشت و هەردانەدا بڵاو ئەکردەوە.
(تاوسی زۆزان)مان ئەگێڕاو
لە دەڤەری ڤامیشەلاندا کەوتینە شمشاڵ لێدان
بۆ یەکەم جار چیاکانمان خستە سەما.
بەهەر تەلان و دێبەرو مەزرایەکدا تێ ئەپەڕین
گوڵە گەنمێکمان لە بەرۆکی عەردێکی بەیار ئەدا.
لە دوای خۆمانەوە لەتە ئاوێنەی هەتاومان
بۆ دۆڵە قووڵەکان بەجێ ئەهێشت!.
گوڵە هێرۆی سەری زارۆکەکانمان پیرۆز ئەکرد.
سەرو کەللەی ئەسپەکانمان
بەچراوگە بچکۆلەکانی (جیلوە) ئەڕازاندەوە.
بەگولاوی (جیلوە) گولاوپرژێنی
کاکۆڵی درەختە ڕەوەندەکانمان ئەکرد.
جۆگەلە کوژراوەکانمان ئەلاواندەوە.
حیکایەتی یەکەمین فڕینی (میری گولان)مان

**بۆ باخچە بچکۆلەکان ئەکرد، تاخەویان لێ ئەکەوت.**
**لە تاڵە قژی کابانە جوانەمەرگەکانمان ئەبڕیو**
**ئەمانکرد بەکێلەکانی یادگارەوە.**
**بۆ جوامێرانیش هەر لە ئێسکی دیرۆك خۆی**
**پەیکەری بەرانە کێویمان دائەتاشی و**
**ئەمانکرد بەسەر دەرگای ئەشکەوتەکانمانەوە.**
**پێکەوە ئەبووین بەمیوانی گەرداوو**
**پێکەوە ئەچووینە بەهەشتی سووتاوەوە.**
**لە ڕۆخی شەوێکی زیوییینەوە کەوتمە ڕێ**
**هەر لەو شەوەدا یەکەمین کەڵەشێری قوربانیمان**
**لەبەر قاچی خواوەندی گەورەمان**
**(مەلەك تاوس)دا سەربڕیو خوێنەکەیمان**
**لە یەکەم بەردی بناغەی هەواری (لالش) هەڵسوو**
**لەو شەوەوە ئیتر (لالش)یش بوو بە:**
**ماڵی سپی و پیرۆزی خوداو**
**بە ئاگردانی عەشقی ئێمەو بوو بە:**
**ئینجانەی پەڕو باڵی (مەلەك تاوس)و بوو بە:**
**گەرووی سروودی (قەوال)و بە ڕووگەی (فەقیران).**
**بۆ رۆژی دواییش**
**یەکەم جەژنی خۆرەتاومان**
**لەدڵی کازیوەیەکی زیوییندا کردوو**
**یەکەم قوڵینەی پڕ لە (نان و پیازو ساوەر)یشمان.**

بەسەر هەژارانی دەڤەری (مەلەك تاوس)دا بەخشیەوە!

لە کەناری شەوێکی سپیەوە کەوتمە ڕێ

چەندین مێژووی بەستەڵەك و

چەندین مێژووی ئاودامانی خوێناویم دی.

ڕەشەبای ڕم هەڵیکردوو

تۆفانی لم سەریکردوو

شمشێرباری و بیابان ئابلۆوقەی دام و

لافاوی جەهەنەم هەستاو

بەلاّم (هەتاو)م.. پاشگەز نەبۆوەو

ئاگرم کڕنووشی نەبردوو

شەپۆلم نەگەڕایەوەو

(مەلەك تاوس)م هەر فڕیی!.

نیوەشەوێکی (لالش)بوو

هەوا (شین)بوو.

(مەلیك ئەحمەد شای) مەرگ سواری قۆچدار

بەڕیزە بەیداخی (شین)ەوە

بەمەنجەنیقی شینەوە.

بەلەشکری تەوری غەزای شینی سوڵتانەوە

هاتە سەر هەتاوی رۆحی (مەلەك تاوس).

هەتاو بەرەو ئەشکەوتەکان کشایەوە.

هەتاو خۆی لەدەروونی گاشەبەردوو لەنێو پرچی

عاشقانداو، لەچاوی زارۆکەکانداو.

لە هەناوی دار زەیتونەکاندا.. شاردەوە.
نیوەشەوێکی (لالش)بوو
هەموو ئاوازە پیرۆزەکان چوونەوە گەرووی خودا.
هەموو ڕەنگە پیرۆزەکان لە ڕووخساری هەتاودا
کۆبوونەوە.
تەنها رەنگی (شین) نەبێ چۆکی شکاو
خۆی خستە نێو باوەشی (شین)ی
(مەلیك ئەحمەدشا) وە!
لەو دەمەوە ڕەنگی (شین)مان بەنەفرەت کرد.
لەو دەمەوە ڕەنگی (شین)مان
لە مەملەکەتی هەتاوو
ئاگری خۆمان دەرکرد.
لەو شەوەدا (مەلیك ئەحمەدشا)
ئەستەمبوولێکی (شین)بوو
ئاگری (شین)ی بۆ هێناین.
دووکەڵی شینی تێ بەرداین.
تاچەند ڕۆژێ بەردی شین کرد، داری شین کرد.
خوێنی شین کرد.
جەستەی ژن و منالأنیشمان
هەر بوون بەخۆڵەمێشی (شین).
لە کەناری شەوێکی زیوییینەوە کەوتمە ڕێ
هەوا ڕەنگین و سەربالەکانم گزنگیان لێ ئەچۆڕایەوە.

گەردنم شوشەی مانگەشەوو
بەرسنگم وردە یاقوتی تیا ئەبریسکایەوە.
من وەختی سەماکردنمە بەچواردەوری (چەقەڵتوو)دا
من گەرداوێکی سەرخۆشم،
هەتا شەبەق لەشەرابی خۆرنشینم خواردۆتەوە.
هێندەی ڕەزی خەیاڵاویو
نیگاکانی (تاوس) مەستم.
هێندەی مەرگ بێ دەربەستم.
من وەرزی سەماکردنمە
ئەم جەستەیە ئەکەم بە پووشووی سووتاوی ناوگیانی خوا
ئەم جەستەیە ئەوەرێنم
ئەیدەم بەدەم (با)ی گوماناویی وەشتەوە.
جەستەم ئەخەمە سەربالّی
تەوارێکی بێوەژنی تاق وتەنیا
سەماو سەماو سەما
جەستەم ئەخەمە سەر ئەسپی باڵداری (لالش)و
ئەبم بە هاوارێکی فڕیوی
ناو گەرووی خوا!
من وەختی سەماکردنمە بەچواردەوری
تاجە گڕی (چەقەڵتوو)دا.
لەگەڵ گڕدا بەیەکەوە پەل ئەهاوین
ئاگرنامە ئەدەینە دەست دارستان و

دەست ڕەشەبا، بەیەکەوە
(تاوس ئێزی) و (تاوس سنجار)
(تاوس مەسقوف) ئەگێڕین و
ئەچینە ناو ئایندەوەو
خوانامەی نوێ دێنینەوەو
نەهێنی ئەبەخشینەوەو
دیسانەوە هەر سوڕ ئەخۆین بەچواردەوری (چەقەڵتوو)دا.
من (فەقیر)ی مەزارێکی سەربەنوورم
من منداڵەکان فێرئەکەم
دەفی هەور چۆن لێدەن و
چۆن باڵەبانی دارچنار بژەنن و
چۆن فووبکەن بە کەڕەنای لووتکەکانداو
من زارۆکەکان فێرئەکەم
چۆن (با) بە ڕەنگی نارنجیی ڕەنگ بکەن و
خەون بە ڕەنگی زەیتوونی و
شەویش زەردکەن!
فێریان ئەکەم چۆن لە شەپۆل
یاڵ بۆ ئەسپ بخوازن و
کڵپە بۆ ڕیشی (پیران)و فێریان ئەکەم
چۆن لە تێلی ئەم تاوسە
ماڵی داهاتووی خۆرەتاو دروست بکەن!
من وەرزی سەماکردنمە

**وەختی فڕینی پەنجەمەو**

**وەختی فڕینی ڕۆحم و**

**وەختی سەمای تۆپەگڕی ئائەم سەرە!**

**لە کەناری شەوێکی زیوییینەوە کەوتمە ڕێ**

**یاڵەو یاڵی زریان هاتم.**

**دەشتاو دەشتی گومان هاتم.**

**هەرداو هەردی تەمتوومان و**

**ماڵەو ماڵی عەشق هاتم.**

**لەرۆخی شەوێکی سپییەوە کەوتمە ڕێ.**

**(کوچەك)ێکی باریکەلەی**

**حاڵڵێهاتووی بەر تیشکی خوام.**

**ئازارم، هاوارم و سپیی ئەچمەوە**

**(کوچەکێکم) یان مەلێکم**

**لەو مەلانەی ئەفڕن هەتا ناو دڵی خوا.**

**من دەزوولەی بارانێکم و ڕۆحەکانی ئەودیو دنیاو**

**ئەم دنیایە بەیەکەوە ئەبەستمەوە.**

**جارێکی دی ڕەنگەکانی خەونی پێشوو**

**دەنگەکانی زەمانی زوو**

**هەر هەموویان ئەهێنمەوەو**

**لەناو ڕیشی ئاسۆیەکما ڕۆیان ئەکەم،**

**تاسەر لەنوێ بڕوێنەوە.**

**کوچەکێکم لەناو داڵانی پرشنگدا درێژ ئەبم**

چون عەباکەم ڕەشیی شەو ئەدەم بەخۆمداو
لە خاك و خۆڵی (لالش)دا ئەتلێمەوە
من بەردەوام ئەتلێمەوە!
هەتا ئەبمە تراویلکەی جەستەیەك و
لە بەرایی پێدەشتێکدا ئەتوێمەوە:
ئەبم بە گژوگیاو ئەدوێم.
ئەبم بە بەردی سەرەڕێ و
بە بنچك و بە تاڤگەو ئەدوێم.
پەلی ئاینده ئەگرم و رایئەکێشمەناو منداڵدانی سبەینێ و
(جیلوە)ی هەوری نەباریوو
شەپۆل نامەی سەری بەحرو
کتێبی تەم ئەخوێنمەوە.
کوچەکێکم من مووروی (با) ئەهۆنمەوە
بۆ گەردنی دڵدارانی ئەم تاوسەو
بۆ قەوالی (ئێزیدیان)
کوچەکێکم ئەوەرێم و ئەڕوێمەوە.
پێشبینی خۆم لە کۆڕی (مەلەك تاوس)دا
بۆ (لالش)و بەفری چیاو منداڵەکان ئەگێڕمەوە.
لەکەناری شەوێکی زیوییینەوە کەوتیتە ڕێ و
لە ئاسمانێکی مسینی ناو هەوای شیندا هەڵفڕیت.
تۆ یەکەم نووری یاخیی بووی نێوچەوانی ئەم زەمانەو
پەیقی هەلاڵەیی من بووی.

تۆ دوورگەیەکی سپیی گیرخواردووی
بەردەم تۆفانی نەفرەتی سێ خواوەندی
ئاسنینی سەر زەمین بوویت.
بە درێژایی مێژووی ڕم
بە درێژایی مێژووی تیر
بە درێژایی مێژووی ڕق
تۆ پانایی بێ بواری خوێنی بەردوو
خوێنی دارو خوێنی ئاسۆو خوێنی خۆر بووی.
تۆ هەمیشە تۆ بەردەوام
قیژەی گڵی بن بنارو
هاواری سپیی بەفراوی هەڵقوڵیو بووی.
بەڵام ئەی مەلەکی لە شاخ زاوو لەناو ئاگردا باڵگرتوو!
تۆ ئەو پرشنگی برین و کۆستانە بووی
هەزاران جار لەناو دۆڵی تەم و مژدا
وردیانکردی و هاڕییانی و کەچی دواییش
ئەبوویتەوە بە تاوس و دیسانەوە ئەهاتیتەوە
سەر شانم و دیسانەوە بە ئاسمانی خواوەندەکەی
میترای مییدو گیانما ئەفڕیت!.
ئەی فریشتەی ڕۆحی سپیی!
ئەی (مەلەك تاوس)ی ڕەنگین
بە ڕەنگەکانی وڵات و بە ڕەنگەکانی قوربانییم
باڵ لێکدەو سەرکەوە سەر کەلی

ژاڵەیی جەستەی من.
بەدەنووك لەتۆوی رووناكیی شیعرم و
ریشاڵی ئەنگۆرەی (هەڵەبجە)م هەڵگرەو
بیبەوە بۆ (لالش)
بارانی ئەم ڕەنگەیش موتوربەی ئاسمانی
(مەسحەفا)و ناو خۆڵی (جیلوە)كە
با گوڵی هەتاوێ لەم شەوی لەشەدا بڕسكێ
نەبینراو، با قوڕی (بەراتە)ی پیرۆزت و
گژوگیای (ئەنفال)و ئەموستی وەریوی (گەرمێن)و
چەند پەڕێ لە تێلی تاوست و چەند تاڵێ لەقژی
یارەكەم. هەر هەموو، پێكەوە بشێلین،
بۆ ئەوەی لەم جەستە نوێیەدا، لەجەستەی
(قەوال و فەقیر)دا لەكەنار شەوێكی زیوییندا،
ڕۆحێكی تازەتر لەبەردا بڕوێنین، بۆ ئەوەی
بەردەوام پێكەوە لەگیانی شەوێكی سپیدا هەڵفڕین!

ستۆكهۆڵم
1997/10/21

# چێوار

(1)

پەڕەسێلكەی هەواڵێكی ڕەش و سپیی..
تێكەڵ لە بەفرو نامۆیی
تەڕ وەكوو چاوی (گۆیژە)
بەرەو ڕووم دێو نزم ئەفڕێو
ناوبەناوێ بەر سنگ ئەدا لە مەراقم و
جاربەجارێ باڵێك ئەدا لە ئەستێركی حەپەساوم و
چون قەسیدەی پرسەدارم..
ئەویش ئەگریو ئەگریو ئەگری.
پەڕەسێلكەی هەواڵێكی ڕەش و سپیی..
پەڕەسێلكەی شانۆیەكی سلەیمانی
تێكەڵ لە ڕەنگی كراسی گەرمییان و
تێكەڵ لە زیوی تریفەو گەڵای قۆپیی
بەرەو ڕووم دێو نزم ئەفڕێو
ناوبەناوێ دەنووك ئەدا
لە پەنجەرەی شەختەی ژوورم و

**جاربەجارێ سەر ئەکێشێ بە وشەمداو**

**لە دواییشدا ئەویش وەکوو قەڵەمەکەم سەر دائەخاو**

**بەکوڵ ئەگریو ئەگریو ئەگری!**

**پەرەسێلکەی هەواڵێکی ڕەش و سپیی..**

**بەرەو رووت دێو نزم ئەفڕێو**

**هەر خول ئەخوا بەچوار دەوری تەنیاییتداو**

**باڵ جووت ئەکاو ئەیکاتەوەو..**

**تۆیش لەولاوە درەختی دوورگەی فرمێسکی و**

**بالاّی شانۆی گوڵ عومەری و**

**هەڵ ئەوەرێ!**

(2)

**ئەی پەرەسێلکەی هاوڕێ!**

**ئەی باڵەکانی فرمێسکی ڕەش و سپیم!**

**ئەی خەمی نوێی هەڵفڕیوی نێو شارەکەم!**

**بۆ کوێ ئەڕۆی؟! بۆ کوێ ئەفڕی؟!**

**ئەوە سەرم و ئەوە پووشوی زەردی قژم و هێلانەکەت!**

**ئەوە کونەزامی سنگم و کونە ئاخ و کونە داخ و**

**گەرمەسێری جریوەکەت!**

**بۆ لائەدەی؟ بۆ کوێ ئەفڕی؟!**

**تۆ هەنسکی ڕەش و سپیی شانۆی منی**

**بۆ لائەدەی؟! ناسینەوەم**

لەناسینەوەی گومەزی سەر سەیوان و
دۆزینەوەم، لە دۆزینەوەی هاواری مامەیارەو
(ژیانی ڕۆژانە)ی خۆت و
پێلاوەکەی (ئەحەی کڕنوو) ئاسانترە!
بۆ لائەدەیت؟! ناونیشانم
لە ناونیشانی هۆڵەکەی- هونەرمەندان —
لە مەزارەکەی (ماجید)و
لە ماڵە ڕووتەڵەی (چێوار) ئاسانترە!
بۆ لائەدەی؟! بۆ کوێ ئەفڕی؟!
من لەم ناوە، لەم بەفری قوتبە شینەدا
نوێنەری گشت گریانێکی پەردەی شانۆو
نوێنەری کۆچی دەنگتانم.
من لەم ناوە، سنووقی پۆستی زایەڵەو
هەر بۆ خۆیشم، من پۆستەچی نامەی کۆست و
بۆ خەزانی ئاوێنەکانی سەر شانۆیش
ئەدرەستانم!
ئەی پەڕەسێلکەی هاوڕێ!
بۆ خول ئەخۆی بەدەوری ئەم:
بەفرە شینەی سەری مندا؟!
وەرەو گریان دەروازەکەی کراوەیەو
قوڵپی تازەو کوڵی تازەو
شانۆنامەی ئەم کۆتەڵە نوێیەم بەرێ!

(3)

ئێوارە، مەراقی زەردەبوو، دائەهات.
خۆرنشین بە بۆنی بادەوە ئەگەیشتە بەردەمی چاپخانە
چەند شیعرو چیرۆك و شانۆیەك، لەوێدا ئەبووینە درەختی،
تۆزاوی و چاوەڕێی سەر جادە. چاپخانە ئەکەوتە،
باوێشکدان، سەماوەر ئەنووست و کورسیەکان ئەنووستن و
(عەبدوڵلا جەوهەر)یش هەڵ ئەسا. ماخۆلان ئەسپ بوو،
ئەسپەکەی (بێکەس)بوو لە گیانی ئێمەدا بۆ عارەق.
بۆ ڕەشی بۆ سپیی، ئەیکردە کوڕژن و سمکۆڵان.
وەختی نوێژ بۆ عەشقی شیعرێك و شانۆیەك هاتووە.
وەختی نوێژ لەبەردەم خواوەندی بادەدا هاتووە.
ئەهاتیت. خەونێکی شانۆبوویت ئەهاتیت. نەورەسی
(چیخۆف)ی خەمگین بوویت. بە کاوخۆ ئەهاتیت.
کراست هەورێکی چرچ و لۆچ، پانتۆڵت تیزماڵکی
دووکەڵ بوو، ئەگەیشتیت. سەروقژ هێلانەی باڵندەی
بێزاریی. ڕوخسارت چون مێژووی شارەکەت،
چون نانی گریاوی هەژاریی. تەمتومان لە چاوتا
وەك خانوە قوڕەکان، مەیدانی کافرۆش، گەڕەکی
مەڵکەندی، پڕی بوو: لە کۆچی بێ وادەی جریوەو،
لە هەوری سەرگەردان، ڕوخسارت: حەوزێکی پڕشنگ بوو،
بۆ ماسی ڕەنگاڵەی هونەرو، شەوێك بوو، بۆ عەشقی
نێوانی شانۆت و ئازادیی. ئەهاتیت.

خاڵە گیان! بابڕۆین!. تۆ ئەتوت.
خاڵە گیان! بۆ نەڕۆین!. من ئەموت.
ئەڕۆیشتین سەرەو ژوور، زریزەی خەمێك بووین.
هەر هەمان- کۆمەڵی نەگبەتی بێکەس بووین.
سەرەو ژوور ئەڕۆیشتین.
بازنەی چەند چرای سەرخۆش بووین
بەدەوری مێزێکی شان گێڕدا!
فەقیانەو جامانەی مامۆستا (عومەر) و فۆلکلۆر،
منارەی سەر مێزی ئێمەبوو، دووکەڵی جگەرەو شیعرێکی
تازەی من. دەورێکی تازەی تۆ. بە چرپەیش هەواڵی
سوورباوی ڕەوەزوو کەوێڵی هەڵۆکان. لاقرتێی
ناو قاقای (شێرزاد) و ڕاوەکەو. میاو میاوی پشیلەی
ژێر مێزوو، پێکێکی ڕژاوو، تارمایی مولازم موحسین و،
دوا ناوی شەهیدو، درەنگان چریکەی فڕیوی ماملێی
(بێگەرد)و.. ئەمانە هەرهەموو بە یەکدا ئەهاتن و
سەریشمان گومەز بوو لە تەمی مێژوودا و
بالآمان نوقمی ناو دەغڵی دواڕۆژوو
بینینمان.. بینینی ڕووباربوو
ئەوکاتەی مل ئەنێ بۆ دنیای نادیارو بۆ زەریا.

(4)

بەتەماتم خاڵە چێوار! هۆ مامە شێخ، بەتەماتم
ئەمشەو لەم قوتبە شینەدا

له بەفری ئەم غوربەتەدا..
ببیتە شانۆی باڵداروو بێی بۆ لام و سەردانمکەی!
بەتەماتم.. بەڵام پاڵتۆ دڕاوەکەت (کە شەوێکیان
داتە بەر شەق) لە بیرنەچێ! کلێتەکەت (کە
شەوێکیان کردتە سەری (خاڵە شەمۆ) لە بیر نەچێ!.
بەتەماتم هەر خۆیشم نیم، هەر (چوار پیاوی ئوتێلەکە)
بێجگە لە خۆت، ئەحەی کڕنوو بێ پێڵاوو،
(دڵشاد)یشمان بێ چاویلکە لە گەڵدایە!.
باو بۆرانەو وژەوژی خەمستانەو
ئەمشەو لەم قوتبە شینەدا بەتەماتم ئەبێ هەر بێیت.
بادەی پەرداخەکەی (بێکەس) کە لە بنیا
کسپەیەکی مۆر ئەلەرزێ... چاوەڕێتە!
مۆمێك بە بەرزی باڵای هونەرت و باڵای
شانۆی (پێشڕەو)
ئەسوتێت و چاوەڕێتە!.
(هاملێت)ی ئاوارەییم..
لە باڵقۆندا دوور ئەڕوانێ و چاوەڕێتە!.
لە باخچەکەی بەرماڵەوەیش، خاڵە شانۆ!
هەموو هەموو شیعرەکانم چاوەڕێتن..
بەتایبەتی (ئاسك)ەکەم هەر بارژنێتی و
هەر دێو دەچێ و..
چاوەڕێـتە

(5)

**ئەی پەڕەسێلكەی هاوڕێ!**

**سەرم هێلانەی تۆ نییە؟!**

**بۆچی خۆتم لێ ئەگۆڕی! تۆ چێوارنیت؟!**

**تۆ كوڕی شانۆی هەژاری شارەكەم و**

**ئەكتەرە هەوری هونەرو**

**مامزێكی ڕووت و برسیی**

**شارەزور نیت؟!**

**بۆچی خۆتم لێ ئەگۆڕی!**

**ئەی تۆ تەختەی شانۆت نەكرد**

**بە عەرشی بەرزی مەرگی خۆت؟!**

**تۆ خۆت نەكرد بە پلووسكی بەردەم خەڵك و تینویشت بوو؟!**

**تۆ خۆت نەكرد بە نانێكی بەردەم خەڵك و... برسیشت بوو؟!**

**ئەی تۆ نەبووی**

**لەبەرپێ كانی شانۆدا**

**لەسەرە ڕێی شەوانێكی بێ چرادا**

**بۆ ئەوەی (ئەو) هەڵنەنووتێ و نەكەوێت و**

**بڕوا و بڕوا.. باڵەكانت دانەگیرسان؟!**

**بێدەنگی و ترست نەسووتان؟!**

**دەپێم بڵێ!.. دەپێم بڵێ!.. دەپێم بڵێ!.**

**تۆ چێوار نیت؟!**

(پەڕەسێلکە هاتە پێشێ و لە ژێر بنمیچی شیعرێکما
کز کز هەڵنیشت.
منیش.. سووک.. سووک..
قەفەزی سنگم کردەوەو
چووە ناوی‌و
لە ڕۆحما نووست!.)

# ژیلا

سۆزی لاواندنەوەیەك بۆ (ژیلا حوسێنی)

تەنها هەر سەعاتێك ئەبێ
مامزێكی سپیی شیعرم لێ ون بووە!.
ئەرێ نازانن لە كوێیە؟!
نەتاندیووە؟!
دەشتێك كەروێشكەی فرمێسكی
لەبەر ئەستێركێكدا ئەكرد
هات و وتی:
ڕەنگە لەپاڵ كانییەكدا..
ئێستە خەوی لێ كەوتبێ!.
وەك سنەوبەریش خەونێكی
سەوز ببینێ!
ئەوە بۆ دوو سێ ڕۆژ ئەچێ
(ئاواز)ێكی پیرۆزەییم لێ ون بووە!.
ئەرێ نازانن لە كوێیە؟!
ئەرێ كەستان نەتاندیووە؟!

(باڵەبانێ) بەدەم پژانی ئاخەوە
هات و وتی:
ڕەنگە ئێستە لەناو هاژەی مەیلەو شینی
ڕووبارێکدا، بووبێ بە قەڵبەزەی زیوین.
ڕەنگە ئێستە لە کەناری (زرێبار)دا
بووبێ بە تەڵێ وەنەوشەو
بووبێ بە گوڵەمێلاقەو
خەونێکی شینیش ببینێ!.

⋆

ئەوە بۆ هەفتەیەك ئەچێ
گەواڵە هەورێکی (مۆر)م لێ ون بووە!.
ئەرێ نازانن لە کوێیە!
ئەرێ کەستان نەتاندیوە؟!
(با)یەك بەچاوی تەڕەوە
لەلوتکەوە هاتە خوارێو
گەیشتە لام و پێی وتم:
ڕەنگە ئێستە بووبێ بە کلوو بەفرێکی
(ئاویەر)و لەسەر گەلاًیەك نوستبێ!.
ئەشێ بووبێ بە ئاونگی پێڵوی بەردو
ئەشێ بووبێ بە شەونمی قژی هەردو
ئەشێ لەدەراڵی کێودا
بووبێ بە زنەی ئەشکەوت و

له نسێدا بۆ خۆی خەوی لێ کەوتبێ!.
لەوانەیشە بووبێتەوە بەهەڵمێك و
تراویلکەی بنارێك و
شوێن پێی خەونی:
عەشقی (مەم)و
(کاکە لاس)ی هەلگرتبێ!.

★

ئەوە بۆ چەند مانگێك ئەچێ
گوڵ ئەستێرەی بنارێکم لێ ون بووە!.
ئەرێ نازانن لەکوێیە؟!
ئەرێ کەستان نەتاندیوە؟!
کەوێکی باڵ داگیرساوی خەمم هات و
بەدەم قاسپەی هەنیسکەوە
گەیشتە بەر پەنجەرەم و
دەنوکێکی دا لە دڵم و
ئەوسا وتی:
ڕەنگە ئێستە بووبێ بە شەوقی چرایەك
لەناو ژووری شاعیرێکدا.
ئەشێ بوبێ بەمۆمی ژوور سەری کانیی.
بە چراوگی دەس گوڵ هەنار.
بە گلۆپی شەقامێك و
ئەشێ بووبێ بەجریوەی پەخشانێك و

ئەشێ بووبێ بە قوتیلکەی بەر هەیوانی چیرۆکێك و
بە تریفەی دیوانێك و
رەنگە بووبێ بە تروسکەی ئاگری شوانی
دوورە چیا.
لەوانەیە بووبێ بەپەپولەی نووری
لەناو ڕیشی (مەولەوی)داو
لەوانەیشە، بووبێ بە قەقنەسێکی گڕگرتوو
لەناو غوربەتی (نالیی)دا.

★

ئەوە من بۆ سالێك ئەچێ
چاوێکی خۆم لەرێی (تاران)لێ ونبووە!.
دەنگێکی خۆم
لە پێچەکانی قیرتاوی تاریکیدا لێ ونبووە!.
لە تەمتومانی سەفەردا..
(مانگ)ێکی خوێناویی سەرم لێ ون بووە!.
هاوار.. هاوار
ئەرێ نازانن لەکوێیە؟!
ئەرێ توخوا نەتاندیوە؟!
لەملەکانی (شاهۆ)وە..
پەرییەکی قژ نارنجیی.
نیوەی: شەو و نیوەی: هەتاو..
پەرییەکی شیعری (حافظ)

نیوەی: گوڵ و نیوەی: تەرزە..
کچی تەم و کچی باران..
هات.. داگەڕاو
گەیشتە لام و پێی وتم:
- من خۆم دیومە (ژیلا)بووە بە شەتاوێ
لەو کاوانەو (ژیلا)بووە بە چنورێ لەو کەژانەو
(ژیلا)بووە بەماسیەکی باڵداری ناو (زرێبار).
من خۆم دیومە. ئێستە ئەو لەناو هەورایەو
لەسەر کورسیەکی بەرزی ئەرخەوانیی دانیشتووەو،
بە گزنگ شیعر ئەنووسێ و کراسێکی ئاودامانی
مانگەشەوی لەبەردایە.
من خۆم دیومە: بووە بەکۆترە شینکەیەك
لەو ماهیانەو گمە گمی ئەوینێتی و
هەر شەڤژنی برینێتی و هەر چاوە چاوی بینینی
بالآی شیعرێکی تۆیەتی و
ملوانکە موورووی ئەستێرەی لەملدایە.
من لەلای بووم. من خۆم دیومە:
بە بەیانیان.. سروەیەکی سەربالْ شینە.
بە نیوەڕوان.. هەتاوێکی ڕەنگ پەمەیی و
بە ئێواران.. تیزماڵکە خوێنی لێواری خۆرنشینە.
ئەو ئەگۆڕێ
هەفتەی جارێ.. ئەبێ بە گوڵەبەڕۆژە.

**مانگی جارێ.. ئەبێ بە گوڵی دار هەرمێ و**
**(خەج)ە و (شەم)ە و ئارام ناگرێو**
**هەر کۆچ ئەکا..**
**دەمێ لەسەر (ئاویەر)ەو**
**دەمێکی تر لەسەر (گۆیژە).**
**من خۆم دیومەو ئەم بەیانییە لەلای بووم.**
**من هاتووم و ڕاسپاردەی خەزانێکی**
**ئەو بەهارە لەش جنراوەی**
**ئێوەم لایە:**
**بە گریانی کاڵاّ ڕەشی کەس و کارم،**
**بە هەلاّڵەکانی وشەم: هاوڕێیان،**
**بە ولاّتی زەردو سوری خەونەکانم،**
**بە شارەکەم، گەڕەکەکەم، کۆلاّنەکەم،**
**بە پەڕەسێلکەی تەنیایی و**
**بە هێلانەی چۆڵ و هۆڵی شیعرەکانم،**
**بە ژووره بێوەپیاوەکەم،**
**بە قوتبی شینی نامۆیی و**
**بەفری ڕەشی تاراوگەکەی**
**(شێرکۆ بێکەس) بڵێن، تازە**
**من چوومەتە ناو قۆزاخەی**
**سڕڕەکانی گەردوونەوەو**
**بووم بە شیعری ئاوریشمینی**

**بارانی خواو.. زوبانی خواو**

**نایەمەوە!**

ستۆکهۆڵم

1997/2/19

# پیاسەیەك بەناو خوێنی خۆمدا

جلی شیعرم لەبەردایەو
باڵندەی عەشق لە (سەر)مایەو
وائیستاکە هەر بەجادەی (شەقلاوە)دا
لەگەڵ  سێبەرێکی زیزو
لەگەڵ هەتاوێکی وڕدا
ڕووەو باخان سەرئەکەوم!.
ئەمڕۆ ئەچم بۆ دیدەنی دارمێوێکی
خۆشەویستی دێرینەم و، لەوێشەوە
بەڕاستە کۆڵانی هەورا ئەچمە گەڕەکی باران و
سەرێك ئەدەم لە ماڵی (مەم).
ئەچم بۆ ئەوەی قاوەیەك
لەگەڵ چیرۆکێکی تازەی ئەودا بخۆمەوەو
جگەرەیەك لەگەڵ (سەفین)دا بکێشم و
بەرامبەری مانگەشەوی دەردەداری سەر (پیرمام)یش
بە یادی چاوی خانزادی کۆنەیارم
پێکێك هەڵدەم!.

سەرئەکەوم، پێش گەیشتن
لە شەممەیەکی قۆقزی ڕێگەی شووم و
دواڕۆژی (ئاب) هەڵئەنوتێم
بە (گۆیژە) خۆم ئەگرمەوە!
ئەچمە سەرێ، لە ناوەڕاستی بازاڕدا
ئەیانبینم، یوزباشی و زابت تێکەڵن
(نەجم و هیلال) و ئەنفال و سوارەکانی قادسییەو
جامانەی کوردیی تێکەڵن.
ئەیانبینم: عەسکەرەکان و ژەندرمە بەیەکەوە
دارکەنی ناو دارستانی خەون و لەشمن
بەیەکەوە، دوو دوو سێ سێ
سیلەی کۆڵان و بەردەمی گۆڕەپان و
بارەگاکانیان گرتووە.
هێشتا ڕۆژەو کەچی ئەوان
مەرگی شەومیان کردۆتە شان!
ئەیانبینم: (بنەسلاّوە)م ئەلەرزم!
لەوانەیە بموەستێنن و یەکە یەکەو کون بەکونی
شیعرەکانم بپشکنن!
لەوانەیە باخی گشتیی سلەیمانی و چنارۆك و
کۆترەکانی دیاربەکر لە گیرفانما بدۆزنەوەو دەریانبێنن و
هەر لەوێدا بیاندەنە بەر نووکە شمشێرو قەمە.
لەوانەیە لەناو قەدا بەژنی یارو

بەژنی خەیاڵ و ڕوانینم ببڕنەوە
بیانخەنە دوو تابووتی سەرابەوەو
تابووتێکیان بەرەو بەغداو ئەویتریان
ڕەوانەکەن بۆ ئەنقەرە!.
حلی شیعرم لەبەر دایەو
باڵندەی عەشق لە (سەر)مایەوە
ڕوومکردۆتە کافتیریاکەی تازەترین میوانخانە
ئەیانبینم: لەبەردەمی حەوزەکەدا فرۆکەوانە تورکەکان
ماسیی مردوو، گوڵی مردوو چیرۆکی مردوو ئەژمێرن.
فرۆکەوانە تورکەکان، دەوری نەخشەیەکیان داوە
بۆڵە ترێ و چاوەکانی (عبدالخالق)ی هاوڕێم
بەیەکەوە لەسەر مێزەکەی بەردەمیان دانراوە
فرۆکەوانە تورکەکان، لە نەخشەکەی بەردەمیاندا
بۆ هەڵفڕینی ئەمجارە پەنجە ئەخەنە سەر لوتکەی
شاخی (نالیی) و ورد ئەبنەوە
لە ڕۆژهەڵاتی شیعردا
(حاجی قادر) لە بن دەوەنی هاموونددا ئەدۆزنەوە
پێ ئەکەنن، فرۆکەوانە تورکەکان، دەنك دەنك
بۆڵە ترێو وشەی زمانەکەم ئەخۆن.
ورد ئەبمەوە: لە ژێر چەکمەکانی قاچداو
لەبن مێزدا.
توێکڵە هەنجیری شەقڵاوەو

تویێکڵە مێژووی ڕزیوی خۆم ئەبینمەوە.
فڕۆکەوانە تورکەکان، وەختێ ئەفڕن بە ئاسمانداو
لار ئەبنەوە، چاوم لێیە:
چەندین ئەستێرەی مردووی خۆم
لەو بەرزەوە بەر ئەبنەوە.
لە ژوورەوە، لە بنەوەی کافتیریاو
لە گۆشەیەکی نسرما
دوو شاعیری بێلایەنی مۆدێرنیزم
(سەفین) نەبین و جیهان بین
بەرامبەر یەك دانیشتوون و
دووکەڵی جەستەی (نازەنین)
ئەچێتە ناو قوڕگیانەوەو ئەکۆکن و سەرهەڵنابڕن!
وردە جۆگەی خوێنی بەردو خوێنی درەخت
ئەگاتە بن مێزەکەیان. سەر ئەکات و
نوقم ئەبن چاو هەڵنابڕن.
بەردەوامن بەرامبەریەك و بۆ یەکتر
وشەو زاراوە هەڵئەدەن
چۆلەکەی مردوو هەڵئەدەن
لەبەر دەرگای کتێبێکی بەردەمیاندا
ڕیقنە شیعری ئەوروپیەکان ئەچننەوەو
لەژێر باڵی تەیارەدا یەزدانی شیعر ئەسوتێ و
چاو هەڵنابڕن.

بێلایەنن، لەنێوانی فڕۆکەکان و زەویدا بێلایەنن.
لە نێوانی بۆمباکان و باخچەکاندا بێلایەنن.
لە نێوانی گوللە تۆپ و سەری مندا بێلایەنن.
لە نێوانی مەرگی قەلاّو زرێ پۆش و جەنگیزخان و
عەرەبانەکەی مەغدیدو
ئەبوطەبرەو مەولەویدا بێلایەنن.
لەژوورەوە هەر لەتەنیشت ئەوانەوە
پیرەمێردێکی (هیران)ی
سەری ژنە کوژراوەکەی کردۆتە جامێکی فافۆن
بۆ دەروەزە لەگەڵ خۆیدا ئەیگێڕێت و
مێز بە مێزیش ئەخولێتەوەو لەبەر خۆوە
بەیتە شیعرێکی (شێخ ڕەزا) ئەڵێتەوە.
جلی شیعرم لەبەردایەو
باڵندەی عەشق لە (سەر)مایەو
هەر ئەگەڕێم..
بەلای ڕاستدا لائەدەم و
ئەچمە سەر شەقامی (سەرۆك)
لەبەردەمی کتێب فرۆشی (شۆڕش)دا ڕائەوەستم.
لەبالاّ شووشەی جامخانەی وشەی مۆمیا ڕائەمێنم.
لەشووشەدا دەم و چاوی درز بردووی خۆم ئەبینم
ورد ئەبمەوە، لەبەینی درزەکانەوە
پەپوولەی سوور دێنە دەرێ و ئەبن بەباڵی ڕوانینم.

ورد ئەبمەوە لەشووشەدا سەری (شەهریار) ئەبینم
کردوویانە بەئینجانەو گوڵە زەردی (سەری ڕەش)یان
تیا چاندووە. لەشووشەدا سەری هۆلاکۆ ئەبینم
کردوویانە بە ڕۆژنامەو بەخوێنی لاتینیی جەستەم
مەرگی منیان بەڕەنگاو ڕەنگ چاپکردووە.
جلی شیعرم لەبەردایەو
باڵندەی عەشق لە (سەر)مایەو
قوربانیم و گەشتێ بەناو چەقۆکانماو
پیاسە بەناو خوێنما ئەکەم.
ئەیانبینم: وا لەسەرڕا بەرەو خوار دێن
سێ قۆڵی دێن: لە فولکەی ئەتاتورکەوە
هەر بەشەقامی صەدامدا دا ئەگەڕێن
گەرمایانەو ڕوویانکردۆتە مەسیف و
کراسی نیو قۆڵی ئابیان لەبەردایە.
سەرەتا نایانناسمەوە، دێنە پێشێ
ورد ئەبمەوە، وەختێ ئەگەنە بەردەمم
بە تیلەی چاو پێکەنینێکی دڕکاویم بۆ ئەنێرن
سێ قۆڵی دێن- مەرگەوەڕی بۆتانییەو
ئەبو روغالی عەرەب و
لەگەڵ-کیسلنگی نەرویجی-
ئەیانبینم: قیت قیت ئەڕۆن
ئەیانبینم: لەیەك عومران، لەیەك بەرگان
لەیەك کاتدا لەزۆر شوێن و لەیەك کاتدا

**له دوێنێشداو له ئەمڕۆیشدان.**
**ڕەت ئەبن و ڕەت نابن و**
**تەم و مژێ دامئەپۆشێ**
**وەیشوومەیەك وڵاتی خەونم دائەگرێ**
**سەرنج ئەدەم: بولبولی کوژراو ئەبارێ**
**سەرنج ئەدەم: بەردی تاریکیی ئەبارێ**
**سەرنج ئەدەم: عار،عار، عار، عار**
**عار ئەبارێ!**

کۆتایی/1996

# هەڵقرچان

ئێوە (با) یەك بدۆزنەوە، ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە،

لە خۆم بچێ!.

(با) یەك چاویلکەی سەهۆڵی

دوو دەریاچەی حەپەساوی

لەچاوا بێ،

قژی: دەوەنی تاریکیی و

تەوێڵی: ئاوێنەی خوداو

پەنجەکانی: پەلکە گیا بێ...

(با)یەکی لەش ئەنجنکراو، (با)یەکی بێکەس و بێ ماڵ

(با) یەك شەلاڵی کیمیاو

(با) یەکی هاوسەری ئاگر..

(با) یەك نووسەری زریکەی دەشتی (ئەنفال)

ئێوە (با) یەك بدۆزنەوە

ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە

لە خۆم بچێ!.

**(با) یەك كە هاتەسەر شانۆ**

**چون زەماوەندی دار بەڕوو، لە جەژنی كلاْوچنیندا**

**ئا بەو جۆرە، قریوەی بێ و لەگەڵ خۆیدا:**

**حیلەی بەردوو**

**وژەوژی ناو بێشەلاْنی پرسیارو**

**لەگەڵ خۆیدا.. كڕێوەی ماناو**

**پڕووشەی تەلیسماویی و گەردوونێك و**

**لەگەڵ خۆیدا... لەرزەكانی بوومەلەرزەی**

**وشەی پێ بێ!**

**ئێوە (با) یەك بدۆزنەوە، ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە**

**لە خۆم بچێ**

**(با) یەك گڤە تۆو بكات و**

**دەواری تەم هەڵبدات و**

**شەپۆل شێتكا لە كەنارو و**

**ڕەوەز لە شاخ یاخیی بكاو**

**لە باخچەكانی بەفریشا شەتڵی بڵێسە بڕوێنێ!.**

**(با) یەك ئەڵێم: بن هەنگڵی**

**پڕبێ لە وردە چەخماخەو**

**لە وردە كوژەكەی نمەو**

**لە دەفتەری گڵە سوورو**

**لە پەڕی (مەلەك تاوس)و**

**لە بۆنی ڕەنگی (پەریخان)!.**

(با) یەك ئەڵێم:  وەختێ گەیشتە سەر شانۆ

وەختێ کە دەستی ڕاوەشان

بە چوار دەوری مایکرۆفۆندا

بیکا بە باڵندە باران.

ئێوە (با) یەك بدۆزنەوە

ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە

لە خۆم بچێ!.

(با) یەك ئەڵێم: چون جگەرەم

خەم هەر بە خەم داگیرسێنێ و

برین بە برین هەڵبکاو

گومانی مەنگی سەریشتان

بەخرکە بەرد بشڵەقێنێ.

(با) یەك ئەڵێم: کۆنسێرتی نامۆیی من بێ.

(با) یەك شەقامی  (مەولەوی)

بکا بە شمشاڵی لالێو.

(قەلاّی هەولێر) بە ئۆکۆردیۆن.

پەپوولە بکا بە نۆتەو

شەهید بە ژێو

تەمبوری سەری (هەڵەبجە) لێبدات و

گەردنی (ئەستێ) بژەنێ!.

ئێوە (با) یەك بدۆزنەوە، ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە

لەخۆم بچێ!.

لەناو قولأیی ئەویندا

لەو جێیەدا شیعر ئەزێ

ورد بگەڕێن ئەیدۆزنەوە!.

لەوانەیە لەم ساتەداو لەم هۆڵەدا

بە بەستێنی هەڵبەستێکی تەماوییدا

پیاسە بکات.

یاخود بووبێ بە هەناسەی

شێداری ژوورێکی برسیی

یاخود بە (مانگ)ێکی گریاو.

یاخود بوو بێ بە یاقووتێ و لە کەوێڵێکدا نووستبێ.

یان لەناو قژی کچێکی (مەڵکەندی)دا

جریوەی بێ!.

یاخود بووبێ بە فرمێسکی بەردەکێلێکی سەر قەبران.

لەوانەیە:

لەژوور سەری گوڵدانێکی ئاوارەدا

بووبێ بە کزەبای نەخۆش.

ئەشێ بووبێ بە ئاویلکەی

چرای پایز

لەگوێ چەمێ!.

لەوانەیە:

لە زیندانی تفەنگێکدا بەند کرابێ.

لەوانەیشە:

لەبازگەیەکی گومرگاو
وەکو چاوانی یارەکەم
فرێدرابێ!
ئێوە (با)یەك بدۆزنەوە ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە
لەخۆم بچێ!.
لەئاوی شپرزەییدا، لەئاوی خۆشەویستیدا
ببنە ماسی و ورد بگەڕێن ئەیدۆزنەوە!.
گەر دەنگی (دیلان) بگەڕێن
لەبەرزایی چریکەدا
ئەیدۆزنەوە!.
گەر گیرفانی نوکتەکانی (کەمال سابیر)
بپشکنن، لەلۆچێکدا
ئەشێ (با)یەکی سەرخۆش بێ و
گرمۆڵە بێ و
ئەیدۆزنەوە
ئێوە دارێك... بدۆزنەوە
ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە، لە خۆم بچێ!.
دارێك تەنها لەسەر یەك قاچ سەما بکاو
بەسەد دەستیش باڵندەکانی ڕاژەنێ.
دارێك کە هاتەسەر شانۆ
هەر لەبەردەمی ئێوەدا
کسپەکانی وەك گوڵ هەنار

بپشکوێن و
هەر لەبەردەمی ئێوەیشدا
ئەستێرەکانی
هە
ڵ
وە
ری!.
دارێك ئەڵێم: وەختێ ئازاری خۆی تەکان
کورسیتان و
باڵاتان و
خەونەکانتان
ئاڵ هەڵگەڕێن
دارێك ئەڵێم: هەر لە هۆزی
سێدارەکانی ئێمە بێ!.
دارێك کە شیعری خوێندەوە
لە زاریەوە:
پۆلە پاساری ڕەنگاو ڕەنگ بێنە دەرێو
لە ڕوانینی گەڵایشەوە
قەڵەمی باڵدار... هەڵفڕێ!.
لەناو بەرایی ئەویندا، تەماشاکەن،
ئەیدۆزنەوە:
لەسەر گردێکی کوژراوم.

له كەنار جۆگەی خنكاودا.

لەناو ماڵی قوربانیدا و له باڵای بێوەژنێكدا.

له دەفتەری

وێنەكێشانی كیژێكی كەركوكیدا،

ئەیدۆزنەوە.

لەم ساتەدا..

شوێن كەنسمه سوورەكانی باكوور كەون،

شوێن فڕینی برینداریان، ئەیدۆزنەوە.

شوێن پێی شەپۆلی (خابوور)و

جێ پێی خوێناویی مامزی ناو (هەكار)و

شوێن سێبەری دووكەڵی ڕاكردووكەون،

ئەیدۆزنەوە.

ئێوه دارێك بدۆزنەوە، ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە

لەخۆم بچێ!.

دارێك ئەڵێم: وەختێ خوێندنەوەی تەواو كرد،

له شانۆوه هاته خوارێ

لەو دەمەوە

له ڕۆحتاندا

گێژەنەكانی پرسیارو

هەوره تریشقەی سەرسامیی و

چاوەڕوانیی نێو دۆزەخ و

ئەوق بوونی بەردەم: خوێنی

ئەم دیرۆکە بە جێبێڵێ.
لەو ساتەوە:
تەواو ئەبێ
دەست پێ بکاو،
وەختێ بڵاوەی لێ ئەکەن
ئەم بێتەوەو
لە گەڵتاندا بێتە ماڵێ و لە خەونیشدا
ئامادە بێ و بتاندوێنێ.
ئێوە (با) یەك بدۆزنەوە
ئەم شیعرەم بخوێنێتەوە
لە خۆم بچێ!.
(با) یەك.. بەردەوام بێدەنگیی هەڵکۆڵێت و
درەختێکیش:
بە تەوقی سەر
هەموو بنمیچەکان کونکاو هەڵچێ،
هەڵچێ و هەڵچێ...

ستۆکهۆڵم
1997/9/27

# لاورا

لاورا
پڵنگە شیعری خۆش ناوێ!
لاورا ئەڵێ: هۆنراوەی تۆو
پڵنگە تووڕەو برسیەکان لەیەك ئەچن.
لاورا ئەڵێ: کە شەو دادێ
لە زریکەیان ئەترسم.
هەر پێم ئەڵێت و پێم ئەڵێ:
وەك ئەنووسیی بە باڵی کۆترێ بنووسە!.
بە دەنووکی چۆلەکەیەك.
یاخود بە ڕوومەتی گوڵێ.
بۆچی بە چڕنووکی پڵنگ؟!
چیبکەم..لاورا.. پڵنگ نەبووم
نە بە دەنگ و
نە بە چنگ و
نە بە سیما

**بەڵام لاورا (داوە)کانی هەرچوار دەورم**

**تۆ ئەو (داو)انەت بیر نەچێ؟!**

**لاورا**

**بە هاوارو بانگە بانگی چیاکانم**

**بە هەڵسانە سەر پێی بەردوو**

**بە دەنگی بەرزی درەختم**

**زۆر پەست ئەبێ!**

**لاورا ئەڵێ: نزم بدوێ**

**مەبە بە گڤەی شێت و وێت**

**مەبە بە چەمی زستانەو**

**دەنگ هەڵمەبڕە**

**نزم.. نزم.. نزم بدوێ!.**

**چیبکەم لاورا! منیش هەمیشە هەر سروەم**

**لە ڕەشەباو**

**مانگە شەوم لە گەرداو لا جوانتر بووە**

**بەڵام ئاخر سێدارەکان لاورا!**

**سێدارەکانی چوار مەرگم**

**سێدارەکانت بیر نەچێ!**

**لاورا**

**لە ورێنەی شەوانەم و**

**لە جووڵە جووڵی خەیاڵم و**

**لە تەقەو ڕەقەی هات و چۆی مەکۆی ژانم**

دەهریی بووەو
وا خەریکە ماڵ جێبێڵێ!
لاورا ئەڵێ: دە بە ئارامیی پاڵکەوە
بە ئارامیی خەو ببینەو
وەکوو ئەم خەڵکە ڕاکشێ!
چیبکەم لاورا!
منیش هەر حەز بەوە ئەکەم
بوخچەی هەورێکی شل و مل سەرینم بێ.
وا حەز ئەکەم، وەك چارۆگەی
بەلەمێکی سەر ڕووی زەریا
لەبەر سایەقەی شەوێکی دڵنیادا
لەرەم نەیە!.
بەڵام لاورا..ئاخر لاورا.. ئەنفالەکان
ئەنفالەکانت بیر نەچێ!
لاورا ڕقی
لە ڕەنگی گریان و، بۆنی
شین و شەپۆڕ ئەبێتەوە.
لاورا ئەڵێ:
ئەم تەم و مژە لابەرە لەسەر چاوت.
ئەو پەردەیە هەڵبەرەوە لەسەر خەمت و
ڕوون بەرەوە!
وەك سپێنەی چاوەکانم ڕوون بەرەوە

وەکوو قژم بریسکەت بێ و
وەکوو خوێنم قوڵپ بدەو
وەك سپێدەی گەردنیشم
شەوق بەرەوە!
چیبکەم لاورا! چیبکەم منیش
زۆر حەز ئەکەم شەپۆلی پێکەنین بمبا
زۆر حەز ئەکەم..پرشنگەکانی گۆرانیی دامپۆشن و
زۆر حەز ئەکەم.. ببم بە گەڵاْ شیعرێکی
هەڵفڕیوی نیوە شەوی باندی سەما
بەڵام لاورا! ئاخر لاورا! تۆ هەڵەبجە،
تۆ هەڵەبجەمت بیر نەچێ!
لاورا نایەوێ قەت چارەی
شیعری سیاسیم ببینێ.
ئەو گەلێ جار.. لە ژوورەکەم دەریان ئەکات.
ئەو گەلێ جار.. چەکیان ئەکاو
پێناسەیان ئەسووتێنێ و
دروشمەکانیان ئەدڕێنێ!.
لاورا ئەڵێ: ئەم گژەبای سیاسەتە
وەختێ کە دێت
ڕۆحی شیعر ئەژاکێنێ.
شەونمیان وشك ئەکاتەوە!
لاورا ئەڵێ: ئەو شیعرانەت

**ماڵیان پڕ کردووم لە دووکەڵ**

**لە بۆکڕوزی غەریبیی**

**لە بۆنی گۆگردی خوێن و**

**لە ناڵە ناڵی سێدارەو لە تەمتوومانی تەنیایی.**

**ئەو شیعرانەت.. سووتوو لەسەر کورسیەکەم و**

**جلکەکانم و چەرچەفی پاکم جێدێڵن**

**لەسەر مافووری هۆڵەکەم..**

**جێ پێی خوێناویی جێدێڵن..**

**لەگەڵ خۆیان قوڕولیتەی کۆچ و کۆچ ڕەو**

**دەهێننە ناو دالأنمەوە..**

**چیبکەم لاورا، سیاسەت لای ئێمە لاورا!!**

**لە دەسرازەی ناو بێشکەوە تاکوو کفن**

**لە لەشمانەوە ئالأوە، لاورا!**

**هەموو ڕۆژێ نان و مەراق.**

**لەگەڵ سیاسەتا ئەخۆین.. لاورا!**

**لە هاوسەرەکانمان زیاتر لەگەڵ سیاسەتا ئەنووین.. لاورا!**

**لە منداڵەکانمان زیاتر لەگەڵ ئەودا دائەنیشین.. لاورا!**

**بەلأم لاورا.. ئاخر لاورا.. کوردستانم، کوردستانم**

**تۆ کوردستانت بیر نەچێ!**

ستۆکهۆڵم
1997/11/8

# ڕابووردو

# له خەونە ڕۆمانسیەکاندا

**یەکەم: دەم وچاو**

**لەدەم و چاوی دایکمدا: نزمە هەورێکی هەژاریی،**

**زەردەخەنەیەکی ژاکاو، کزەبایەکی بێوەژن،**

**دێن و دەچن.**

**له دەم و چاوی پایزدا: جوتێ باڵندەی فرمێسك و،**

**پۆلێ هەناسەی زەرد باوو، کۆمەڵێ گۆنەی وەریوو،**

**مەراقی زەردە.. هەڵئەفڕن.**

**لەبەرۆکی پایزەوە: بۆنی تەپ و نم و خۆڵی**

**نیوە وشك و نیوە تەڕو**

**بۆنی ڕەنگێکی شێدارو**

**بۆکڕوزی عەشقێکی تازە سووتاو دێ.**

**لەبەرۆکی دایکمەوە:**

**بۆنی ڕەشە ڕێحانەکەی خەم و**

**بۆنی مێرگی کراسێکی ڕەشی ئاودامان و**

بۆنی تەنیایی ژوورێك و
بۆنی تیژی گوڵە شەوی مێخەك بەند دێ!.

**دووەم: گژەبا**

لەناکاو کە دارتووی قاچ قەوی و سەر زلی حەوشەکە
خشەخش مافووری ئەستووری خەزانی ڕائەخست.
گژەبایش لەسەررِا بە چاوی خۆلاّویی و بە بۆڵەو خوتەوە،
هەندێ جار بە دەنگی زیقن و هەندێ جار (گرِە)وە،
ئەهات و تەنەکەی بەتاڵی کۆلاّنی تەقە تەق
لە سەرشان ئەبردوو ئەگەیشتە کەلاوەی گەرِەك و
لە خۆڵداو لەبەردەم کولانەی قورِینی سەگاندا،
دوو گێژی ئەخواردو، لەپێشدا، ناوقەدی ئەستوورو
دواتریش مل باریك بەرەو ژوور هەڵئەچوو، لەگەڵ خۆی،
دەفتەری درِاوو لاپەرِەی ڕۆژنامەو مقەبای لوول ئەداو،
سەرئەکەوت بۆ سەریان، لەوێش ڕا، لەپووشی زەردەڵەو
لەگەلاّی سوورکەلەو پەپوولەی خرِیلەی پاییزەی ئەهێناو
بەکۆمەڵ لە گۆشەی دالاّن و لەسووچی هەیواندا،
ڕۆی ئەکرد. ئەوساکە، حەوشەمان بۆ پیرە پایزی
ڕووتەڵەی شان کوورِی بەر سەرما چۆڵ ئەکرد!

**سێهەم: مقەڵی**

مقەڵی مسینی دەسك زەرد، چوار گۆپکەی قوللەیی،

مقاشی سەر شانی و سینییەك لە ژێریا. چەند پشكۆی
لاڵ وپاڵ لێكەوتووی زۆر ئاڵ و هەندێكیش نیوەیان
هێشتا ڕەش. بۆشایی نێوانی دوو پشكۆی گەشاوەو
بریسكەی یاقوتیی: خەیاڵی منداڵیی هەڵئەفڕان بۆ
دنیای پڕ سیحرو ئەفسانەی شەوانەی حیكایەت.
پشیلەی دەستەمۆی ناوماڵیش، ڕەنگی تووك تێكەڵێ
لەسپی و قاوەیی، لەئێمە نزیكتر ئەبۆوە لەپشكۆو
مقەڵی، بەكڕی تەنیشتی تووكنی تێ ئەكرد هەندێ جار
تاڵێكی درێژی سمێڵی ئەپڕوزاو میاوێكی بۆ ئەكرد.
لەپشكۆ ئەچووینە پێشەوە، تینێكی هاڵاوی گەرمای تیژ
ڕوومەتی ئاڵ ئەكرد، ڕوومەتی داخ ئەكرد، بەلاَم هەر،
دەزوولەی سەرمایەك، لە پشتتا جێ ئەماو، هات و چۆی
خۆی ئەكرد. لەپڕدا هێلكەیەك لەنێوان پشكۆدا
ئەتەقی و ئەڕژاو كەفێكی ئەكردوو لەنیوەی زیاتری،
ئەچووە ناو خۆڵەمێش!
وا دایكم ئەمساڵیش چی جلی پارمانە هێنانیە
دەرەوە، بۆ پینەی دوو ڕەنگ و وا قاچی درێژ كرد.
وا منیش چاوەڕێم، ئەزانم ئێستاكە، پێم ئەڵێ:
(ها كوڕم دەرزیەكە! تۆ چاوت تیژترەو، دەزۆكەی پێوەكە).

ستۆكهۆڵم
1997

# جەژن

لەبەرایی دەشتێکی تەلیسماویدا، لە نێوانی (زاخۆ)و مەرگ و
هەموو خەونە دوورەکانی خاکدا، هەورێکی نزمی خوێناویی
ئاوێنەمە. من ڕوخسارم گۆمێکی شوشەی شکاوەو
ووردو خاشە پەیڤی ئاو و پەیڤی دەنگم و.. وائێستەکە،
لەو ئاوێنەو لەو گۆمەدا، باڵندەکانی دووکەڵی ناو (هەکار)و
ڕیشی سووتاوی چیای (جوودی)و (ئەربائیلۆ)و شەوانی
دیلەکانی قەلاّی زەلیل ئەبینمەوە.
میهرەجانی خوێنم گەرمە.
میهرەجانی گوڵی خائین گەشاوەیەو
چرا... سەرمە!.
کە ڕێ ئەکەن، لە بەرایی ئەو دەشتەدا، تا چاوی خوێن هەتەر ئەکا.
تا چاوی (مانگی یەك شەوە)و (ئەستێرەکەی) نێو باوەشی
هەتەر ئەکەن. ڕقی زەرد ئەبریسکێتەوەو لە ئاقاری هەموو
عەشقێکی سپیدا، لە دەڤەری هەموو دەنگێکی سپیدا، دروێنەیەك،
لەناو کێڵگەی گوڵە گەنمی گۆرانیم و چاوەکانتا بەرپا ئەکەن.

له بەرایی دەشتێکی تەلیسماویدا..
جەژنی لەدایك بوونەوەی تەورە
جەژنی لەدایك بوونەوەی ژەهرە
جەژنی گەڕانەوەی (مەرگەوەڕە) بۆ (جزیرە)و
جەژنی هەڵدانەوەی پەردەی زەردە لەسەر
پەیکەرەکەی (ئەتاتورك)و
قۆچی قوربانیی ئەم دەشتە تەلیسماویو
ئەم زەماوەندی دەڤەرەیش
شەپۆلەکانی (خابوور)ە!

کۆتایی نیسانی
1997

# مەرگی مانگێك

دوێ شەو مانگ کەوتە دەریاچەی (دوکان)ەوەو
کەس نەیزانی.
ئەوینێکی کەسك خنکاو..
ئاوازێکی سپیی مردوو.. کەس نەیزانی.
دوێ شەو مانگ کەوتە خوارەوە
مانگ کەوت بەسەر نیشتماندا و
نیشتیمانیش دانەچڵەکی و
مێژوویش خەبەری نەبۆوەو.. کەس نەیزانی.
دوێ شەو مانگ کەوتە دەریاچەی دووکانەوەو
لە کەناری پایزێکدا، وشەو وشەو گەڵا گەڵا
درەختی شیعر هەڵوەری.
دوێنێ شەوێ.. دیرۆکێکی سمێڵ بابڕ.. ڕیش خەناویی
لە دەراڵی چەرماوەندا
لەناو بێدەنگیی شێداری جەنگەڵێکدا
کە دانەویی

تاریكیی كرد به دەسكێش و
كلاوێكی فەتواچنی لەسەر كردوو
مانگەشەوێكی سەربڕیی.
دوێنێ شەوێ خەرمانەیەك لە خەمی من
لە ناو خوێندا گێژی خواردو قریشكانی و
شوشەبەندی سایەقەیەك هاڕەی كردو
ستارەی كوژراو داباریو
بەلآم كەسیش پێی نەزانی.
دوێ شەو مانگ كەوتە خوارەوەو.. پرشنگ پژاو،
تریفە كەوتە ناو زێوەو.. زێ بوو بە تابووتی زیوین.
خەونی هەپرون كەوتە سەر ئاو. هەناسە بوو بە تەمێكی
سەر قەشقۆڵی و فرمێسك بوو بە وورده ماسی و تاوان بوو بە
قەوزەی ڕووبار. ئاو زریكەی هەڵپژاو بوو،
ئاو ژنێكی گوندی چەقۆو ئاو كچێكی هۆزی ڕق و
عەشیرەتی
زەرده مار بوو، سەر بەرەو خوار ڕایئەكردو
كەزیەكانی شەپۆلی خۆی ئەڕنیەوەو
سەری ئەكێشا بەبەرداو
جەستەی عەشقی هەلاهەلاو ووردوخاشی
ئەگەیاندە مەیتخانەكەی دێرینی شار،
بەلآم ئەوسایش... لە وەتەنی نێرینەدا...
لە نیشتمانی سمێڵ و لە قانوونی ناو جامانەو ئەفسانەدا

**نێرێك خەبەری نەبۆوە**

**یاسا خەبەری نەبۆوەو**

**دادگا خەبەری نەبۆوەو..**

**کەس نەیزانی!.**

**هەموو جارێ.. خێڵێ چرای مەمکی خەزاڵێ ئەشکێنێت و**

**هەموو جارێ خێڵێ تابوتێ لە داری حەد دائەتاشێ بۆ (خەج)ێك و**

**هەموو شەوێ ڕیشێ بە خوێنی شیعرێکی مێینەی من**

**پاراو ئەبێ بۆ غیلمانی ناو بەهەشت و**

**هەموو جارێ و هەموو جارێ**

**شمشێرێکی نوورانیی دێو**

**(شیرین)ێکم لەبەرماڵەوە ئەپێچێ و ئەیفرێنێ!**

**دوێ شەو مانگ کەوتە دەریاچەی دوکانەوەو**

**ئاو سوێی بۆوەو.. ئەوینێکی کەسك خنکاو**

**ئاوازێکی سپیی مردوو**

**هەڵبەستێکی نارنجیی من دڵی وەستاو**

**کەس نەیزانی!.**

1998/11/24

# چوارده پۆرتەرێتی شیعریی

### 1ـ خانیی

رابن! شاخێکی شیعر هات.
شاخێ کە خوا ئاسۆیەتی و
کورد بناری.
رابن! سەرچاوەی دیجلە هات
عەشقنامەی ئەم وڵاتەو
پێغەمبەری (مەم و زین) هات!

### 2ـ وەفایی

پەپوو سلێمانکەیەکی ڕۆژهەڵاتی گۆرانیم و
تاق تاقکەرەی سەر درەختیماڵی (شیرین)
هەموو جارێ (شیرین) لەسەر بانیژەوە
تەشی ئەڕست
کەچی (وەفایی) لەخوارێ
شی ئەبۆوەو، ئەبووە خوری!.

### 3ـ مەولەوی

دڵۆپە نووری تەوێڵی (هەورامان)و
دارژانی مرواری ناو زمانەکەم،
وەختێك بروسكەی خەیاڵ و
هەوری وێنە لەیەك ئەدەن.
لە خەڵوەتێكی نەقشییدا
ئاوێتە بوون لەگەڵ خوادا و
لەم لایشەوە لە دایك بوونەوەی سروشتی تر.
ڕیشێ قۆزاخە بۆ كرمی ئاوریشمین و
سەرێ گوڵدان بۆ چنوورو
فرمێسكە زیوینی چاویش
بۆ كۆچەكەی (عەنبەر خاتوون)

### 4ـ حاجی قادری كۆیی

هەڵۆیەكی (هەیبەت سوڵتان)
چرایەكی بەگەردنیا هەڵواسیوەو
بەشەوەزەنگدا ئەگەڕێ.
پڵنگێك زەنگێكی پێیەو
لە تاریكیدا لێی ئەدات.
بەفرێ سەری خۆی هەڵدەگرێو
لەناو بیاباندا ئەمرێ!.

## 5ـ پیرەمێرد

ئەم (گۆیژە)یە؟! یاخود (گۆیژە) پیرەمێردە؟!
ئەم شاتووە پەند ئەگرێت و
ئەم بەڕووە قسەی نەستەق.
ئەم بەڕووە بۆ یەکەم جار
کلاّوی خۆی کردە سەری (مامەیارە)و
بۆ یەکەم جار پەل و پۆی خۆی
فڕێدایە ناو ئاگرەکەی جەژنی  نەورۆز.
ئەم بەڕووە، هەر لە لق و پەلی جەستەی
تەختەی حەرفی دائەتاشی و
ئەیدایە دەست کانیەکانی
 (ژیانەوە) و (ژین)ی دوا ڕۆژ!
ئەم شینە شاهۆیە عومرە
هەتا ئێستەیش
لە ئاسمانی زمانێکی شیندا ئەفڕێو
لە نەورۆزیشدا ئاگرە!

## 6ـ قانیع

ئەو مێوژەی
کە گوندێکی شیعر نەما
لێی نەخوات و
کەچی خۆیشی

بەدەمی تاڵ
ماڵ ئاوایی لە مێوژو
لەئێمە کرد!

## 7ـ عەلائەددین سوجادی

لە قوتیلکەی مزگەوتەوە
سەری جوقاو هاتە دەرێ.
کە گەورە بوو، بوو بە (شاهۆ)و
بوو بەچرای مانگە شەوێ.
یەکەم کەسێ بەتریفە.
مێژووی دەریاچەی نووسیەوەو
بەلاّم دوایی لەبەستێندا بوو بەتەمێ!.

## 8ـ عەبدولواحید نوری

کەڵەشێرێك.
ڕۆژگارێکی خەو لێکەوتوو.
دەفتەری سنگێکی زامدار.
کەڵەشێر بانگی نوێی ئەدا
مێژوویەك لە خەو هەستێنێ
بەلاّم مێژوو هەڵ نەئەساو
هەتا دوا جار
ئەم دەفتەرە باریکەلەو

ئەم فەنەری سدارەیە
لەناو خوێنی خۆیدا خنکا!

## 9ـ دڵدار

ئەو شەماڵەی لەناو"خەندەی بایی"یەوە
لەبرینی گوڵێکەوە
هێواش هێواش هەڵیکردوو
هەتاکوو بوو بەباهۆزی سرودێك و
بالآی باهۆز گڕی گرت و
بەگڤەگڤ چووە سینەی
شاخ بەشاخ و
چووە گیانی باخ بەباخ و
چووە هەموو ماڵێکەوە!.

## 10ـ هێمن

ئەگەر بێت و قاپێ بادەو
لەگەڵ بیست سی قول جگەرەو
لەگەڵ دیوانەکەی (حافظ)
لەسەر گۆڕیو لەژوور سەریەوە دابنێن!.
ئەگەر بێت و (خەج) یان (ستێ)
کچە بێری و پەریخانێ

**دوو سێ جارێ بانگی بکەن..**
**لەوانەیە هەستێتەوەو**
**جارێکی دی بچێتەوە جێ ژوانێ!.**

## 11. دیلان

**(مانگ)ێکی شین**
**هەڵبەستێکی وەنەوشەیی.**
**چریکەیەك بەرەو ئەستێرەكان ئەفڕیی و**
**تەنانەت خوایش لە وەختی بێ تاقەتیدا**
**گوێی لێ ئەگرت!.**

## 12. محرم محمد أمین

**خۆی قامیش و**
**بۆ چیرۆکیش کەریتە بوو.**
**ڕەنگە جارێك**
**لە (سەیرانەکەی ئەزمڕ)دا**
**پێکەنیبێ**
**کورتە چیرۆك لە وەرزێکی ڕەشپۆشدا بوو**
**بردیانە بەردەم قولاپ و**
**بەلاّم لەوێ**
**وەك ڕۆمان مردا!**

## 13ـ محەمەد مەولود"مەم"

وشەیەکی لەش بەبارو

گیانێك وەك هاوینانی شەقلاوەو

بەفری سەفین

پاك و ڕووناك.

دەوارێکی هۆبەی چیرۆك

لەبەردەمی ڕەشەبادا.

فوارە ئاوێکی سەر قەلاو

قسەی فێنك.

"ڕێگای گەنم"  وەختێ ئاونگ تەڕی ئەکا

لە بەردەمی مانگەشەودا.

ڕۆژێکیان هەر ئەوەندەی"پەنجا فلسی"یەك

برك و ژانێ

لە ناو هەناویا هەڵ تۆقی و

ئیتر ئەوسا بە گڤە گڤ مەرگ هات و

فڕانی  وەك گوڵ ئەستێرەی بن بنارو

گەلای دەم"با"!.

## 14ـ سوارەی ئێلخانی زادە

کەوێکی نوێ

قاسپەی کۆن فڕێ ئەدات و

لەڕەگەزی

# دۆنا دۆن

ئەگەر لە ڕۆژێکدا مردی و ڕەشەبا بوو
ڕەنگە ڕۆحت بچێتە ناو لەشی بەورێکەوە.
ئەگەر لە ڕۆژێکدا مردیو بە باران بوو
ڕەنگە ڕۆحت بچێتە ناولەشی گۆمێکەوە.
ئەگەر لە ڕۆژێکدا مردیو خۆرەتاو بوو
ڕەنگە ڕۆحت بچێتە ناو لەشی تیشکێکەوە.
ئەگەر لە ڕۆژێکدا مردیو بەفرانبار بوو
ڕەنگە ڕۆحت بچێتە ناو لەشی کەوێکەوە.
ئەگەر لە ڕۆژێکدا مردیو تەمتوومان بوو
ڕەنگە ڕۆحت بچێتە ناو لەشی دۆڵێکەوە.
بەلاّم ئێستە وەك ئەبینن: من زیندووم و
شیعرتان بۆ ئەخوێنمەوەو
کەچی رۆحم زۆر دەمێکە
چۆتە جەستەو
ناو لەشی کوردستانەوە!.

# وریاکردنەوە

بەپێی پەتیی بەناو ئەم شیعرەدا نەڕۆی!
هەمووی هەر وردە شوشەیە!
بەر لە تۆزێ ئاوێنەیەکی مەراقم
بە دەست خەیاڵمەوە شکاو
کەوتە خوارێو، چون نامۆییم وردوخاش بوو!
بە دەستی ڕووت پەلکی ئەم شیعرانە نەگریت!
هەمووی دڕکە، هێندە نابێ،
من بنچکێکی مەراقم.. لەم پێدەشتی پەیڤانەدا...
چقڵی حەرف و ژانی دەرکردا!.
کە ئەم شیعرەیشت جێهێشتم..
بێ چەتر نەچیتە دەرێ، تەماشاکە:
لە باشووری خەفەتەوە
پەڵە دەنگێکی ڕەشتاڵە بەرێوەیە
وەختێ بگاتە سەر ئێرە.. من ئەزانم
زۆر بە خوڕڕەم لاواندنەوەی دائەکات و دا ئەبارێ!

# چاو

من لێرەوە چاوم لێیە: لەو چیایە..
بەتوولە ڕێی ملەیەکدا.. هێواش.. هێواش
کیژێك ئەچێت بۆ ڕێواسان.
من لێرەوە چاوم لێیە: لەو چیایە..
دڕندەیەك هەر لە ڕێگەی ڕێواساندا
لەناو چاڵی بۆسەدایە!.
من لێرەوە چاوم لێیە: وا مامزێ لەو پێدەشتە
تینوو.. تینوو.. ڕووی کردۆتە کانیاوێ
من لێرەوە چاوم لێیە: لەو پێدەشتە
فاقەو داوێ
لەسەرە ڕێی ئاسکدایە.
من لێرەوە چاوم لێیە: لەبەر دەمی ئەو گوندەدا
ئەسپێکی سپیی بەستراوە
سمکۆڵاَن و حیلەیەتی
من لێرەوە چاوم لێیە: هەر لە ژێر سکی ئەسپدا..

**مارێکی ڕەش بۆ پێوەدان.. فیشکەیەتی**

**وا هەڵئەستم:**

**تفەنگەکەی پشت سەری خۆم دائەگرم و**

**بە ڕاکردن ئەگەمە بەردەمی گوندو**

**مار ئەکوژم و ئەسپە سپیش ئەکەمەوەو**

**خۆم هەڵئەدەمە سەر پشتی.**

**ئەدەمە غار..**

**ئەگەمە پێدەشت و بنار**

**فاقەکە ئەتەقێنمەوەو**

**مامزەکە ڕزگار ئەکەم**

**هەر لە غار دام.. ئەگەمە شاخ و سەر ملە**

**ئەگەمە ڕێگەی ڕێواسان..**

**تەقە ئەکەم لە دڕندەو ڕاوی ئەنێم..**

**کیژۆڵەکەیش قوتار ئەکەم.**

**کە لەو سەریش گەڕامەوە بۆلای ئێوە**

**لە پاشکۆدا: کیژو ڕێواس و مامزوو**

**ئەسپی سپیی خۆشەویستیی ئەهێنمەوە!**

# له ناو بەفرێکی تاریکەوە

رووبارم سەرخۆشەو گەمیەکەم زەردەبا ئەیبات و
چارۆگەم چون مێژووم شیتاڵەو
شەپۆلیش قەسیدەی یاڵ بڕی زامدارو سەرکێشە!.
من شەوم.
من جەستەی دەریاچەی کوژراوم
خوێنی شین جیهانی سەر ڕێژمە.
من ئێستە لە نێوان ئەم مەرگە شلە داو
لە نێوان ئەم ئاوە ڕەقەدا
بارڕژنی قەڵەمی زیندانییم.
من باڵی فرمێسك و دەنووکی وەڕسیی و
ئاپوورەی تەنیاییم.
من شەوم.
من وەرزی خاکێکی ئاوارەم.
بەیانیان هەڵئەسم: ئەوەرێم.
نیوەڕوان، ئێواران، من باڵای دووکەڵم و
من بەژنی خوێنێکی پاییزەم بە لووزەو ئەپژێم.

بەتەنها لە خەونا من کەسکم کە ئێوە ئەبینم.
ئۆە! کچی وڵاتی سەنگەسار!
زەمانێك بارانی چاو ڕەش بوویت
باریت و منت کرد بە گۆمی قەسیدە.
زەمانێك هەتاوی چاو ڕەش بوویت
هەڵهاتی و منت کرد بە خەمی ڕووناکی قەسیدە.
تێپەڕی سەعاتی شەرابیی.
تێپەڕی سەعاتی هەلاڵەو گۆرانیی.
من ئێستە لە بەفری تاریك و لە قوتبی تاریکدا
چراوگی کوێرم و
باڵندەی کەسیرەی سەر شەختە!.

# ئازارێکی قۆشمە!

بۆ (کەمال سابیر)

**ئەمێستاکە بە وێنەی تیزماڵکە هەوری**
**دەم خۆرنشین**
**ڕوانینم باریك و زیزەو، تەنیاییشم**
**لەناو فرمێسکێکی ڕووندا، بنارێکی خەمستانە**
**بۆ هەڵقوڵین.**
**کەماڵ سابیر!**
**ئەی بەدبەختیی لەیەك دەوری بەردەوامدا هەتا مردن!**
**ئەی پێکەنینی دووکەڵ و گاڵتەو گەپی خەمی قۆشمە،**
**هێشووی نوکتەی هەڵوەریوو، کۆمیدیای تراژیدیو**
**کۆڵەوژی دەم بەخەندەی تەندوورەکەی نیشتمان و،**
**ئەی قاقای ژان!**
**تۆیش بووی بەترووسکەی ونی یادگاری ئەو دیو تەم و**
**تۆیش بووی بەخەونێکی شانۆی هەڵفڕیوی چاوانی شار.**
**تۆیش کشایت و بەسەرماندا کەوانەیی تیژ تێپەڕیت.**

ئەی یارانی مەیی ڕۆح و ئەڵقەی ئەوین!
کورسیەکی تریش چۆڵ بوو.
پەرداخێکی تر لابراو
مۆمێکی ترمان لاربۆوەو
گوڵدانێکی ترمان شکاو، وەك گوڵی پەڕە دەرکێشراو
چۆن کەل ئەبێ.. کەم بووینەوە.
ئەی یارانی مێزگردەکەی (نووری بادە)!
من لێرەوە بەدەستی ڕاست
پەرداخەکەم هەڵئەبڕم و
بەچەپیشم پەرداخەکەی (کەمال سابیر)
لێکیان ئەدەم
تەنیام و ئەزرنگێمەوە.
من ئەمشەو یادێکی سپیی پڕ لەسەهۆڵ
لەپەرداخی ئازارێکی قۆشمەدا
هەتا دواچۆڕ ئەخۆمەوە!.

ستۆکهۆڵم
1997

# دۆنا دۆن

بۆ (زەکیە ئالکان)

دارێك سووتا.. دووکەڵەکەی
هەڵبەستێکی گریاناویی بۆ باخ نووسیی.
کە باخ سووتا.. دووکەڵەکەی
چیرۆکێکی زۆر غەمگینی بۆ شاخ نووسیی.
کە شاخ سووتا.. دووکەڵەکەی
پەخشانێکی فرمێسکاویی بۆ گوند نووسیی.
کە گوند سووتا.. دووکەڵەکەی
شانۆیەکی تراژیدیی بۆ شار نووسیی.
لەشاریشدا ژنێك هەبوو
کە جوانیی درەخت و شاخ و
گوندو شاری
لەناو دڵ و لە ناو چاوو لەباڵادا هەڵگرتبوو
وەختێ ئەو ژنەیش خۆی سووتان بۆ ئازادیی
دووکەڵەکەی
داستانێکی بێ کۆتایی
بۆ سەرانسەری وڵاتم هەمووی نووسیی!

بەرلین
1997

# بزربوون

شەو نووستوە.. هەموو جارێ هەڵیئەگریو
ئەیکەیتە کۆڵ، ئەیبەیت بۆ سەر کەلی شاخێ
باران لێی ئەداو نووستووە.
بەفر بەسەریا ئەبارێو هەر نووستووە.
زریانیش ڕایئەوەشێنێ و هەر نووستووە.
کەچی وەختێ بۆ بەیانیی
بەهێواشی
تاڵە تیشکێ پەنجەیەکی تێوە ئەدات
نازانی چۆن نامێنێت و
لەشوێنی خۆی بزر بووە!

# کەمین

(زریان هەر لە کەمیندا بوو)
گەلاێەك هەموو نەهێنیی درەختەکەی پێ ئەزانی:
پەیوەندی ئەوو گۆمەکەو چرپەی شەوان.
پەیوەندی ئەوو باڵندەو نامەی کێڵگەو
هات و چۆی تیشك و جڤینی نێوان وشەو
ئێوارانی ناو دارستان.
پەیوەندی ئەوو مانگەشەو
پەیوەندی سێبەری ئەوو کوڕەشوان و
شمشاڵەکەی.
(زستان هەر لە کەمیندا بوو)
دەنکە چەوێکیش نەهێنیی
جۆگەلەکەی لەسنگدابوو.
نەهێنیی ئەوو ڕەگەکان.
نەهێنیی ئەوو پەلکە گیاو
نەهێنیی ئەوو ڕوخساری کچە شوان و

نەهێنیی ئەوو سەرچاوە.
(لافاو هەر لەکەمیندا بوو)
کە زریان هات
کە لافاو هات
گەڵا لەسەر کورسیی لق و
چەویش لەناو ژووری ئاودا
هەردوو کوژران
بەڵام هیچیان
نەهێنیی عەشقیان نەدرکان!

ستۆکهۆڵم
1997

# کاغەزێکی سپی

**لە کەیەوە دانیشتووم و هێشتا کاغەزم سپییە..**
**سپیی.. سپیی.. نە حەرفێکی تێدا ئەڕوێو**
**وشك و برنگ، نە ئاوێکی تیا هەڵئەقوڵێ!**
**لەکەیەوە دانیشتووم و هێشتا کاغەزم سپییە.**
**درەختی بەر پەنجەرەکەیش لەناو هەوایەکی کپدا**
**بێزار، بێزار، تێم ئەڕوانێ.**
**هێشتا کاغەزم سپییە.**
**قومرییێك دێت بێزاریی درەخت دەرئەکات.**
**چرپە چرپێك لەگەڵ چڵ و لقدا ئەکات.**
**لەپاش تۆزێ قومرییش ئەفڕێ.**
**هێشتا کاغەزم سپییە.**
**لەناکاوێ درەخت بەدەم (با)ی شینەوە**
**دەستی ڕاستی درێژ ئەکاو لەسەر شووشەی پەنجەرەکەم،**
**لەپێش مندا، ئەو شیعرەکەی خۆی ئەنووسێ.**
**لەکەیەوە دانیشتووم و هێشتا کاغەزم سپییە.**

ستۆکهۆڵم
1997

# شەوانە دیدار

لەدوای هەموو دیدارێکی من و بادە
لەکەناری خەوێکی پیرۆزەییدا ڕائەوەستم
کەشتیە سەرخۆشەکەی (ڕامبۆ) ئەگاتە لام
بەناو ڕووبارێکی مەستا ئەمبا:
سەرم ئەبێ بەپەڵە هەور.
شیعرم پڕ ئەبێ لەباران.
پەنجەکانم بەباڵندەو
لەشم ئەبێ بەدارستان!
لەدوای هەموو دیدارێکی من و بادە، بەرێی (با)دا
بەدوو قۆڵیی لەگەڵ تەنیاییدا ئەڕۆین.. ئەڕۆین
تائەگەینە پاردەکانی ئەو دیو ژیان
سەرێك ئەدەین لە (مردن)و
چەند پرسیارێ ئەکەین لەخواو
دوو نەهێنیی ئەدزین و
چەند خەمێك جێ ئەهێڵین و

**دیسانەوە ئەچینەوە سەر ڕێگەی (با).**
**لەدوای هەموودیدارێکی من و بادە**
**بۆ سبەینێ، لەناو ژوورێکی نەخۆشدا**
**بوتڵێکی کۆکەکۆك کەرو**
**پەرداخێکی بێ تاقەت و**
**هەندێ لە توێکڵە خەیاڵ و**
**قەسیدەیەکی ناتەواو بەجێدێڵم!**

ستۆکهۆڵم
1997

# هەمیشە پرسیار

دیسانەوە لێم ئەپرسیی:
هەموو ڕۆژێ تۆ بەم قاپووتە ڕەشەوە
ئەڵێی شەوێکی کەرکوکی و ڕاونراوی ئەچی بۆ کوێ؟!
ئەچم بۆ لای عەشقێ سپیی
کە لە تینوێتیی ئەوێدا ئێستە ئەڕوێ.
دیسانەوە لێم ئەپرسیی:
ئەی بەم مل پێچە زەردەوە کە هەر ئەڵێی
گوڵە بەڕۆژەی سەقزی، ئەچی بۆ کوێ؟!
ئەچم بۆ لای عەشقێکی سەوز
کە ئێستاکە لەوێ لەگەڵ ڕۆحما ئەدوێ.
دیسانەوە هەر ئەپرسیی:
ئەی بەم کراسە شینەوە
کە هەر ئەڵێی و گۆمی وانی، ئەچی بۆ کوێ؟!
ئەچم بۆ لای عەشقێکی سوور
کە ئێستاکە لەوێ خوێنمەو
جۆگە جۆگە وا گڕ ئەگرێ!

# وەریین

وەختێ ڕۆیشتی
تۆ شەوێکت پێچابۆوەو داتە دەستم
کە چوومەوە بۆ ژوورەکەم
شەوی پێچراوەم کردەوە
وەختێ بینیم:
هەر ئەستێرەی لەت و پەتەو
هەر ئاوێنەی وردوخاشی یادگارەو
ئەوەرێنە سەر جێگەکەم.

# له قاوەخانەیەكدا

ئێوارەیەكی تەماوی‌و قاوەخانەیەكی تەریك.
لەسەر مێزم، بنەمۆمێك ئەسوتێت و
كلآفەیەك شەوقی زەردباو ئەدا لە قژی شیعرێكی
تازەزاوی سەر كاغەزم.
سێبەری بەژنی قەڵەمم
درێژ بووە  وەك مەچەكم.
ئانیشكم لەسەر قەراغەو سەرم تۆپێكی ماندوەو
خستوومەتە ناو جۆلانەی دەستی چەپم.
كوپی قاوەی دەم بە هالآو هەڵئەگرم و
كەمێك خۆم بە پشتا ئەخەم،
چاو هەڵئەبڕم:
لەو دیو جامخانەی پاكەوە:
ئاوی (دانوب) لەسەرمادا هەڵئەلەرزێ‌و
تەمێك نیوەی پردی گەورەی داپۆشیوەو
وا خەریكە بنیشێتە سەر بوولێڵی نیوە تاریك.

لەوبەرەوە: ماسیگری شەپقە لەسەر
بەسەرپردا دانەویوەو دەستێکی لەناو هەوادا
ڕاکێشاوە بۆ پێشەوەو قولاپەکەی هەڵداوەتە
ناو ڕووبارو، بێ جووڵەیەو چۆن وەستاوە، بۆتە پەیکەر!.
لەم بەرەوە: ژنێکی شۆخ نوقم لەناو
فەرووی پاڵتۆی ئاودامانی پڵنگیدا
هەنگاوی خێرا هەڵدێنێ و بە دوایشیەوە
تووتەڵە سەگی سپی و خرپنی تووك لەسەرچاو
ڕێ ئەکات و، لە پڕێکدا، سەگ ئەوەستێ و
لاقی ڕاستی هەڵئەبڕێت و بە دارێکدا هەڵئەمیزێ
لە ئاسۆی ڕۆژهەلاتەوە: فڕۆکەیەك
لووتی کردۆتە ئاسمان و ناو بە ناوێ
چاوێکی سوور ئەتروکێنێ و پاردەی هەورەکان
کون ئەکاو، واخەریکە تازە بفڕێ.
کوپەکە دائەنێمەوە.
ئەچمەوە ناو گەمیەی شیعری ڕەنگاوڕەنگم
دوو وشەی تازە ئەکەم بە سەوڵی ناو (دانوب)و ئەوسا
لەقاوەخانەی تەریکدا
وەك توانەوەی بنەمۆمێ و
یادگارێکی تەماویی
ئەم جێگایە بە جێدێڵم!.

# نووسین

ئەو وەختەی بە لاسکی دارمێوێ بنووسم
هەتاکوو هەڵئەسم
سەبەتەی کاغەزم پڕبووە لە هێشوو!.
جارێکیان بەسەری بولبولێ من نووسیم
کە هەستام پەرداخی بەردەمم پڕبوو بوو لە جووکە.
ڕۆژێکیان بە باڵی پەپوولە من نووسیم
کە هەستام سەر مێزو ناو تاقی پەنجەرەم
پڕبوو بوون، لە گوڵە... وەنەوشە
ئەو کاتەی، بە پەلکی، گیای دەشتی
ئەنفال و هەڵەبجەیش بنووسم
کە هەستام ئەبینم
ژوورەکەم،ماڵەکەم، شارەکەم، ووڵاتم
هەر هەمووی پڕبووە
لە مەمکی ژنان و لە چاوی منداڵ و
لە قیژەو زریکە!

# جڤین

له جڤینی ئێوارەیەکی باخاندا
درەختێکیان کە قسەی کرد،
شانازیی زۆر کرد بەوەوە.
کە (کەمانچە) کوڕی ئەوە.
له جڤینی بەیانیانی چەند گۆمێکدا
کە گۆمێکیان کەوتە قسە
شانازی زۆر کرد بەوەوە
کە بەرزترین تاڤگە کچی ئەوە!.
له جڤینی لێڕەواری دۆڵێکیشدا
نیوەڕۆیەك، وەختێ قامیش کەوتە قسە
شانازیی زۆر کرد بەوەوە
کە شمشاڵیش نەوەی ئەوە.
له جڤینی زۆر نەهێنی چەند گردێکدا
کە وەختێ گڵ کەوتە قسە
شانازی زۆر کرد بەوەوە

کەجوانترین گۆزە ئاویش کچی ئەوە

لە جڤینی زۆر بە پەلەی

شاخە بەردینەشدا، شاخێ

کە نۆرەی پەیڤینی ئەو هات

شانازی زۆر کرد بەوەوە

کە مەڕمەڕیش کچی ئەوە.

لە جڤینی نائاسایی شەوێکیشدا

کە گوندەکانی کوردستان کۆبونەوە

وەختێ (خاك و خۆڵ) قسەی کرد..

شانازی زۆر کرد بەوەوە

کەوا (نالیی)ش کوڕی ئەوە!.

# چاوەکانت

بەڕێبواریی
بەلای شەوێکدا تێپەڕیم..
بانگی کردم و لە خۆیدا گلی دامەوەو
لە دواییدا بووم بە ئێشێکی فرەزەنی.
بەڕێبواریی
بەلای زێیەکدا تێپەڕیم
بانگی کردم و چوومە ناوی و
لە دواییدا
بووم بە تەمێکی دامەنی.
بە ڕێبواریی
بەلای کەژێکدا تێپەڕیم
بانگی کردم، پەلی گرتم و چوومە سەریو
لە دواییدا
بووم بە سێبەری دەوەنی
بە ڕێبوارییش
بەلای چاوی شینی تۆدا بوو تێپەڕیم
بەڵام ئیتر.. ئەوقی سیحری
خۆی کردم و، لەوساکەوە
لەناویام و بووم بە تەندوورەو گێژەنی!.

# سەردانەوە

شەوێك چاوێكی خۆم جێهێشت
لە تاریكیدا، بۆ مەلێك، نابینابوو.
ڕۆژێك دەستێكی خۆم جێهێشت، لە دوای شەڕێ
بۆ درەختێك كە دەستەكانی قرتابوو.
جارێك قاچێكی خۆم جێهێشت بۆ ڕێگایەك
دوای بۆردوومان، كە قاچەكانی نەمابوو.
سەردەمێ چوو. سەردەمێ هات..
مەل هاتەوە بۆ سەردانم و
باڵ و ئاسمانێكی شینی دامێ.
دار هاتەوە بۆ سەردانم و
ڕەگ و خۆشەویستی سەوزی دامێ.
ڕێ هاتەوە بۆ سەردانم و
كلیلی دەرگای دواڕۆژی سپیی دامێ!.

# ژوان

خەو دەر ئەكەمە دەرەوە بۆ بەر سەرما!
لاشیپانی دەرگاكەت بۆ ئەترازێنم
تا وەك سروە بەبێ خشپە
بێیتە ژووریْ!.
چەند سەعاتە.. فەنەرێكم و
لەسەر باڵی سیمفۆنیەك ئەفڕم.
بەتەماتم ئەزانم دێیت.
سەعات چۆن ئەڕوا با بڕوا..
وەختێ تەماشای یەك ئەكەین
كاممان سەیری سەعات ئەكەین؟!
كە پێك ئەگەین..
كاممان گوێ ئەگرین لە قسەی
ڕووناكیی یاخود تاریكیی؟!
چەند سەعاتە.. شەپۆلێكم و
لەسەر باڵی سیمفۆنیەك ئەفڕم
بەتەماتم ئەزانم دێیت!

# دەنگ

چەند کەرەتێ گوێم لە شریتەکەت ڕاگرت
لێم دایەوەو گێڕامەوەو لێم دایەوە.
ئێستە بیستنم پڕێتی: لە زرەی ڕەنگ.
گوێچکەکانم بوون بە ماسیی ئاوازو دەنگ.
وەختێ کتێب ئەکەمەوە
حەرف ئەبێ بە زەنگۆڵەو
وشە ئەبێ بە جۆلانەو
ڕستەیش ئەبێ بە پوورە هەنگ
چەند کەرەتێ گوێم لە شریتەکەت ڕاگرت
لێم دایەوەو گێڕامەوەو لێمدایەوە
ئێستە کەنتۆر ئەکەمەوە:
خانەکانی پڕبوون لە گۆرانیی سپیی.
چەکمەجەکان ئەکەمەوە پڕبون لە جریوەی ئاڵ و
لە قاسپە قاسپی نارنجیی.
شریتەکەت ئەوەندەم لێداوەتەوەو

ئەوەندەم لێداوەتەوە:

ئێستە دەنگت لە ژوورەکەمدا ڕواوە.

ئێستە دەنگت بووە بە بۆنی گوڵدان و

ئێستە دەنگت بووە بە بارانی تابلۆی دیوارەکەو

ئێستە دەنگت تێکەڵی ڕەنگی کراسمەو

ئێستە دەنگت لەگەڵ گەڵای بۆینباخدا ئەبەستم و

لەگەڵ قاوە تێکی ئەدەم ئەیخۆمەوەو

لەگەڵ ڕۆژنامەو گۆڤاردا ئەیخوێنمەوەو..

ئێستە دەنگت لە بازنەی دووکەڵی جگەرەمدایەو

ئێستە دەنگت بووە بە شەقامی پیاسەی ئێوارانم و

لەگەڵ دەستما ئەیخەمە ناو گیرفانمەوەو..

ئێستە دەنگت: تەماشامە!

# داگیرسان و کوژانەوە

ئەو دوو ڕووبارە دڵدارە..
هەتا نەگەیشتبوون بەیەك
هەموو ڕۆژێ هەزار شیعریان
بەهەورا ئەنارد بۆ یەکتر.
ئەم دوو باڵدارە دڵدارە
هەتا نەگەیشتبوون بەیەك
هەموو ڕۆژێ هەزار شیعریان
بە (با)دا ئەنارد بۆ یەکتر
کەچی وەختێ بەیەك گەیشتن
تۆ بڕوانە: دوو ئاوان هەر ناڵەیەتی و
هێلانە هەر زیقەیەتی و
ژووری شیعریشیان ساردو سڕ.
(گەر مەم و زین بە یەکتری بگەیشتنایە
لەو ساتەوە ئەکوژانەوە!.)

# ڕۆژانە

لە (میترۆ)دا منیش خەونێکی
درێژی، کوناودەرم
هەموو ڕۆژێ چەندین کەڕەت
نیشتمانم بە تونێلدا ڕائەکێشم و
چەندین کەڕەت.. سلێمانی سەر ئەخەم و
شاخی (گۆیژە) دائەگرم و
چەندین کەڕەت.. یادگارم پێوە ئەدەم،
ئەیکەمەوەو، چەندین کەڕەت
هێڵی وڕێنەم ئەگۆڕم!.
لە (میترۆ)دا منیش خەونێکی
درێژی، کوناودەرم
ڕابووردوم تەقە تەقێتی و
لە ئێستەیشدا، شپرزەییم
واگۆنێکەو ڕامئەژەنێ و
بۆ سبەینێش
دیسانەوە
تونێلێك و ڕێیەکم: ون!

# هاتوچۆ

له كلۆری دارێكەوه
سەرنجم نارده ژوورەوه.
وەختێ سەرنجم هاتەوه
ئەویش وەك دار پیر پیر بووبوو.
له شەبەقی زامێكەوه
سەرنجم نارده ژوورەوه.
وەختێ سەرنجم هاتەوه
دەنكه گێلاسی گرتبوو.
له كەلێنی هەورێكەوه
سەرنجم نارده ژوورەوه
وەختێ  تەماشام هاتەوه
ڕەهێڵەو ڕێژنەی پێ بوو.
له درزی سامالێكەوه
سەرنجم نارده ژوورەوه
وەختێ چاوانم هاتنەوه

هەزار پەپوولەی باڵ شینی
عەشقیان پێ بوو.
لە گونەبای خەونێکەوە
سەرنجم نارده ژوورەوە
وەختێ سەرنجم هاتەوە
سرووەی مۆرو
تەمی سەوزو
نامەیەکی تەڕی پێ بوو!

# ئەو ڕۆژەی نەچوومە دەرەوە

ئەمڕۆ نەچوومە دەرەوە
وتم: جەستەی خۆم بەند ئەکەم
ئەبمە قەفەز.
وتم: با ڕۆژێ ئەم سەرە بێ دووکەڵ بێ.
ئەمڕۆ نەچوومە دەرەوە
تا سیمای ئازار نەبینم.
یەك ڕۆژ کەڕبوونم هەڵبژارد
تا گوێم لە دەنگی شووم نەبێ
ئەمڕۆ نەچوومە دەرەوە.
پەنجەرەکانم پێوەداو پەردەکانم دادایەوە.
تێ ڤێ و ڕادیۆم کوژانەوە.
تەلەفۆنم بێدەنگ کردوو
جگەرەیەکم داگیرسان.
لە زەنگ درا. کە چووم دەرگاکەم کردەوە
نامەیەکیان دایە دەستم

نامە پڕی بوو لە قیژەی ژنە تۆراوەکەی خۆم و
نامە پڕی بوو لە ژان و
لە دەنگی شووم و لە دووکەڵ.
ئەمڕۆ نەچوومە دەرەوە!

# ئیرۆتیکا/ خلیسکان

به ڕووتی لەبەر ئاوێنەی
ژوورەکەدا ڕاوەستاوی.
پرچەکانت تەنها سایەن بۆ شان و مل.

پرچەکانت دوو پلووسکی ئاوی ڕەشن.
دوورگەیەکی بلورینەو شەپۆل ئەداتەوە لە شت.
چ بەهارێکی سپییەو
بریقە ئەدا لە چاوم.
چ ئاوێکی برۆنزییەو
لێم ئەپرژێ!.
(تاق)ی مەمك و (تاق)ی سمت و
پێچ خواردنەوەی کەوانەیی
لە کەمەرەوە بۆ ڕانی لووس و سفت.
خێرا.. خێرا پێچ بە چاوم ئەکەنەوەو
لە پڕێکدا..

لەسەر شوشەی پێستی بەر سك

ئەخلیسكێم و بۆ بژوێنیٚ شۆڕ ئەبمەوە.

لەناوەندا، گیای سیحراویی، دەوری زنە

هەردوو نیگام شێت ئەكەن و

پەنجەكانم یاخی ئەبن و

لە مەچەكم جویٚ ئەبنەوە

......

.......

ئێستا ڕووبە ڕوو ئاوێنەین

بۆ یەكتری!.

# ئیرۆتیکا/ گۆم

تۆ بەم کراسە شیفۆنە شینکارەوە
ڕاکشاوی و ئێستە چرپا بووە بە گۆم.
لە لێوارتا دانیشتووم و نیوەڕووتم
وەك یەکەم جار بێ بتبینم. سەیرت ئەکەم:
سەرین تەڕەو قژت وشك نەبۆتەوە.
نەرمە تیشکێ
بەپێ دزکێ
دێتە ژوورێ.
گۆم نیوەی زیاتری ئەبێ بە زیو.
گوارەکان ئەدرەوشێنەوە.
قاچێکت کردۆتە هەرەم.
جووتە کەوی سپیش هەردوو
لە سێبەردان.
پەڵە مێرگی ئاونگ گرتووی: خوار ناوکیش
پڕ هەتاوە

له لێوارتا دانیشتووم و، نیوەڕووتم
له منیشدا، بڵێسەی لەش داگیرساوە!.
ئێستە تەواو تەواو ڕووتم
وا خەریکم وەرگەڕێم و...
بچمه ئەم سیحرە شینەوە
نایەمه دەر، هەتا چزەی کوژانەوە
له شیشی داخی ناو لەشم هەڵنەسێنێ
ئەم گۆماوە!.

# ئیرۆتیکا/ حەمام

لەو دیو دیواری شووشەوە

لەبەر پرژەی بە خوڕڕەمی دووشەکەدای.

سێبەرەکەت گەورەترە لە لەشی خۆت.

سێبەرەکەت ئاوی لێ ئەچۆڕێتەوە.

سێبەرکەت کەف گرتوێتی.

بە دەنگی بەرز بانگم ئەکەی

دەنگت تەڕە.

هەڵمێ لە سێبەر هەڵئەسێ.

لەودیو شووشەی گرنجەوە

لەشت ڕێ ڕێ

لەشت لێڵە.

من لێرەوە وا هەست ئەکەم ئاوێنەم و تەم ئەمگرێ

لەبەر پرژەی بەخوڕڕەمی دوشەکەدای

سێبەرەکەت دائەنەوێ

ئاو بێدەنگ بوو.

ئێستە سێبەر ڕائەکات و

تۆیش بەڕۆبێکی سوورەوە دێیتە دەرێ

تۆ هێشتا لەناو کەفدا بووی

من چووبومە ناو لۆکەوەو

لەجێگادا چاوەڕێت بووم!.

1997/7/7

# شەختەی قوتبی

**با شەوت بەتەمای جریوەی کوژراوی**

**سەری من قەت نەبیّ!**

**با زەریات بەتەمای ئەم ماسیە خنکاوەی**

**لەشی من قەت نەبیّ!.**

**با دەنگت بەتەمای شەقژنی سووتاوی**

**گەرووی من قەت نەبیّ!**

**با باڵات بەتەمای لاولاوی گرمۆڵەی**

**سەر عەردی من نەبێت!**

**با قژت بەتەمای ئەم گەڵاّ مردووەی**

**پەنجەی من قەت نەبێت!**

**من.. ئێستە**

**من.. لێرە بوومەتە چیرۆکی**

**ڕۆژانەی نامۆیی و هەڵ وەرین!**

**من لێرە بوومەتە**

**پارچەیەك لە شەختەی قوتبی شین!**

1997/7/7

# شیعری کاولستان

وشەمان چاند بۆ ئەوەی لەم:

دەشتانەدا دوارۆژ بڕوێ:

وشەمان ئاوێتەی (با) کرد

بۆ ئەوەی لەم ئاسمانەدا

ڕاستیی بفڕێ!.

شیعرمان کرد بە زەنگی بەرد

بۆئەوەی لەم شاخانەدا

مێژوویەکی نوێ ڕاپەڕێ!.

بەڵام مەخابن

مەخابن!

دەشتەکانمان وەك پەڕە کاغەز سووتان و

ئاسمانمان کرد بە قەفەزو

شاخەکانمان تیرۆر کردوو

وا ئێستاکە شیعریش بووە بە خەڵووزی کاولستان!

نیسانی
1996

# نیوەڕۆی شەوان

(با) نیت و هەڵئەکەیت..
پێکەوە خەیاڵ و کاغەزی سەر مێزم ئەفڕێنی.
باران نی و ئەباریو پێکەوە
باڵندەی ئەم سەرە غەوارەو
چاوانی قەڵەمم تەڕ ئەکەی.
لە کوێ بی لە لامی.
غەیبیت و ئامادەیت.
شوێنیت و ئەجوڵێیت:
سەر ئەکەی، خوار ئەکەی، ڕائەکەی.
شارێکی ئەفڕیت و شەقامی هەڵئەستی و
گەڕەکی و کۆڵانی و درەختی و لە شەقەی باڵ ئەدەیت.
زەمانیت ئەوەستی و لە پڕیش
دێیتەوەو لائەدەیت.
مێژوویەك هەر شەو بوو:
قوبە بوو بۆ خەون و جەنگەڵی بینین و

ئاونگی کازیوەی سەرینم.
ئەمێستا بە ڕۆژیش شەوێکم: داگیرساو.
نیوەڕۆی تاریکم و خەونێکم
بەپێوە وەستاوم و ئەتبینم!

# زریکەی ژن

**بەفر لە خۆڕاو هەر بۆ خۆ سپیی نییە!.**
**ئەوە فرمێسکی تەنیایی یەزدانێکە**
**لەتاو نامۆیی ئەیبەستێ.**
**ڕووبار لە خۆڕاو هەر بۆخۆ هاژە ناکا!**
**ئەوە گریانی عەشقێکە سەفەر ئەکاو**
**دوور دوور ئەڕواو سەرچاوەی یار بەجێدێڵێ.**
**(با)یش لە خۆڕاو هەر بەبێ هۆ نازریکێنێ**
**ئەوە ژنێکی ترساوی قژ ژاکاوی ڕۆژهەڵاتە**
**پیاوێ لە شێوەی چەقۆدا**
**دوای کەوتووەو**
**ڕاوی ئەنێ!.**

# یاقوت و پیرۆزە

گیانی (یاقوت) وەختێ سوور بوو
کە پرژە خوێنی کچێکی سەربڕڕاوی دڵداری دیی.
گیانی (پیرۆزە)یش ئەو وەختە شین هەڵگەڕا
کە شیوەنی مانگێکی بۆ، گۆمێ بیست و
کە شیعرێکی کاکۆڵ شینی خنکاوی دیی.

## خەڵوەتێك

چاوم لە چاوی خوا ئەبڕم
هەتا ئەبم بە دڵۆپێ لە بارانی و
ئەكەومە سەر پەڕەی سپیی.
پەڕەی سپیش لە شیعرێكدا
تۆوم ئەكاو، ئەمكا بە مێرگی گریانی!

# دیالۆگ

ئەمڕۆ تووڕەیت.. ئێجگار تووڕە!
ڕەشەبایەك هاتۆتە ناو دەروونمەوە.
ئەم بەیانییە هێوری... زۆر هێوری!
مانگە شەوێ هاتۆتە ناو چاوانمەوە.
ئەم بەیانییەیش غەمگینی.. زۆر غەمگینی
ئەوە ئەمشەو كوردستانم لە خەودا دیو
تەنیاییم ئەلاواندەوە!

## زەریـــــا

زەریا لەبەر گەورەیی دڵی خۆیەتی
تفی پیسی کەفە ژیلکەو.. پەڵەی نەوت و
ڕشانەوەی چەند بەندەری ناو زەلکاوو
بۆڵە بۆڵی نیوە شەوی
کەشتیوانە بەدکارەکان، قبوڵ ئەکا!.

# سەردەمی من

لەسەردەمی زاوو زێی بەردو شەهیدا

بووم بە شاعیر، بۆیە دیوانم پڕێتی:

لەنەوەی ئەشکەوت و گەوەو، لە گوڵە هێرۆی

یاقوت و لە شەپۆلی سووری ئاگر!.

# خەونێك

**ئەو خەونە كورت بوو، ئێجگار كورت**
**هەر لە خەونی پەلکە گیایەکی بەهار و**
**هەر لە خەیاڵی دڵۆپێ شەونمی بەر خۆرەتاوی**
**گەرمە سێرو، لە پێكەنینی پەپوولەو**
**لە ماچی نێوان شیعرێك و خۆزگەم ئەچوو**
**ئۆه! گیانی من!**
**بەڵام ئێمە لەو خەونی پەلکە گیایەدا**
**دارستان بووین.**
**لەو دڵۆپە شەونمەیشدا**
**دەریاچەکەی زرێبار بووین.**

# خۆشەویست

**خۆشەویستیت، سەعاتێکی**
**لەشەوو رۆژ زیاد کردووە**
**سەعاتی بیست و پێنجەمین.**
**خۆشەویستیت، ڕۆژێکی دیکەی لەهەفتە زیاد کردووە**
**ڕۆژی هەشتەم.**
**خۆشەویستیت، مانگێکی دیکەی لەساڵدا زیاد کردووە**
**مانگی سیانزە.**
**خۆشەویستیت،  وەرزێکی دیکەی لەوەرزان زیاد کردووە**
**وەرزی پێنجەم.**
**بەم جۆرە خۆشەویستی تۆ**
**ژیانێکی پێ بەخشیووم**
**کە سەعاتێك و ڕۆژێك و**
**مانگێك و وەرزێکی**
**لەگشت دڵداران زیاترە!**

لەندەن
1997

# کەزیــی

**بەیانییەك بوو**

**بەهویَ منەوە**

**گولَ شیعری ناسیی.**

**ئەگەر من نەبام، ئەو هەر نووستبوو**

**من هەلْمسان و من بووم کە بردم بۆ شاری خەون و**

**من بووم کە مالَی شیعرم نیشاندا.**

**ئەگینا کوا گولَ ڕێی مانگەشەوو**

**شەقامی هەورو کوچەی بارانی.. قەت پیَ ئەزانی!**

**من لەبەینا بووم کە تەوقەیان کرد**

**من لەبەینا بووم**

**کە گولَ شوشەیەك هەناسەی دایەو**

**شیعریش پڕ بەمشت وردە گۆرانیی.**

**کەچی ڕۆژێکیان لەخۆرنشیندا بۆ ساتەوەختیَ**

**ئەو کچە سەری لەناو پەنجەرەی**

**نهۆمی شیعرو وشەم دەرهانی**

**گولَ ئیتر شێت بوو کە ئەوی بینی**

**گولَ ئیتر پشتی لەمن هەلْکردوو**

**خۆی بەکەزیەکەی ئەودا هەلْواسی!**

کۆپنهاگن
1997

# درێــژ

تەنها پێنج دەقیقەی ترەو بەڕێم ئەکەی
بەیەکەوە ڕاوەستاوین، بێدەنگیمان
درێژ ئەدوێ.
هەموو شتێ درێژ.. درێژ
تۆ خۆت درێژتری لەمن
سێبەری هەردووکمان درێژ
پرچت.. درێژ.
کراسی مۆری ئاودامان.. ئەویش درێژ.
شۆڕابەی گوارەکان.. درێژ.
نینۆکی زەرکەفتیی درێژ.
واگۆنی ڕیز بەستوو.. درێژ.
شۆستەی قەراغ.. درێژ.. درێژ.
دلۆپە فرمێسکیش.. درێژ.
شەو درێژو
هێڵ درێژو

**ئاوارەیی من درێژو،**
**ئیستە دوو دەقیقەی ئەوێ**
**بۆ سەعات هەشتی دابڕان**
**وەرە با ئاوێزانت بم**
**بۆ ماچێکی دوورو درێژ!**

ئیمستردام
1997

# شەماڵێکی شەل

لەدوای یەکەم دەستی ئاسمان
هەر دەستێکی تر گەیشتە لەشی بەفر
بەفر ئەشێوێو نابێتەوە بەبەفرەکەی یەکەمین جار.
لەدوای یەکەم هەڵقوڵینی دەمی کانیی
کە ئاو بە ڕێگەی تردا تێ پەڕی و
بوو بە ڕووبار
ئاو ئەشێوێ و نابێتەوە بە ئاوەکەی یەکەمین جار.
دوای یەکەم بۆن و هەڵمژین
ڕۆحی گوڵیش ئەداتە کزیو بنسکی و
نابێتەوە بە گوڵەکەی یەکەمین جار.
بەم جۆرە من ویستم ماچێ
لە ڕێگەی ئەم هەڵبەستەوە
بنێرم بۆ، دوورەزمانێ... بەرەو خوار
کە شیعرەکەیان وەرگێڕاو
وەکوو کراس بە ئاوەژوو لەبەر کرا
ماچەکەی منیش شێوێنرا..
ئێستە ماچم بەرەو ئەوێ بەڕێوەیە
بەلاّم ماچێ بەداخەوە چاوم لێیە
لە شەماڵێکی شەل ئەچێ!

# تەیــر

لەئاسمانی بلووزە شینەکەی بەرتا
ئەوە سی رۆژە ئەیبینم:
تەیرێکی ئاڵتونیی ئەفڕێ
ئەفڕێو کەچی ناگاتە سەر گردە بەفری جووتە مەمێ
ئەڵێی لە (با)دا چەقیوە
ڕۆژێ من ئەم تەیرە ئەگرم
لە بلووزی ئەکەمەوەو لەجیاتی ئەو
تەیری پەنجەم ئەخەمە ڕێ.
تۆ بزانە چۆن لەترووکەی چاوێکدا
تەیرەکەی من ئەگاتە جێ!

ستۆکهۆڵم
1997

# ڕۆحێکی نسرم

گەر (ڕوخسارت) لێرە بوایە
ڕەنگ بوو نامۆیی ئەوەندە
ئافرەتێکی گرژومۆن و قژ ژاکاوو
ڕەنگ خۆڵەمێشیی نەبوایەو
لەوانەبوو بەیانییەك
دەم و چاوی سامالێکی تێکەوتایە.
ئەگەر (دەنگت) لێرە بوایە
ڕەنگ بوو تەنیایی ئەوەندە
عاشقێکی لاتەریك و ڕۆژنامەیەکی بێدەنگی
سوچی ئەم قاوەخانەیەو
جگەرەکانی لالێوی ڕۆمانێك و
هەوایەکی کپ نەبوایەو
لەوانەبوو.. نیوەڕۆیەك
لەرەو سەمای سترانێکی تێکەوتایە.
ئەگەر (لەشت) لێرە بوایە

ڕەنگ بوو جەستەم وەکوو ئێستە
بەفری ئەم قوتبە نەبوایە
یاخود نسێی چرپای ناو ئەم ژورەو
بەندەرێکی ساردوسڕی چۆڵ نەبوایەو
لەوانەبوو ئەگەر تۆ لێرە بویتایە
لە شەوێکدا بەر پڕیشکی
بەردە ئەستێی مەمکەکانت بکەوتایەو
کڵپەیەکی بکردایە
ئەگەر تۆ لێرە بویتایە!.

# کەمانچەو شەو

عەشق خۆی کرد بە کەمانچە
تەنیایی هات هەڵیگرت و
شەو درەنگان نای بەژێرچەنەی خۆیەوە.
ئەوسا ئیتر هێندەی لێداو هێندەی لێدا
هەتاکوو شەو ژانی گرت و
کازیوەی بوو.
هێندەی لێداو هێندەی لێدا
هەتاکوو ژێ دڵۆپ دڵۆپ
ئاوی شیعری ڕەنگاو ڕەنگ و
ئاوی خەونی ڕوونی دەردا!.

# لەم مەیدانە زیوینەدا

**ئەمرِۆ لەم جەژنی ئاوو پرشنگ و کچانەدا**
**لەم  زەماوەندی کتێب و  هەڵپەرِینی وشانەدا**
**ئەمرِۆ لێرە، لەم مەیدانە زیوینەدا، خەیاڵێکم**
**لەرِێی دووچاوی رِەشەوە، چاوی ژنە تونسییەك**
**گەرِایەوە بۆ لای شارە چا و رِەشەکەم.**
**ئەمرِۆ لێرە، لەم مەیدانە زیوینەدا، لەرِێی گمەی**
**کۆترەکانی سەر شانۆوە، پۆلێ یادم، گەرِانەوە**
**بۆ کونە شاخی (بەرگەڵو) لەرِێی دەنگی خەتیبێکی**
**چوارشانەوە، هاوارێکم گەرِایەوە بۆ ناو گەرووی**
**(کامەران موکری) عاشق. هەر ئەمرِۆیش لەرِێی**
**رادیۆکەی ناو دەستمەوە-غەزای تورکە- زانیم**
**من خۆم، ناگەرِێمەوە ولاٌتێ: کە شاروشیعرو کۆترو**
**(کامەران)ی هەموو رِۆژێ تیا ئەکوژرێ!.**

ستۆکهۆڵم
1997

# دووکەڵ و بوخار

بەسەرێك ئاگرم و
بەسەرێك باوباران
ئەو وەختەی ئەمسەرم هەڵبکاو.. بباریٚ
ئەو سەرم ئەبێتە ڕەوەزی دووکەڵ و
وەختێکیش ئەمسەرم هەلگیرسا
ئەو سەرم ئەبێتە
بوخاری دوورگەی ژان!.

سلێمانی
1998/12/31

# دوو هەزار وشە
# بۆ ساڵی دوو هەزار

ئەمە قسەی ئاوە، پێكەنینی ئاوە، گریانی ئاوە
لەڕێ ڕەوی: دوو هەزار رووبارە سیمای زەماندا.
قسەی بەردەو هاواری بەردە
لە یەكەمین ساتەوەختی هەناسەكانی زەمیندا.
سوڕانەوەی ژانە بەدەوری ژیانداو
قسەی (با)یەو سترانی (با)یەو ڕەنگی لێ ئەپژێو
دەنگی خاكەو ڤیژەی سروشتە وەختێ مرۆڤ
لە دایك ئەبێت و وەختێ ئەمرێ!
ئەمە گێڕانەوەی دیرۆكەكانی سەرنجە.. سەرنج كاتێ
ئەبێ بە دۆزەخ و بەهەشت، ئەبێ بە پەپوولەو باران
بە مەوداكانی پرسیارو بە تۆفان و.. وەختێ بینین
ئەبێ بە پۆلە باڵندەی وشەو ئیتر ئەدا لەشەقەی باڵ.
گێڕانەوەی دوو هەزار ڕووناكیی. دووهەزار تاریكیی.
دوو هەزار كازیوەو دووهەزار ئێوارەو گێڕانەوەی

خەونەکانی هەورەو سامانڵ!.

ئەمە ڕۆژژمێری چاوە لە دوو هەزار گۆشەی نیگاوە

لە دووهەزار پەڕەی دووکەڵ و شووشەی چراوە:

ساڵێ فرمێسك ئەیشواتەوەو ساڵێ عەشق ئەیخواتەوەو

ساڵێکی دی لەناو تاریکیدا ئەڕوێ و ساڵێکی تر خۆڵەمێشەو

بیرچوونەوە دایئەپۆشێ.

ئەمە زاری تەلیسماویی منە

زریکەمە وەختێ وەك سەهۆڵ ئەیبەستێ و

ئەمە دەورانی سەهۆڵبەندانەو.. دەورانی تەم

لە داوێنی بەفریینی ئاسیای پچوکەوە نوورێکی سوور

کەوتە ناو لانکەی بەردیین و باوەشی چیاوە.

زمان تەقیەوەو، زەردەشت بە ئاگر"گاتا"ی نووسییەوەو

"مەزدە" پرشنگی ڕۆحی بەخشییەوەو

"ئەهریمەن" گڤەی برین و ئازار.

"میدییەکان" باڵی بەرینی هێزبوون، لە هەڵکشاندا

ڕووەو لوتکەکان. سیما: داستان بوو، ڕوانین بڵێسەو

بڕوا ئاگردان. چاوی میدییەکان چاوی پشکۆبوون

باوەشیان ئەکرد بە ڕۆژهەڵاتداو لە سیلەی هەموو ساڵێکی نوێدا

باڵای شەوێکیان گڕ تێبەرئەداو، ئەبوون بە ئەسپی تیژی باوبۆران.

وەرزیان ئەئاژوو.

یەزدان ئاسمان و جریوەی دوور بوو.

باران ترس بوو.. ترسێکی تەڕبوو.

بەفر ترس بوو.. ترسێکی سپیی.
ڕوانین گەڵابوو وەختێ شین ئەبوو.
ڕوانین درەخت بوو وەختێ ئەوەری.
هەموو ساڵێ ڕوخساری من ئەبوو بە پرسێکی تازە
ڕووم ڕووی کەڵەکێوییەکان و
چاوم ئاوێنەی گۆماوو
زارم ئەشکەوتی ساڵان بوو.
لە دوندەوە ئاگرەکان تلۆربوونەوەو ئاتشگەکان ساردبوونەوە
"موغ" هەڵات و دەم و چاوم کوژایەوە. ئاسمان بەسەر مندا ڕوخاو
بووم بەژێر تەمی ساڵەوەو خواوەندەکانی خۆم ونکردا!.
زەوی هەر ئەسووڕێتەوەو
شەوم درێژ ئەبێتەوەو
دەنگم ناگاتە هیچ خوایەك.. تەماشام چقڵ دەرئەکات.
سەرنجم بووە بە ڕێگای شمشێری نوێی لەلەوە هێرش بردوو:
بۆ سەر جەستەی وشەکانم، بۆ سەر پاشماوەی دواخۆزگەی ئاتەشگەدەم
بیابان ئاخم قووت ئەداو
بیابان خۆڵی هێناوە، لەگەڵ پەیامێکی نوێدا
لەناو بەهەشتێکی نوێدا، لە ناو دۆزخێکی نوێدا
بۆ ڕێگاکانی هەناسەم.
ساڵ شمشێر بوو بۆ سەر پەڕاندنی دەنگم
ساڵ ئاگربو بۆ سووتان و هەڵقرچانی بەفری جەستەم
ساڵ هەر سیمای خەلیفە بوو لەناو زریانی غەزەبدا

سالْ سێ سەدوو شەست و هێند دەمە چەقۆبوو
لەناو دڵە بچکۆلەکەی مندا.
ژان منەو، بووە بە ڕۆژگارو شەوگار
کارەسات منەو، بووە بە سەعات.. مەرگیش منەو
بووە بە مەرگی رۆژهەڵات.
ڕوخساری من خەریتەیە لە بەردەمی شیرەکاندا
لە بەردەمی رمەکاندا. لە بەردەمی مەنجەنیق و لە ژێر سمی بەڵاکاندا.
سالْ ئۆردوەو دێتە سەرم
سالْ دووکەڵکێشی مێژوومە
سالْ حەریقەو تێم بەرئەبێ.
سالْ شەختە بەندانی ڕەنگەو تەمەنیشم تابلۆی ئەوە.
سالْ سەرچاوەی نامۆییەو
ئەم لەشەیشم ڕووبارێکی درێژی ئەو.
بەمجۆرە ڕووەکی سالْ، زاووزێی بە ترسی منەوە ئەکرد!.
بەمجۆرە ڕووەکی سالْ، دارستانەکانی سالْ، شاخەکانی سالْ
ڕێ و بانەکانی سالْ، بۆنی تیژی نوشوستی منیان گرت.
من هەبووم و نەبووم. بە درێژایی دووکەڵ و بەقوڵایی نائومێدیەو
بە پانایی قریشکەو هاوار، سەدەکانم لەکۆڵ کردوو برینەکانم کرد
بە کاڵاو ملی ڕێی نەهاتم گرت. بەمجۆرە مردنی خۆم ئەژمارد.
من هەبووم و نەبووم و روخساریشم نە هەورێ بوو ببارێت و
نە هەورێ بوو لابچێت و لە نێوانی کوژانەوەو داگیرساندا
من خوێنێکی لەبەر ڕۆیشتوی تەنی خۆم بووم. لەبەر دەرگای سەدەکاندا

ئەبووم بە قوربانیی پرسیار. لەبەر دەرکی سەدەکاندا، من شەوێکی پیرەمێردی کۆماوە بووم، نە خۆر دەرگای لێکردمەوەو نە بارانێ سەوزی کردم و نە بووم بە مەوسمێکی دیار.

دەم و چاوی سەدەکانم، ئەشکەنجە، وێنەکێشیان بوو

بۆیە وەختێ وردبیتەوە گوڵ ئەبینی

بە ڕەنگ و بۆی کوژراوەوە سەما ئەکاو

وشەیش ئەبینی بە جلی خوێنینەوە شایی ئەکاو

ساڵ ئەبینی وەرزەکانی وەك چوار گۆرانیی بریندار

بە دوای خۆیدا بە کێش ئەکا!.

من ڕوخسارم لەمسەرەوە هەتا ئەوسەر

کاروانێکە لە ئەستێرەی چوکڵە شکاو.

کاروانێکە لە ئاوێنەی درز بردوو.

ڕێچکەی زامانی وروژاو:

سیمای ناو گێژاوی منن لەمپەڕەوە هەتا ئەوپەڕ.

"سوڵتان" و"خان" سەری منیان بۆخۆیان برد

کردیان بە کورسی و هەورەبان.

ساڵ تونێلی لەشی کوناودەری خۆمە

ئەم سەری ساڵ لاشەی وەرزم ئەداتە دەست ئەوسەری ساڵ.

خان و سوڵتان... چاویان دزیم. دەنگیان دزیم. ڕەنگیان دزیم بۆنیان دزیم.. یادگار و خەویان دزیم.. خان و سوڵتان.

سێدارەیە زەمانی من. مێخ کێشانەو خاکەسارەو کۆتەڵێکی زیندووانە هەبوونی من!.

**ڕۆژ هاژەی کرد لەناو خەمماو.. ڕووناکیی برد.**
**شەو هاژەی کرد لەناو چاوماو.. دڵنیایی و ئارامی برد.**
**من روخسارێکی شپرزەی سیاساڵی ئەم ژیانەم**
**من گریان و من پێکەنینی قوربانی بەر ئاوێنەم.**
**لەهەر کوێ سیمام لابدات.. درەختێکی ئازار ئەڕوێ.**
**لەهەر کوێ دەنگم لابدات.. کڵپەی جەهەننەمێ ئەدوێ.**
**لەهەر کوێ رەنگم بپژێ.. باڵندەی مەرگ پەیدائەبێ.**
**سەدەیەك و دووسەدەو سیان، شەوم لە خوێنما داگیرسان.**
**سەدەیەك و دوو سەدەو چوار.. من عەشقێکی لەت و پەتو**
**من دوو کەلێکی پەرت پەرت و من تەونێکی هەزار ساڵەی**
**گینگڵ و ژان**
**وەختێ سەرت ئەکەیتەوە.. پڕە لە مەرگی نێو داستان.**
**وەختێ دڵت ئەکەیتەوە.. پڕە لە گوڵزاری مردووی لەشی ماڵان.**
**وەختێ ڕۆحت ئەخەیتە سەر لەپی دەستت و بەرەو بەرزایی**
**هەڵئەفڕی، ئەبی بە ئاوێنەی ئاسۆو شانۆی ئاسمان. ڕائەپەڕی**
**جارێك و دووان و سیان و چوار. ڕائەپەڕی ساڵێك و دەو**
**بیست و سەدو ڕائەپەڕی و لە مردندا باوەش ئەکەیت بە ژیانداو**
**لە دۆزەخدا گوڵی بەفر ئەچنیت و ئەبی بەجریوەی بەیان.**
**داناسەکنێی وەکوو گیانی بوومەلەرزە و دڵی گەرداو**
**داناسەکنێی تۆی قوربانیی ئەبی بە گڕی چراوگێ**
**وەختێ ئیتر کە بۆ دواجار لەناو چنگی ڕەشەبادا**
**چرا ئەمرێ!**

**تۆ هەزار وێنەی مردنی لە ڕۆژژمێری ساڵاندا**
**هەر وێنەیەك: ڕەنگێ بووە بەتابووتی و**
**ڕەنگێ بووە بە گۆڕیچەی.**
**تۆ هەزار هەزار وێنەی قوربانیت**
**تۆ هەزار هەزار تەماشای چاوی شەوو چاوی رۆژی**
**وێنەی تارمایی ئەوینی مێژووی ئاوو مێژووی گڵی**
**وێنەی ئاخی لە وەختی باڵە فڕێدا.. وێنەی هەناسەی ئاوارەی.**
**وێنەی دەنگی، وێنەی بۆنی، وێنەی زرنگەی ئازاریو**
**وێنەی شەوقی نائومێدی و وێنەی خولیای بێ پەنایت و**
**وێنەی هەموو شتێکی بێ وێنەی!.**
**لە تاقە یەك تەماشاتا.. چەندین ئاسمان ئەکرێنەوە.**
**لە تاقە یەك نیگای تۆدا.. چەندین عەشق ئەتوێنەوە.**
**لە تاقە یەك گۆشەی چاوتا.. چەندین پرشنگی سێ گۆشەو**
**چەندین پەنجەرەی چوار گۆشەو چەندین حەزی بازنەیی**
**تێکەڵ ئەبن و لوول ئەخۆن و بەسەر یەكدا ئەشكێنەوە.**
**تۆ بڕوانە من دەم و چاوی ڕیز بەستووی**
**دووهەزار ساڵی وێرانەم:**
**تۆ بڕوانە من دەم و چاوی ڕیز بەستووی**
**دووهەزار ساڵی کاولاشم**
**پڕم لە زایەڵەی کۆچ و پڕم لە ئاوازی ڕەش و**
**پڕم لە هاواری سوورو پڕم لەهەوری نەزۆك و**
**پڕم لە خەونی خۆڵەمێش.**

وردبەرەوە! من دەم و چاوی ڕیز بەستووی
دوو هەزار ساڵی وڵاتی بێوەژنم
پڕم لە پاییزی وشەو پڕم لە گیانەڵای باران و
پڕم لە ڕەنگی کوژراوو پڕم لە خەمی پیرەڵۆك
من قوربانیی بەردەم هەموو سەدەکانم
هەتاوی دیل، ئاوی خنکاوو، قەڵای ڕوخاوی ئاوێنەو
شەقامەکانی قەنارەو، کتێبەکانی زیندان و
سترانی لەت و پەت کراو.. من بووم من من.
من قوربانیی پەنجەکانی دەستی خۆیشمم
ڕووبار بووم و.. سەرچاوەی ڕووبار.. خۆم کوشتم
تۆ بڕوانە وردوخاش بوونی ئاوێنەو.. خۆکوژیم و.. هەردەستی خۆم.
من مەرگم نیشانەی گەوجێتی ژیانم بوو. نیشانەی بزربوونی سەری.
خۆم و دەنگی خۆم بوو. دووهەزارجار هەمان گێژەن قووتی دام و
دووهەزارجار هەمان ئاگر سوتاندمی و دووهەزار جار هەرهەمان کۆچ
ساڵانی تیا وەراندم و بەڵام سەرم نەدۆزییەوە بەڵام دەنگم
نەدۆزییەوەو کەچی چوومەوە ناو هەمان ئاگرو چوومەوە سەر هەمان ڕێو بان.
من ون بوونم لەخۆمدایە.
ساڵ ئەسپێکە غار ئەکات و من وەستاوم
ساڵ ئەچێتە دوا ڕۆژەوەو من ڕابوردوی چاو بەستراوم.
من بەتەنها ئاوابوونم. من ون بوونم لە خۆمدایە.
"مەلەك تاوس" یەکەم باڵندەی پیرۆزی ناو ڕۆحم بوو
کە بە دەنووك تیشك تۆو کاو لە باران و تەم و مژدا بە شوێن هەتاودا بگەڕێ و

ڕووبکاته نێو ئاپوورەی"فەقیران" و ئەوان بکا بە هەوارو پشت و پەنا. یەکەم پەنجەرەی ناو سەرم هۆنراوەبوو. پەنجەرە چوارگۆشەکانی بابا تاهیر بوون بە یەکەم تاقی ماڵی نیشتەجێ بووی وشەکانم. لە"چاڵدێران"دا هەناسەم وەکوو جەستەم وەکوو دەنگم دابەشکرا. لەو دەمەوە تێکەڵ بە شەوی ون بوونی ڕەنگی خۆم بووم، من ڕەژوو بووم خرامە ناو کوورەکانی وەزەنەوە.. لەو دەمەوە هەتا ئێستا گەر لەسەر ڕا بۆمبڕوانی: من دەم و چاوی سووتاوی دەشت و دەرم، لەخوارەوە بۆمبڕوانی: لەسەرەوە من تووناوتوونی دووکەڵم. لە ڕاستەوە بۆمبڕوانی: من لایەکی دەم و چاوی هەڵقرچاوی وەرزەکانم و لەچەپەوە من لاکەی تری ڕوخساری سەدەی خوێن  و سەدەی شەڕم.

شەڕ.. شەڕ.. شەڕ.. من هەر ئەسپی ناو شەڕگەبووم
نە کەللەم و نە حیلەم و نە چوارپەلم هی خۆم نەبوو
من هەر ئەسپی ناوشەڕگەبووم.. شەڕ شەڕ شەڕ
شەڕی ناو دەروونی خۆم و شەڕی دەست و سەری خۆم و
شەڕی بێ کۆتایی نێوان لوتکەکانی چیای جەستەم.
زریکەی ژن و ساڵانم ئاوێتە بوون.
کڕووزانەوەی منداڵ و گژوگیای خاك ئاوێتەبوون.
ژن فرمێسکی مێژووی منە. منداڵ گریانی گەنم و جۆو کانیی منە.
ژن ئاسکێکی زامدارەو لە بەرکاوی حیکایەتی ساڵەکانما ئەبارێنێ و
ژن  ڕووخساری دوو هەزار ساڵی سەرسامیی و بێدەنگیمە و
منداڵ سترانی ناو تەم و پەپوولەی قوڕگی ئاگرو
زەردەخەنەی بێشکەیەکی سەر هەڵدێری کێوەکانی ژانی منە!.

له ساڵێكدا گەر یەك گوڵم لەناو چاوما پێ بكەنێ و
له ساڵێكدا گەر یەك وشەم له كتێبما پێ بكەنێ و
له ساڵێكدا گەریەك ڕۆژم له نەورۆزدا سەما بكاو هەڵبپەڕێ.
من درێژەی یەك هاوارم له ئەشكەوتەوە بۆ شەقام.
من ڕەنگدانەوەی یەك ترسم له هەڵهاتنی خۆرەوە تا خۆرئاوا.
لەناو ساڵانی ئاگردا دارستان بووم. لەناو ساڵانی زریاندا
دووریپیانی باوبۆران بووم. له ساڵانی برسێتیدا من پاییزی دەردەدارو
له ساڵانی بەستەڵەكا من ڕەقبوونەوەی هەتاوو هیواكان بووم.
له چوخمی تاریكی هۆشما ناو بەناوێ مۆمێك ئەهات دائەگیرساو
لەپڕیشدا (با)یەك ئەهات ئەبوو بە شاڵاوی ڕق و شەوقی ئەناشت
شەڕی نێوان (با) و ڕووناكیی،
داگیرسان و كوژانەوە،
لەناو سەرما كوێره سەرچاوەی خامۆشیان هەڵتەكان و تەقانەوە.
لەناو سەرما پرسیار كەوتە وروژان و
له جەستەمدا حیلەی سڕبووی ساڵانی من ژیانەوە.
شەڕی نێوان بوون و نەبوون منیان له ژێر ژیلەمۆوە كرد بەكڵپەو
منیان لەناو دۆڵەكانی خۆڵەمێش و سەرابەوە هەستانەوە
ڕیزه چراخانی وشه له جزیره و بۆتانەوە بەسەر بەفرا بازیان ئەداو
به وێنەی عەشقی مەم و زین ئەبوون به خەیاڵی (خانی) و ئەبوون
به خۆشەویستیی زمان و به ئەوینی دارو بەردو به ڕەنگەكانی سروشت و
به لاوك و به داستان و به شەونمی كەنار دیجلەو به سروودی ئازادیم و
لەناو ناخما ئەتوانەوە

ساڵ ئەڕژێتەساڵەوەو بیر ئەڕژێتە بیرەوەو، لە دوورەوە، لەناو
گەرووی فەرەنساوە، لە شۆڕشی نانی برسی و ئاوی تینووی هاوینەوە،
پرشنگەکانی ئازادیی لە پەیامی سێ گۆشەدا بەرەو دنیا ئەپەڕنەوەو
منیش ڕووناکتر ئەبمەوە

ئەمە قسەی خاك و خۆڵە وەختێ ئیتر ڕائەپەڕێ و
پێی بەچەکمەی شەوەزەنگ و غەوارەکان قوبوڵ ناکا.
ئەمە قسەی داربەڕووە، قسەی دەشتە، قسەی خوێنەو قسەی
عەشقەو قسەی کۆترە باریکەیەو قسەی تاوێرەکانی کێوانەو قسەی جادەکانی
شارە، قسەی بالآی یاخیی بوونی سالآنێکە بەسەر ئاسمان
کون ئەکەن و لەناو بریندا هەڵئەکەن. قسەی هەقەو خوایش لەگەڵیا
هاوار ئەکات. ئەمە قسەی قوربانییە وەختێ وشەی ئەبنە یاقووت.
مەمکی ژنە لەو دەمەدا ئەقریشکێنن. ئەمە پەیڤی ئازادییە  وەختێ ئەبێ
بە درەختی ڕۆژەکانم و سێوی دڵو ڕۆحم ئەگرێ. پەیڤی ڕووناکییە وەختێ
شەهید ئەبێ.

هەورێ دێت و هەورێ ئەڕوا.
وەرزێ ئەمرێ و وەرزێ ئەزێ و
من ئێستاکە بووم بە ڕیزە مەشخەلآنی دەریاچەی"وان"
سەرانسەری چەوسانەوەم داگیرساوە.
سەرانسەری نەخشە و بالآم بووە بە قەڵبەزەی سوورو
سەرانسەری نائومێدیم پڕهەتاوە.
زەمان کاژ فڕێ ئەدات و زەمان باڵی تازەی لێ ئەڕوێت و
زەمان چڕتر ئەبێتەوەو زەمان زەنگم بۆ لێ ئەدات!.

چاوی"ئامەد" بوو بە چرای گەڕۆك و قەلاّی هەولێربووە بە قەلاّی
تەمەنی حەیرانی من. لە ڕۆژهەلاّتدا"ئەردەلاّن" هەلّۆیەکە چاوی تیژی
بڕیوەتە ئایندەی دوور. بۆ یەکەم جار"شەرەفخان" مێژووی هاوارو
بن و بنەچەی ئازارم تۆمار ئەکاو کلّۆلّیم ئەگێڕێتەوە.
بەردەوامە خۆکوژیی وەرزەکانی من.
بەردەوامە خۆکوژیی ڕۆژەکانی من.
هەموو جارێ ئەبم بە بلّێسەی یاخی و هەر جۆگەی خۆم ئەمخنکێنێ
بەردەوامە مەرگی من و بەردەوامە هەستانەوەم.
خۆم یەکێکم و هەموو ڕۆژ سێجار ئەکوژرێم.
بەردەوامە سەربڕینم و بەردەوامە ژیانەوەم.
سۆران بووە بە پشکۆی ناو خەوی سولّتان.
سلەیمانی لە شیعرا ئەدرەوشێتەوەو"نالیی" بووە
بە منارەی ئەم زمانەو، "مەولانە" نامۆی مالّی باوو باپیری خۆیەتی و
سنەوبەر خۆی هەلّئەکەنێ و سەرهەلّئەگرێ بۆ هەندەران.
ڕۆژان ئەمرن.. ڕۆژان ئەزێن... لە کۆیەداو
لەناو ژوورێکی بچوکدا"حاجی" ئەبێ بە ئاسمانێ و
شیعرەکانی بە مانگەشەو... حاجی ئەبێ بە ولاّت و
شیعرەکانی بە پۆلە کەو
وائێستاکەیش بەدرخانیەکان لە "سەرما"
بوون بە شەقامی کازیوەو وشەی گولّدان.
بۆ یەکەم جار یەکەم پلیکەی ڕۆژنامە دائەنێن و
بۆ یەکەم جار زریکەکانم چاپ ئەکەن.

بۆ یەکەم جار باڵەخانەیەك لە وشە. تەلاریك لە شیعرو مێژوو
فوارەیەك لە بۆن و ڕەنگم بەرزئەکەنەوە بۆ ئاسمان.
لە دوامەوە سەدەکان ئەچنە تەمەوە، . لە پێشمەوە جیهان ئەبێ
بە پێچکەکانی ئەتۆم و سەدەی بیستەم دێتە دەرێ. تەرمی ئیمپراتۆری
بەردو شمشێر هەڵئەدەنە ناو زەریاوە. ئیمپراتۆریای زەریای چلێس
نێوەی ڕۆژهەلأت و من و نەوت و خوێن و شاخ و سەحرا هەڵئەلووشێ.
دەم و چاوم ئەبێ بە شاپلێتەی گڕدار
بالأی تفەنگ ئەبێ بە ئەسپی رەش و یاڵ بڑو
لەجەستەی"بەردەقارەمان" بەیانیەك دائەتاشم.
ساڵ ئەچێتە ناو ساڵەوەو خوێن ئەچێتە ناو خوێنەوەو
"دەرسیم" سەری ئەداتە دەست بەفری بەر باهۆزی پیران
ئیتر سەر ئەبێ بە مانگ و لەسەر چیای جودی هەڵدێ.
دیسانەوە جارێکی تر بە مردندا هەڵئەزنێم دیسانەوە ئاگریداغ
ئەبێ بەپڵنگی بەرد و سواری ئەبم..
لە باکووردا ئەتاتورکێ وشەم ئەداتە بەر قەمەو خەونەکانم کوێر ئەکات و
لە ڕۆژهەلأتیشدا خانێ شەپۆلی ورمێم ئەکوژێ و
کەللە سەری سروودێکم بەسەرپردێکی شنۆدا هەڵئەواسێ.
حەسانەوە  لە برینماو وچان لە هاوارما نییە..
ئەمە سەدەی چڕبوونەوەی مەرگەساتە و کارەساتەو
سەدەی قەنارە بەکۆڵەو قڑ ژهراویی.
ئەمە سەدەی لە خاچدانی عەشقی بێ داڵدەو بچووکە
سەدەی لێوی ماچ خوێناویی

سەرم ئەستێرە تەیرێکی بەرزە فڕەو لە ژێر قوببەی ڕامکردن و
ناو قەفەزی سەرزەمینی کۆیلەدا دابین ناکرێ. من ئەوینێکی
بچوکم. من ئەوینێکی بێکەسم. من تەنیاییم هێزی تەنیای
خوای تێدایە بۆیە نامرم!. بۆیە لەناو ژیلەمۆوە هەموو ساڵێ
سووتووم دیسان ئەبێتەوە بە باڵندەی ئەفسانەیی و جارێکیتر
لەناو مەرگا ژیانی نوێ ئەژێننەوەو باڵیش ئەگرم
حەسانەوە لە برینماو وچان لە هاوارما نییە.
دیسانەوە ئێوارەیەك، لە ڕۆژهەڵاتی جەستەماو لە چوارچراو لەناو
بەفرا سەروملم بوون بە هێشووی عەشقی سوورو خوێنم هەڵهات
دیسانەوە لە بوولێڵێکی ئەیلولدا هەڵگیرسام و بۆ چواردە ساڵ
عەشقم پڕاو بەلاّم (پەری) من هەرنەهات. سەری ئەسپی خۆم
جێیهێشتم. دیسانەوە لە گۆڕەوە هەستامەوەو خۆڵەمێشم
کلّپەی کردوو ئەمجارەیان"قەندیل" بوو بە پشتی ئەسپ و
پاشەڕۆژیی بوو بە دەستم
ئەمە سەدەی چڕبوونەوەی مەرگەساتەو کارەساتەو
ئەمە سەدەی لە خاچدانی عەشقی بێ داڵدەو بچووکەو
سەدەی لێوی ماچ خوێناویی
من پانۆرامای ڕەنگاڵەی
هەموو چەشنە مردنێکی ساڵم
بەیانییەك شارێك لەناو سنگی مندا خنکا. بەیانییەك بووم بە مەرگی
مۆمیابووی هەموو دنیا. بەیانییەك سەعات لەناو کاتژمێرما
دڵی وەستا. دارستانەکان پاڵکەوتن. ڕووبار لەجێی خۆیدا

نووست و زەوی ترسا. بەیانییەك لەناو چاوما شارێكم ناشت
بەیانییەك من بە پۆستی هەوایەكی ژەهراویدا ناونیشانی مەرگی تازەم
بۆجیهان ناردا
ئەوە منم نە ئەژیم و نە ئەمرم و
ئەسووتێم و ناسووتێم و ئەخنكێم و ناخنكێم و
ئەوە منم .. لە وەریندا
ژیان ئەگرم.
ئەمەساڵی مەرگی بە پۆل پۆلی منە
پۆل پۆلی چاو.. پۆل پۆلی خەو
پۆل پۆلی ڕەنگ و پۆل پۆلی عەشقەكانم
ساڵی سەرژمێری كۆستە. سەرژمێری فرمێسكەكانی درەخت و
سەرژمێری هەناسەكانی گەرمییان. ساڵی سەرژمێری
وشەی فڕێنراوی دەنگی من و ساڵی چەكەرەكردنی سەری
منە لە بیابانی عەرعەرداو ساڵی پەڵەدانی مەرگم
لە دنیادا، ئەنفالەو ئەنفالەو ئەنفال. ساڵی تەنیایی
راستییەو، ساڵی غەمگینیی خودایەو ساڵی نوشتانەوەی
بەردە لەبەردەمی كیمیاداو ساڵی چۆڵبوونی  وڵاتی
عەشقستانەو ڕاكردنی بێشەڵانەو هەڵاتنی گۆڕستان و
خۆشاردنەوەی ئاگری نەورۆز. ئەنفالەو ئەنفالەو ئەنفال
من دۆزەخێكی ئەبەدیی ڕۆژهەڵاتم، ئەو نەفرەتەم ئەمسەرم وا
لە ئەنفالی ئەم دنیاداو ئەوسەریشم گوناهێكی تاق و تەنیای
بە كوڵ و كۆی جەهەننەم و قیامەتە. ئەنفالەو ئەنفالەو ئەنفال

"هەتا ئەمرم دێنە خەوم. هەموو شەوێ لە تەمتوومانی
مەراقماو لەودیو شووشەی سەرابەوە کۆمەڵ کۆمەڵ ئەیانبینم
شیعرم دەشتی ڕۆژی حەشر و قیژەی ئەوانی تیا ئەڕوێو
لەشم زوخاڵ" ئەنفال ئەنفال ئەنفال ئەنفال!
لە مەرگەوە هاتوومەوەو
ئەچم بۆلای یەکەم گوڵی مانگی مارت و
ئەچم بۆ لای"کێوەڕەش"و
بەردەم دەروازەی"ڕاپەڕین"
لەسەر ئەم پێستە سوتاوەو لەم سوتماکی جەستەیەدا
خونچەی وشەو گوڵە شیعرو گوڵە تابلۆو گوڵی گۆرانی و
مۆسیقا سەر دەردێنن. من نوێ بوونەوەی سەعات و
من سوێ بوونەوەی ڕۆژگارو ناڵەی شەووژانی مانگ و
قرچە قرچی دەقیقەم و بەلاّم ئەمڕۆ پێ ئەکەنم
لە ئەنفالدا بوومە هەڵمی سەر تابووتی ولاّتێك و
بەلاّم ئەمڕۆ لە چاوانی ڕانییەدا
من بەژن و بالاّی زیوییینی
درەوشاوەی بەر بارانم
وەرزی کۆچەو کۆچی سوورەو وەرزی ڕاکردنی شارە بۆ ئەشکەوت و
وەرزی ڕەوکردنی شەقام بۆ لای دەراڵی ناو چیا
وەرزی کۆچەو کۆچی تەڕەو جێهێشتنی گلێنەیەو جێهێشتنی
پەنجەکانی ڕووناکییەو جێهێشتنی ئاگری ماڵەو جێهێشتنی
خاڵخاڵۆکەی بیرەوەریی. وەرزی کۆچی ئازادییە، وەختێ ئازادیی

نایەوێ لە ژێر سایەی دەم و چاوی نێزەکاندا ئیتر بژی
وەرزی کۆچی جۆگەکانە، وەختێ ئیتر نایانەوێ ئاوکوژ لێیان بخواتەوە.
وەرزی کۆچی مەلەکانە وەختێ ئیتر نایانەوێ
لە هێلانەی ئاسمان کوژا هەڵبگورمێن. وەرزی کۆچی منداڵانە
وەختێ ئیتر نایانەوێ گوڵ کوژەکان گەورەیان بن. وەرزی
کۆچی هۆنراوەیە وەختێ ئیتر نایانەوێ ژێر بنمیچی سەری
ڕەقیب ئاسمانیان بێ!
کۆچمکردوو کۆچ بردمیە چاوبەچاوی ناو دنیاوە
لەو وەرزەوە، تارماییەکەی ئازاری من
لە گشت ماڵێکی جیهاندا
یان لە ژووری میوانیاندا دانیشتووە
یان بە پێوە لە باڵقۆن و بەرهەیوانی ڕوانینیانا ڕاوەستاوە
هەورێ ئەمرێ و هەورێ ئەزێ و
زەمان کاژ فڕێ ئەدات و زەمان بەرەژان گرتوێتی و
واخەریکە سەدەیەکی تازەی ببێ و
لە پرێکدا خۆر ئەگیرێ
ژووری شیعرم تاریك ئەبێ، وێنەکانم یەکەیەکە ڕەنگ و روویان خۆڵەمێشیی
هەڵئەگەڕێ، لە ترساندا هەموو خەویان لێ ئەکەوێ و لە پرێکدا خۆر بەر ئەبێ و
وێنەکانم لە خۆشیاندا باوەش ئەکەن بە یەکتر داو پەنجەکانم لە ئەزموونی
خۆرگیراندا ڕەنگێکی نوێ ئەدۆزنەوەو خەیاڵیشم دائەگیرسێ
ساڵێ ئەمرێ و ساڵێ ئەزێ و بۆ سبەینێ
لە هەزارەی سێهەمیندا

ئەچمە سەر یەکەم پلیکەی وشەی تازەو لە دەنگەکان ڕائەمێنم
ئەچمە بەر یەکەم ئاوێنەی وێنەی تازەو لە ڕەنگەکان ڕائەمێنم
لە ناو دەفری بەیانیدا خەیاڵ و ڕەنگ تێکەڵ ئەکەم
هەوڵ ئەدەم دەنگێ بێنمە شیعرمەوە نەبیستراو بێ
هەوڵ ئەدەم ڕەنگێ بێنمە تابلۆمەوە نەبینراو بێ
پرسیار. پرسیار. پرسیار بکەم!

ستۆکهۆڵم
1999/11/21

# ژن و باران

بەیانییەو  (ستۆکهۆڵم) دەستەکانی لە گیرفانداو،
پەنجەکانی پێی تەزیوەو، لەبەر (با)ی بەفرا کوورِ بووەو
ئەویش وەك من هەڵئەلەرزێ!.
جانتام لە شانی ڕاستمایەو ئەچمە سەرێ و، لە ژوورەوە
عەینەکەکەم هەڵم ئەیگرێ و، هەتا وەکوو چەند چرکەیەك،
شلوێ ئەبێ تەماشام و ژمارەی جێم لێ ون ئەبێ!.
(شەمەندەفەری دووهەزار) بە ئەسپایی لەترێك ئەداو،
بەرەو باشوور بەناو تەمێکی تەنکدا، "تەنکتر لە پەردەی ژووری سپی
هێلکە"، وردە وردە وا ئەجووڵێ.
لە دەرەوە، لەسەر سپۆر، لە ناو پاڵتۆی زستانەوە
سەروملی و تاناو قەدو دەست و پەنجەی بەرِێکەران
لەخێرابوونی ترێندا، ئەڵێی (با) ئەیانرِفێنێ و
یەك لە دوای یەك ون ئەبن و ڕیزە واگۆن جێیاندێڵێ.
وا هەنووکە، شەمەندەفەر، زیکەی بەرزە و بین گرتوێتی و
ناوبەناویش وەك باهۆزێکی زەبەللاح

**لەبەردەمی تونێلێکدا**

**ڕێی پێ بگرێ و شانی لێدا**

**ئەم خۆی جیڕتر ئەکاتەوە**

**نەڕەیەکی تووڕەبوونی لێ هەڵئەسێ!.**

**کورسیم لە پاڵ پەنجەرەداو**

**ڕومکردۆتە دنیای دەرێ و**

**ئەوەتا وا لەناوچاوما، نزیك و دوور، باڵەخانەو،**

**ڤێللاکان و، دەشت و دەروو، پردو کێڵگەو ستوونەکانی**

**دارتەل و دارو درەخت و ڕێگەوبان.. هەمووی ئەفڕێ.**

**بەلاّم خەیاڵم تا ئێستا**

**شووشەیەکی تەماوییەو هیچ شوێنێکی تازەی شیعرو**

**هیچ ئاسمان و هیچ ڕەنگێکی سەوزو سووری حەزو زەوی ناخی**

**خۆمی لێ دیار نییەو.. وشەم نادوێ!.**

**ئەڵێی جانتای داخراوی سەر ڕەفەم و**

**هەر لەرەم دێ.**

**ئەڵێی ئاسن گرێی داوە لە دەروونم و**

**ئەڵێی سەری قوتووی عاسیم ناکرێمەوەو، شپرزەییم دڵۆپە**

**جیوە خولیامەو، بە قەڵەمم**

**ناگیرێت و لەبەر پەنجەما ڕائەکاو هەر دێ و دەچێ!.**

**ڕۆژنامەیەکی زۆربڵێی زمان لوسیش**

**لەسەر ڕانمەو، بۆ چەند ساتێ**

**تەنیاییم و چاوەکانم لە پەناوە ئەخلافێنێ.**

ڕۆژنامەیەك هەر لە یەكەم سەرنجەوە
پەڕەی سپیی نێونیگام و
رۆحی پاكی مندالأنەم ئەژاكێنێ:
(بە گەورەیی وێنەی چڕوچاوی شوومی (میلۆسۆڤیچ)
ئەبینم و، تەماشام دڵی تێكەڵ دێ و لە پڕێكدا
بۆنی ڕق و بۆنی خوێن و بۆنی كۆسۆڤۆو دووكەڵ و
بۆكڕووزی ڤژی جوانیی و بۆچڕووكی جیهانی سێ،
بەسەرما دێ و، لەسەر شووشەی پەنجەرەكە تارماییەك
لە مەرگی شین ڕائەوەستێ و تارماییەك لە مەرگی بۆر
تێ ئەپەڕێ و قوربانییەكان بەیەكدا دێن تێكەڵ ئەبن و
(هەڵەبجە) ئەبێ بە شارێك لە كۆسۆڤۆو كەركوك ئەبێ
بە (گرۆزنی)و سەری بڕڕاوم ئەبینم لە قوڵی پاڵتۆی
دنیاوە دێتە دەرێ دائەچڵەكێم..
زۆر بە پەلە ڕۆژنامەكە
ئەدەمە دەست كیسەی خۆڵ و
ئیتر ئەوسا مۆتەكەیەك لەبەر چاوم و
لە سەر سنگی من لائەچێ!.
شەمەندەفەری دووهەزار
زەمان كوناودەر ئەكات و
دەقیقەی جاران نیوەیەو.. سەعاتی جاران نیوەیەو
جێگا ئەفڕێ!.
بەلأم هێشتا قەڵەمەكەم

**کلاوەکەی لەسەردایەو،**
**کاغەزم هەر خەوی سپیی ئەبینێت و**
**شیعرێکیش کە من بمەوێ دارژانی**
**سێلاویکی دنیاگیربێ**
**هێشتا ژانێکی بچووکەو**
**لە هەورێکی زۆر دووردایە!.**
**خاوبوونەوەی وردە وردەی جەستەی گەرمی شەمەندەفەر**
**لە خاوبوونەوەی ماسولکەی دوای توڕەبوون،**
**لە کزبوونی وردە وردەی لرفەی گڕی بەر باران و**
**لە وچانێکی داچوونی شەپۆلی گوێ زەریا ئەچێ!.**
**شەمەندەفەری دووهەزار**
**لە بەردەمی وێستگەیەکی ڕەنگ پەمەیی**
**شارۆچکەیەکدا ئەوەستێ.**
**دۆڵێکی قووڵ هەڵمێ لە دەمی هەڵئەسێ**
**نیوەی بەژنی ئەم وێستگەیەو بەرپەنجەرەم دائەپۆشێ.**
**گڵۆپی بە ڕۆژ هەڵکراو،**
**رووناکی لێڵ، لەناو هەڵما**
**لە سەری من و کورد ئەچێ!**
**وا ئێستاکە چاوم ناردۆتە سەرسپۆر، ئەگەڕێت و، پیاسە ئەکاو**
**یەك دەقیقەو لەو سەرەوە لەگەڵ شۆخێکی جل رەشی**
**جانتا مۆردا، بەیەکەوە، دێنە سەرێ.**
**وەختێ کە ئەو دەم بە هەناو دێتە ژووری**

کابینە ئەگەشێتەوەو پەنجەرەکەم پێ ئەکەنێ شپرزەییم
ئەکەوێتە بەرپرشە پرشی جوانییەك دائەچڵەکێ و قەڵەمەکەم
خەیاڵ پەڵەی تیائەدات و، کاغەزی سپیی بەردەمم
ئەبێ بە پێدەشتی شیعرو، بێزارییشم، لەسەر کورسیەکەی
تەنیشتم، ناچار خەوی لێ ئەکەوێ.
سنەوبەری کریسمسەو شەوقی تەڕی چراکانی لەبەردایەو
جریوەیەو دائەنیشێ!
من ئێستاکە بووم بە فوارەی وشەو وێنەو
کابینە بووە بە حەوزو، زەوقم پڕەو،
شەمەندەفەر لە هەر وێستگەیەك بوەستێ
لە پەنجەرەو لە دەرگاوە ئاوی ئەوین و گۆرانیم سەرئەکات و پێکەنینم لێی ئەرژێ
من ئێستاکە چون باڵندەی لەنگەرگرتووی هەوای هێدی و
ڕۆژی ساماڵ، دنیایەك لە ژێربالْمایە، ئاوێنە ڕێژ
بریسکەی دێ و کانی خەونی تیاهەڵئەقوڵێ و،
بوومەتەوە بە چوار پێنج ساڵ. جوانیی ژنێ، لە واگۆنی
غەریبیدا، بۆچەند ساتێ، سەری پڕکردم لە گوڵ و
لە پەپوولەو بردمیەوە بۆ لای یەکەم جێژوانی پەریخانێ.
جوانیی ژنێ لە بێدەنگیی بینینێکدا، هەزار نەغمەی
نەبیستراوی باندی شیعرو، پڕ بە کۆشی بەیانیانیش،
گمەی سپیی و قاسپەی شین و چرپەچرپی گۆمی مەنگ و
سروەی دامێ!.
چاوێکم لەسەر پەنجەرە بێ ئاگایەو هەڵئەخلیسکێ و

چاوەکەی ترم لەولاوە وا خەریکە خۆی بە خاچی
سەر مەماندا هەڵبواسێ!.
لە جانتاوە مانگ کتێبێ دەرئەهێنێ
(پەیتووکەی چاو ئەگاتە ناو ئاسمانی بەرگ)
مانگ ڕۆمان ئەخوێنێتەوە.
ڕۆمانی (تەپڵی باران)ی (کاداری)یەو
وا ئەم قەسیدە قژ زەردەیش
پەڕە پەڕە لەو عەشقەدا نوقم ئەبێ.
تەپڵی بارانی ئەم شۆخە لەگەڵ خۆیدا هەوری هێناو
بە لەپی دەست بەقەد جێگەی دەم و چاوم
هەڵمی سەرشووشە ئەسڕم و
تەویڵ ئەنێم بە پەنجەرەی تەنیشتەوەو. لە ناکاوێ
دەمی تیژی بروسکەیەك
ڕێگای شەوقێکی خوارو خێچ
لەناوچەوانی ئاسماندا ئەکێشێت و
تاریکایی درز ئەبات و
باران ئەزێ!.
تەپڵی بارانی ئەم شۆخە لەگەڵ خۆیدا هەوری هێناو
ئەوەتا وا، لە بەرایی ئەو دەشتەدا، تەپڵی باران
دەنگی دێت و، قامکی دڵۆپ، سیمفۆنییای،
ڕەنگاوڕەنگی ئاو ئەژەنێ!.
(خودایە! لەولایش ئەم تەپڵە دەنگی بێت و

**خودایە! لەولایش بباریٚ)**

**ژن و باران**

**ڕێزە بەڕێزە، ڕێژنەیان، بەسەرمندا ئەبارێن و**

**بە هەردووکیان، سەوزم ئەکەن، ژن وباران.**

**جارێك گیتارە جەستەم و**

**ئەویان هاژەم تیا لێ ئەداو**

**جارێکی تر، ئەویتریان، ئەمکا بە دەفتەری بەفرو**

**مانگەشەوم تیائەنووسیٚ.. ژن و باران**

**(ڕەنگی) ئەویان، کە لە خۆیم هەڵبکێشیٚ**

**ئەمکا بە شەوی سایەقەو**

**دەنگی ئەویان، کە بێتە گوێم**

**ئیتر بۆخۆم ئەبم بە گوێی خۆشەویستی و**

**بەگوێی هەموو ئاوازەکان... ژن و باران.**

**وەختیٚ پێکەوەیش بێنەلای شپرزەییم**

**لە یەك وەختا من کلّپەیەکی فێنك و**

**لە یەك وەختا من کرێوەی سەر بەگڕم... ژن و باران**

**با ببارێن هێند ببارێن..**

**بیکەن بە تۆف لەناو سەرما**

**عەشقی ژن و عەشقی باران**

**با ببارێن.؟. هێند ببارێن**

**تا تەنیاییم لە خۆیاندا غەرق ئەکەن و**

**ئاوارەییم سەر ئاو ئەخەن. ژن و باران، ژن و باران.**

**شەمەندەفەری دووهەزار**
**وەك خەیاڵی درێژی من باراناویی.. هەرئەکشێ و**
**چون خولیایشم هەر وژەی دێ و.. تۆزێکی تر**
**شەمەندەفەری دووهەزار**
**لە دوا وێستگەی سەفەرێکداو**
**لە بەردەمی گوڵەکانی پێشوازیدا**
**هەناسەیەك هەڵئەکێشێ و**
**لە جێگەی خۆی مت ئەبێت و ڕائەوەستێ!.**
**بارانە ژنی جل رەشیش**
**دەست ئەداتە جانتای مۆرو دائەبەزێ و**
**لە ناو ئاپوورەی شەقامدا.. خۆی و تەپڵی بارانەکەی**
**بزر ئەبێ!**
**وەختێکیش من ئەچمە خوارێ**
**کۆچێکی نوێی ئاوارەبوون، لە ژێر تەنیایی دارێکدا**
**چاوەڕێمەو لە پەنجەرەی بارانەوە،**
**دەستەکانی درێژئەکاو**
**لە ئێوارەی سەدەیەکدا**
**دوا قەسیدەم لێ وەرئەگرێ!**

ستۆکهۆڵم
1999/12/4

# لەو قژەدا

# مانگەشەوێ بریندارە!

ڕێگەم بدە!، تاڵ تاڵ قژت، بنووسمەوە.
تاڵ تاڵ ئەو خەمە درێژە دوژمندارە،
چون تیلماسکێ لە خۆرنشینی قوربانیی و چون تاژانێ
لە ئاویلکەی بڕینەوەو شکاندنەوەی لاسکەکانی بەربەیانێ
بە باپووسکەو باڕێزانی ڕۆحم تەڕکەم!
ڕێگەم بدە، ئەو ئازارە هەڵکورماوە
لە فڕینی ترس و بیمدا بخوێنمەوەو
ببم بە (با)
وەختێ مەرگ لەناو قژتا
ڕۆژەکانت شانە ئەکات!
لەو قژەدا هەموو ڕۆژێ گومانێ ئەبریسکێتەوەو
شپرزەیی ئەشنێتەوەو ئارام هەڵدێ.
ترسیش بە وێنەی گەردەلوول هەڵئەکات و
مردن هەر لەولای سەرتەوە

بە دووریی چەند سانتیمەترێ
دەست بۆ شمشێری غەزایەك درێژ ئەكات!
لەو قژەدا مانگە شەوێ برینداره‌و
خەرمانەیەك هەڵئەوەرێ.
پەنجەكانم (با)ی لاسارن
لە زەردو ماهی جەستەتا، لەناو گەوەی، ئەو كاكۆڵ و پەرچەمەتا
ڕەوە تیشكن ڕێ ئەكەن و
شەوی ئەفسانەو نەهات و یەكەیەكە حیكایەتی تیرۆری گەلاۆ سەر لق و
گەشانەوەی خوێنەكانت تۆمار ئەكەن.
لەو بسكەدا تاڤگەیەك برینداره‌و
دەنگ ئەپژێ
لەو قژەدا شەپۆلانێ ڕاكشاون
شیعریان داوە بە خۆیانداو
بەر نەفرەتی خواوەندێكی تازە كەوتوون!
ڕێگەم بدە! لەناو قژی قەدەغەدا
لە دەریاچەی قەدەغەدا
لەناو سەری پڕ لە هەورە بروسكەدا
مانای بۆن و مانای ڕەنگ و مانای ئاواز بدۆزمەوە.
لەناو قژی قەدەغەدا ئەوینی ئێمە پرسیارەو
بەم ڕۆژگارە لە زەمانی بەردو شمشێر هەڵئەنووتێ!.
لەناو قژی قەدەغەدا بەژنی ئاسمان زنجیر ئەكرێ.
جەنگی قژەو جەنگی بڕینەوەی تیشكەو

جەنگی داپۆشینی پەلکەگیاکانی خودایەو
جەنگی جەستەم!.
تاڵ تاڵ قژت ئەنووسمەوە:
تاڵێك ئەمبا بۆلای خەون و
تاڵێك نیگام هەڵئەواسێ بە باڵاتاو
تاڵێك ئەمكا بە كزەباو
تاڵێكی دی ڕێزەی بارانەو هەودایەك
لە هەناسەی دەنگ و قسەم.
قژت ڕۆژنامەی قەدەغەی نیشتمانمەو
پژوپۆی دارسێوی حەرام!.
بۆ ئەوەی گەڵا نەبینم لە وەختی سەماكردندا
من ڕۆژانە چاوەكانم لەسەر جادە ئەكوژرێن و
بۆ ئەوەی باڵندەی سەرێ بەدی نەكەم،
لە وەختی باڵەفڕێدا، هەوایەكی راونراوم و
لە ئاسمانێكی حەرامدا تیرۆر ئەكرێم!
تازە قژت بووە بە پێناسەی شیعرم!
قژت بووە بە قەدەرم.
قژت بووە بە خولیایەك ئاوریشمین و
من ئەوانە وشەی لوولم و ئەیهۆنمەوەو
جارێك خەیاڵێكی خاوم و
جارێك بۆنێكی كۆچەرو
جارێكی دی لە جۆلانەی كەزیەكتا

هێواش.. ئەمرم!

من ناتوانم شاخ بێ رەوەز ببینم و

من ناتوانم هەور بەبێ پرچی باران وێناکەم و

من ناتوانم چڵەپۆپە لە ڕەگی ژان دابڕم و

من ناتوانم قەت ناتوانم

بێ ئەو باڵانەی فڕی تۆ

هەرگیز بفڕم!.

1999/7/10

# ڕەجم

**لە تەمێك ئەچێت ئەو ژنە**
**لە تەمێكی كراس سپیی، كەڵەگەت چون مەراقی شاخ.**
**شپرزە وەكوو سێبەری گڕی چرای لەرزۆكی**
**سەر دیواری ژوور**
**باریكەلە چون قامچیی دەستی مێردو**
**ڕەشتاڵە چون دەم و چاوی (خانەقین) و**
**غەمگین  وەكوو بارانەكەی  وەرزی كۆچڕەو.**
**لە  تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو كە ئەیبینی:**
**كۆلاَنێكی هەڵەبجەیەو پێناكەنێ.**
**كە گوێشی بۆ ڕائەدێری**
**شمشاڵێكی گەرمییانەو**
**بەتەنها هەر..  (با)ی دەربەدەری عەرعەرو**
**هەناسەی ئەنفال ئەیژەنێ.**
**لە تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو**
**لە هەناوی شووشەیەوە.. گەرای شیعری ناو وەیشوومەو**

دەنکە تۆوی کسپە دیارە.
لە هەناوی شووشەیەوە.. هەندێ گژوگیای گریان و
دوا سەمای بەفری ناو مەرگ و
گۆرانیی وردو خاش دیارە.
لە تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو
منیش شەقامی ئێوارە.
کە دێت پۆلێ لە حەسرەتی ڕەش و سپیی
پۆلێ لە هەنیسکی باڵدار
بەدەم ڕێوە دەنووك ئەدەن
لەنمەنمی زوخاوی و
پێکیشەوە ئەئاڵێنە سەروقژی.
وەختێ کە دێت بەردی ڕەجمیش بەدوایەوەن
چێ پێی پرشنگی هەڵئەگرن
شوێن سەری رووت، شوێن قۆڵی رووت،
شوێن کراسی کورتی کەوتوون.
بەردی رەجم، دەنگی رەجم، شەوی رەجم
کۆشیان پڕە، ناو گیرفانەکانیان پڕە، دەمیان پڕە
لە باوبۆرانی حەرام و لە چوارلاوە
بەتۆپەڵ کفری تێ ئەگرن!.
وەختێ کە دێت، خۆرنشینێکی ترساوە
زەردەی لێ ئەچۆڕێتەوە.
سەردەمانێ خۆی قەسیدەی گوڵ سپیی بوو

بەلاّم ئێستا لە کێڵگەکانی ئازاردا.. ژاڵە ئەگرێ.
لەسەر جادەی گومان و پرسی حەرامیش
شووشەی جامخانەی شکاوی ئازادییەو
کتێبخانەی خەونی جوانەو تالاّن ئەکرێ.
کەدێت
باخچەکەم نوستووەو
پەنجەرەکانم نوستوون و
پەنجەکانم لەسەر قەراغی خەیاڵم هەڵنیشتوون و
کە دێت لەگەڵ بووڵێڵدا دێت
درەنگ ئەگات
وەختێ ئەگات
باران سەفەری کردووەو
کزەبا دوور دوور ڕۆیشتووەو
ئاسمان بەتەنها یەك گەلاّی
لە تریفەی هەڵوەریوی
بۆ تەنیاییم جێهێشتووە.
لە تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو
لە درزی ترس و لەرزەوە دێتە ژوورێو
لە ڕێی لۆکەی ناو خەوەوە
ئەگاتە لام.
هەر چەند ئەگات، گوڵ هەناری پەڵە خوێنێ
بە سنگییەوە ئەجریوێنێ و

**جریوەی پەرت تویژاڵ تویژاڵ لێم ئەدات و**

**لە پاش تۆزێ**

**لەسەر لەشم و لەناو قژما دووسێ قاوغە فیشەك و**

**مشتێ دووكەڵ و بارووت و بۆنی ترس و دووسێ**

**پارچە لە بلووری**

**شەرەفی شكاوی خێڵ و چەند تەڵزمێ لە**

**سوێندی تیژی**

**ناو تۆڵەی پیاوەتیی پیاوی ئەم كوردە قارەمانە بەجێدێڵێ!.**

**هەر چەند ئەگات**

**سەری خوێناویی مامزێ**

**لە نێوانی هەردوو مەمكیا ئەزریكێنێ.**

**هەورە تریشقەی زریكە شمشێر شمشێر لێم ئەدات و**

**لە پاش تۆزێ لەناو ژوورما**

**لەسەر مێزو لەسەر كورسی و لەسەر چرپام**

**چەندین كڵپە لە ئاگرەكەی جەهەننەم و**

**چەندین سوورەت لە تۆفانی قیامەت و**

**چەندین كەڵبە لە هەڕەشەو**

**دەیان قامچیی بۆ جەڵدەو**

**چەندین لەچك لە قوماشی شەوەزەنگ و**

**چەندین تەلاقی سێگۆشەی هەڵوەشاوو**

**بڵندگۆیەك.. لەناو سەرما بەجێدێڵێ!**

**لە تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو درەنگ ئەگات.**

هەرچەند ئەگات گوڵ هەناری پەڵەخوێنی لەسەر
لەشی ئەجریوێنێ
حیکایەت خوان برینێکی پرچ درێژەو
بەردەوامیش لەبەردەمی مێژوویەکی ترسنۆکدا ڕائەوەستێ و
هەموو دەمێ لەسەر کورسی دان پیانانی تۆبەو
مەرگی هەزار جارەی
دائەنیشێ. هەموو وەرزێ بەسەر گوزشتەی کوشتنی
گوڵاڵەی جەستەی گوناه و حەرامی
باخچەی من و
ماڵی من و
خەونەکانم دائەپۆشێ.
بەو زمانی قوربانیانەی کە نیشتمان تێی ناگات و
باوکی خۆیشم بە تەورەوە راوی ئەنێ
بەو زمانە نەعلەتییە
من ئەدوێنێ.
حیکایەت خوانی قوربانییم.. دایکی خۆمەو خۆڵەمێشە.
حیکایەت خوانی قوربانییم.. دەسگیرانمەو
ملوانکەکەی بەردی رەجمە.
حیکایەت خوانی قوربانییم.. یەك بەیەکی
یەکەکانی جەستەی خۆمە.
لە تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو درەنگ ئەگات
تاکەو (کۆ)یە.. خۆی یەك ژنەو هەموو ژنە

ڕۆژێ ناوی مەستوورەیەو
ڕۆژێ ناوی حەبیبەیەو
ڕۆژێکی تر جوانی بێ ناو
مەستوورە دێ و سەری نییەو.. سەرچۆتەوە
بۆلای خودا.
حەبیبە دێ و دەستی نییەو.. دەست چۆتەوە
بۆلای حەووا
جوانی بێ ناو ئەبێ بە نیشتمانی بێ ناوو
ئەبێ بە جوانی حەرام و
ئەبێ بە هزری حەرام و
ئەبێ بە عەشقێکی حەرام!.
لەناو پرسیاری حەرامدا. لە جوگرافیای
حەرامدا.. لەبیرکردنەوەی حەرامدا
ئاوێنەکان نێرینەن و
کلیلەکان نێرینەن و
ئاینەکان نێرینەن و
شەقامەکان نێرینەن و
یاساکان و جەنگەکان و یانەکان و
ئەوەی تەنها مێینەیە.. هەردوو شتی بەسزمانە:
یەکەمیان خۆشەویستییەو
دووەمیان ئێش و ئازارە!.
ئەی تەمە ژن!

**من واهاتووم.. ئیتر چراوگی سەری خۆم**
**بدەمە دەست شەقامێکی شەوگاری تۆ**
**من وا هاتووم کە گمەگمی تەنیاییت لە**
**چوارچێوەی هێلانەیەك بێنمە دەرێ و ئیتر**
**بیسپێرم بە ئاسمان،**
**ئیتر بیسپێرم بە چڕیی دارستان و بەگۆرانییە میللیەکانی،**
**ناو گەڕەکی هەژارەکان. من وا هاتووم**
**چارەنووست ئیتر،**
**بسپێرم بە مەرگم، وەختێ مەرگم پەنجەرەیەك لە سامالْدا**
**بکاتەوەو لەسەر باخچەی گوڵی ڕەشت، من**
**ئەمەوێ لەم**
**شەڕی عەشقە نوێیەمدا..**
**وەکوو بارانی سەر ئاگر دابکەم و**
**ئینجا بمرم.**
**من وا هاتووم.. ڕۆحم بە پرچتا هەڵواسم**
**بەهەردووکمان جۆلانەیەك لە شەفەق و**
**جۆلانەیەك لە خەونەکانی ئایندە دروست بکەین،**
**بۆ ئەو چراو گوڵ مێخەك و**
**پیاڵەی شەراب و کتێب و کەمانچانەی**
**سبەی ڕۆژ ئەبنە منداڵمان.**
**من واهاتووم.. ئیتر شەماڵت نەخەمە سینەمەوە.**
**ئیتر پەپوولەی دووانت.. نەهێنمە ناو بیستنمەوە.**

من واهاتووم.. له گەوەكانی دەروونتا
باهۆزت بێداركەمەوە.
له تۆفاندا تەوارەكەت بێنمه قسه.
ئەی تەمه ژن!
ئەی ئازادییت له ولاٌتی قفلٌەكان و له ولاٌتی جبەكاندا
له گۆشتی بەراز حەرامتر!
ئەی تەمه ژن!.. عەشق له جەنگدایه عەشق.
عەشق كەوتۆته بۆسەوە عەشق.
عەشق لێوان لێوه له خوێن عەشق
ئەی تەمه ژن!
بستێك لەیەك دوور بین زۆره
له بۆشایی بستێكەوه
دەشتێ شەوەزەنگ ئەتوانێ بێته ژووریٚ.
پەنجەیەكیش مابێنمان بیٚ هێشتا زۆره
له بۆشایی یەك پەنجەوه
شاخیٚ دووكەڵ دێته ژووریٚ!.
له تەمێك ئەچێت ئەو ژنەو درەنگ ئەگات!.
وەختیٚ ئەگات گوڵ هەناری پەلٌه خوێنیٚ لەسەر
سنگی ئەجریوێنیٚ
وا ئێسته هات!.. ئەمجارەیان له ڕوانینما ئەیهێلٌمەوه
وەك مانەوەی سۆما لەناو چاوەكانما
چون مانەوەی دەنگی دایكم له گەروومدا.

**ئەمجارەیان ئەیهێڵمەوە.. تا باران ئەگەڕێتەوەو**
**بەیەکەوە لەم چۆڵەوانیی شارەدا سەوزمان ئەکات.**
**تاکوو (با) ئەگەڕێتەوە لەم بێدەنگیی قاقڕەدا**
**بەیەکەوە لەناو سەری سترانێکی بچکۆلەدا**
**لەناو سەری تازەترین کچی ساوای ئەم شارەدا**
**تۆومان ئەکات!.**

مارتی/1999
سلێمانی

# وەفا

هەر کەس ڕۆژێ
منداڵێکم بداتە دەست باخچەی خۆشیی
من بۆ شەوێ دڵم ئەکەم
بە مۆمدانی دەست و پەنجەی.
ئەوەی جارێك هەڵکوتێتە
سەر تارمایی ترسەکانم
من هەزارجار سەرم ئەکەم
بە پێپلیکەی
ئەوەی قومێك ئاوبکاتە
دەمی مێژووی بریندارم
هەتا مردن
من خۆم ئەکەم
بە مەتارەو بە زەمزەمەی!

# لەدایکبوون

کچێکمان بوو. گوڵە لیمۆ
بەم ڕێیەدا.. هاتی بۆ لام
کوڕێکتان بوو.. زەنگی ئاسۆ
بەم ڕێیەدا.. هاتم بۆلات.
لە سەرەڕێی هەردووکماندا
کانییەکی ساوا هەبوو
بەردێك دەستی نابووە بینی
کەچی کەسمان
نەچووین بەدەنگ
گریانی ئاوی ساواوەو
کەچی کەسمان
دەستی ئەو بەردەمان نەگرت
کە منداڵی هەردووکمان و
پاشەڕۆژێکی ئەخنکان!

# تەنیایی

کەسێك بێدەنگی نەدوێنێ

نایشتوانێ عەشقم بدوێنێ.

ئەوەی بەچاو"با" نەبینێ

نایشتوانێ کۆچم ببینێ.

ئەوەی دەنگی بەرد نەبیسێ

نایشتوانێ دەنگم ببیسێ.

کەسێك کە نەیشبووبێ بە شەو

چۆن لە تەنیایی من ئەگات؟!

# درەوشانەوە

بۆ یەکەمجار وشەم بەخشی
بەخۆشەویستی خودی خۆم
یەك پەنجەرەی ژوورەکەی خۆم
لەسەر دڵم کرایەوە
جارێکی دی وشەم بەخشی
بە خۆشەویستی وڵاتێك
ئەمجارەیان دە پەنجەرە
لەناو سەرما کرانەوە
لە دواییدا وشەم بەخشیی
بە خۆشەویستی گشت دنیاو
ئەوسا ئیتر
هەموو ئاسمان
لەسەر شیعرم کرایەوە!

# مەولەوی

دڵۆپە نووری تەوێڵی هەورامان و
دارژانی مرواری ناو زمانەکەم
وەختێ برووسکەی خەیاڵ و
هەوری وێنە لەیەك ئەدەن.
لە خەڵوەتێکی نەقشیدا
ئاوێتەبوون لەگەڵ خواداو
لەم لایشەوە لەدایك بوونەوەی سروشتی تر.
ڕیشی قۆزاخە بۆ کرمی ئاوریشمین و
سەری گوڵدان بۆ چنوورو
فرمێسکی زیوینی چاویش
بۆ کۆچەکەی (عەنبەر خاتوون)!

★ ★ ★

ئەی حەزرەتی وشەی نوورانیی و خامەی بەفریین
ئەی زمانت زمانی پەیڤە سپیەکانی خوداو
ئەی بێدەنگیت لە خەڵوەتا گۆمی ماناو

ئەی پەنگ خواردنەوەی وەجدی شەوانەی
عەشقی ڕەها!
لە دوای کۆچی مەولانەی سەمەندەرەوە
کلێپەیەکت بۆ بەجێما، سەرت فەنەری سەفەرەکانی ئەوبوو.
کلێپەت کرد بە باڵ، لە مەوداکانی سووتاندا
دەمێك ئەبووی بە هەڵمی رۆخ و کەناری
دوورە زەریای نزیك ژانە گیانی هیندستان و
دەمێکی تر ئەبووی بە لێزمە بارانی نیگاکانی
بەرپەنجەرەی تەنیای خوداو
دیسانەوە ئەبوویتەوە بە کاوانێکی هەورامان
ئەباریت و دائەگیرسایت
ئەتوایتەوەو لە توانەوەی خۆت ڕائەمایت
لەسەر لوتکەکانی ئیشراق
چاوت ئەکەوت بەیەکەم زایینی هەتاو
دەستت ئەدا لە تیشکەوەو
فەرەنجی سووری درێژت گوڵناری بەری غەزەلی مەراقت بوو.
تۆ ڕەنگت ئەکرد بە دەنگ و
دەنگت ئەکرد بە بینین و
خۆت لە بۆنی (ئەهلی مەعنا) و نزاکانی (تصوف) و
عەشقی گەورەی (سراج الدین) هەڵئەکێشا.
تۆ وردبوونەوەی ئازاربوویت لە ساتە وەختی پشکوتن
شەونخونی دڵۆپەکانی شەونم بووی بەدیار وەنەوزی گەڵاوە

**ڕەنگدانەوەی ژێیەکانی ئاواز بوویت و**

**لەناو یەکێتی وجوددا سەرسام بوونت**

**لەسەر باڵی پەپولەیەك..**

**لەناو زاری خونچەیەکداو**

**لە خاڵی خاڵخاڵۆکەداو**

**لە نیگای عەنبەر خاتووونداو**

**لە بارژنی ئاسکێکداو**

**لە کلاّوی بەڕوویەکدا.. ئەبوون بە شەوی تەماشاو**

**لێکیان ئەدا.**

**تۆ ئەوەندە دیقەت تدا لە ڕووناکیی**

**نامەکانی (ضیاء الدین)**

**تا ڕووناکیت شەیدای گلێنەی خۆت کردو**

**ئەویش ئیتر هەردو بیلبیلەی چاوانتی**

**لە هەوری رۆحدا هەلگرت و**

**بردنی بۆ مەولانەکەی شارەزووریی،.**

**لەدوای کۆچی ئەو دوو چاوەیش**

**تۆ بیناییت گواستبۆوە بۆ دەروون و بۆ هەناوت**

**لەدە پەنجەدا دە چاوو**

**لە جێی دوو چرای ناو سەرت**

**ئیتر شیعر.. شیعر یەك لە دوا یەك ئەهاتن و**

**ئەبون بە چاوو هەتاوت**

**ئەی حەزرەتی هەژارانی تاوەگۆزیّ!**

له هەورامانی شیعرتا

بەفراوی زمان قەڵبەزەی ناو غەزەل و

خەمت کەف چڕێنی ئەوو

له بناری بەیتەکانتا

کارێزی مانا هەڵئەقووڵێ

له هەورامانی ڕوانینتا

سەرنجەکان مانگەشەوو

مەجاز هەورو

وشەت ماڵی پلەپلەی سەر کێوان و

وێنەت هەتاوو سێبەری ناو تەلان و

نوختەت فرمێسکی درەختی هەر دێرێك و

له پایزی کۆستەکانتا هەڵئەوەرێ

ئەتخوێنمەوەو

ئیتر خەیاڵم پڕ ئەبێ له وەنەوشە

تەماشام ئەبێ بەلاولاو

ئەتخوێنمەوەو هەر دوو چاوم

ئەبن بە دوو پەپولەی قەترانی و

ئەمبەنەوە بۆناو ڕۆحی میوانی  تۆ لای پیرەمێرد

ئەمبەنەوە بۆ (سەرشاتە)

ئەتخوێنمەوە و دەنگم پڕ ئەبێ له چنوور.. شیعری فێنك

لێم ئەدات و

قژم گوڵ ئەستێره ئەگرێ و ئەبم بە گەڵای جۆلانە.

وەختێکیش دێمە ناو هۆدەی ئازارتەوە
لەو سەر کێلە، سەرێك ئەدەم، لە دووکەڵی کتێبخانە سوتاوەکەت
ئەوسا ئیتر دڵم تەنگ تەنگ تەنگ تەنگ ئەبێتەوەو
ئەبمە ئاسمانی تەوێڵە
لە سەرشاتەیش بەردێك هەیە هەتا ئێستەیش ساڵی جارێ
لە جێی خۆیەوە هەڵئەسێ و پێئەکەنێ و ئەیکا بە قریوە لێدان
ئەوە ئەو بەردەیە کە مەولەوی کردی بە مێزی بەردەمی و
لە ئێوارەی پایزێکدا شیعرێکی خۆی لەسەر نووسی.
لەو دەڤەرەیش دارێك هەیە هەتا ئێستەیش هەموو ساڵێ
بەدەستی خۆی
لقێکی خۆی ئەسوتێنێ و ڕەحمی ئەکاو
ئەیکا بە پەنگی نێوداران
ئەویش ئەو لقە شومەیە کە مەولەوی
خستە خوارێ.
لەم ساتەیشدا بەخۆم ئەڵێم
نەکەی لقی بەژنی شیعری ئەم هەورامانی ئیشراقە
لەوە زیاتر ڕاوەشێنی
نەبادا خەونی گەلآیەك
لە ناوەختا بزرێنێ و مەولەویمان لێ زویر بێ.
نەکەی هێندە خۆت  نوقمکەیت
لەم دەریاچەی خەڵوەتەدا
نەبادا تەندوورەی شیعرێ

له پڕێکدا ڕاپێچیکاو
بە مەولەویش نەیەیتەدەر!
ئەی مەولەوی!  وەلی شیعرستانی کوردو
ئەی تریفەی نامەی ڕۆح و
ئەی بەندەنی بەفرگرتووی شەوی وشە زیوینەکان
دە ڕەنگم کە بە مانگەشەوی خەیاڵت و
هەندێ جریوەتم بەرێ و
هەندێ گزنگ ڕۆکەرە ناو تاریکیم و
چەند پەپولەیەکی ناو ڕیشت بنێرە بۆ
باخچەکانی تەنیاییم و
بمکە بە زێوانی شیعرت.
تا هیچ نەبێ دەسم بگاتە دامێنی
نوورێك لە نوورەکانی بالأت و
بۆ دواجاریش
لە پلوسکی پڕشنگێکت بخۆمەوەو
سەر بنێمە سەر خەمێکی پەمەییت و
ئینجا بمرم!

# گەڕانەوەی ڕۆژ ژمێرە شوومەکان

بەم کازیوە خۆڵاوییە
بەم بەیانییە ژاکاوە
بەم شەفەقە کەلەلایە
بەم گەردوگوڵی گومانە
"ئیدریسی بەدلیسیی" چێکات؟ کام نەهێنی ئەدوێنێت و؟
بە ئاقاری چ ڕەنگێکی پەژموردەدا تێئەپەڕێو
ئەچێ بۆ کوێ؟!
بەیانییەکی زەردباوەو
بەیانییەکی نەخۆشە
تاقە منارە چاوی خۆی لەناو تەمدا هەڵئەگلۆفێ و
دەرگای مزگەوت باوێشك ئەداو وەختی نوێژە..
وەختی گوناه تەکاندنەو وەختی سەردانی خودایە.
لە ڕۆژهەڵاتی بەردەوە
پڕمەی وڵاخە ماندووەکان،
خیزەی سنگی دارستانە یاخیبوەکان..

**ئەگەنە کوێ، "یەزدان شێر" یش**

**ئەسپە بەردیینەی پێشەنگی قافڵەیەو**

**بەم بەیانییە خۆڵاوییە ئەگاتە تەنگەی دەربەندو**

**هەقی تووڕەی ولاتێکەو ئەحیلێنێ و**

**بەناو خولیای وردوخاشدا ڕێ ئەکات و**

**باوبۆرانێکی هیلاکەو**

**ئارەقەی مۆر دەرئەدات و**

**لە تەوێڵیا گڕێك ئەڕوێ!**

**لە مزگەوتا، وەك کەواکەی، چمکێکی دڵی هەڵئەکات**

**دەستێك بە ڕیشیا ئەهێنێ و گوناهەکان**

**لەگەڵ گەڵای پایزەدا ئەوەرێنە سەر بەردە نوێژ**

**گوناهەکان"با" ئەیانبا بۆ دۆزەخ و**

**لە میحرابێکی سامداردا، لە کڕنووشدا بەیەکەوە:**

**ترسی خوداو، سەوابەکانی بەهەشت و،**

**کەللەسەری"یەزدان شێر" و منارەیەکی تازە ئەبینێ.**

**بەم شەفەقە کەلەلایە**

**بەم کازیوە خۆڵاوییە**

**بەم گەردووگوڵی گومانە**

**"ئیدریسی بەدلیسیی" چێکات؟!**

**کامە نەهێنی ئەدوێنێ و**

**ئەو سوارانەیش ئەچن بۆ کوێ؟!**

**"دیجلە" بەناو"جزیرە"دا بە ڕووت و قوتیی ڕەت ئەبێ**

به ڕاکشانەوە ئەڕواو بە ڕاکشانەوە ئەدوێ و
هەر لەسەر "زین"ی ئاوەوە چاو هەڵئەبڕێ
دیجلە هەموویان ئەبینێ، لەم دیو دیواری ئاوەوە
گوێ لە ڕازەکانی ڕۆخ و گوێ لە نەهێنیی بەدلیسیی و
گوێ لە بانگی هەڵگیرساوی دۆزەخ ئەگرێ.
دیجلە گوێ لە قەدەری ڕووناکیی، گوێ لە چرپەی
مۆمەکانی شەوی عەشق و، گوێ لە ڕەنگ و،
گوێ لە بۆن و، گوێ لە نووزەی دەنکە چەوی
بنیش ئەگرێ. دیجلە نیازی پاك و پیسی
ئاوەڕۆی خۆی لێ ون نابێ لە هاژەیدا بارگەو بنەی
زەمانەکان هەڵئەگرێت و مێژوو ئەکات بەتنۆکی
پرژەکانی و تەنها هەر ئەویش ئەزانێ:
بەم کازیوە خۆڵاوییە، (ئیدریسی بەدلیسی)ی چێکاو
سوارەکانی (یەزدان شێر)یش ئەچن بۆ کوێ؟!
دیجلە ئەڵێ: لاشیپانی "بابی عالی" وا لەسنگی بەدلیسیدا
چاوی سوڵتان وا لە چاوی بەدلیسیدا. هەموو شەوێ بە
تاریکی پەنجەکانی ئەم هەڵئەفڕن بۆ ئەستەموول.
بەتاریکیی، هەموو شەوێ سەڵەواتی و دۆعاکانی ئەبن
بە پۆلێ شەمشەمەو بەسەر مندا وژەیان دێو تێئەپەڕن
دیجلە ئەڵێ: "مانگ"ی خائین وەختێ ئەچێ بۆ ئەستەموول،
خەرمانەی خۆی ئەکا بە تۆڕێکی خڕو
تۆڕ هەڵئەداتە گیانەوەو ئەوین ئەگرێ!

هەموو جارێ "مانگ"ی خائین
تریفەی خۆی ئەکا بە گوارەو گەردانەو بەلاگیرەو
بە ژنەکانی حەرەمی کۆشکی"یەڵدز"ی ئەفرۆشێ.
هەموو جارێ ئەم فەتوایە، ئەبێ بە مشتووی شیرێك و
لە کیفەکەی کەمەر بەندی سوڵتانەوە سەر دەردێنێ
دیجلە ئەڵێ: ماوەیەکە قسەی (ئیدریسی بەدلیسی)
لە بازاڕداو لە مزگەوتا بۆنی لاکی شەوەزەنگ و
بۆنی ناو دەمی قەنارەو
بۆنی چڵکی زەمانێکی پیسیان لێدێ
دیجلە ئەڵێ:
سوارەکانی ڕۆژهەلاتی بەردو زامیش
ئەیانەوێ شاخ بئاژوون
وا بە تەمان، لەسەر قەڵپۆزی زەمانە
هەرچی چراوگی ئەوینی چاوی بەفرە یەکە یەکە دایگیرسێنن
وا بە تەمان لە پاشکۆدا؟"وان" هەڵگرن
بیبەن بۆ دەشتی باشوورو
لەوێشەوە هەر لەسەردەست
"سیروان" بەرەو ژوور بهێنن.
ئەیانەوێ، خۆری لەت و پەتی خۆیان
لەناو مندا کۆکەنەوە وا بە تەمان
مەرگی خۆیان بکەن بە زەنگ
زەنگیش بە ملما هەڵواسن و

لەژێر تەمێکی ئەستووردا
لەژێر شەوێکی ئەستووردا
کیشوەرێ خەبەرکەنەوە
بەم کازیوە خۆلاَوییە
بەم گەردوگوڵی گومانە
(ئیدریسی بەدلیسی) چێکات!؟
کامە نەهێنیی ئەدوێنێ و ئەچێ بۆ کوێ؟!
دارسێوێکی بێوەژنیش
لەپێچە ژانی گردێکی ناو"هەکار"دا
ئەویش وتی:
بەم کازیوە خۆلاَوییە
وا بەدلیسیی سەری مێردە باڵندەکەی من و
هەرچی ئاوازی کوژراومە.. خستونیە ناو
فێستەکانی سوڵتانەوەو لەگەڵ خۆیدا
ماڵ بە ماڵ و گەڕەك گەڕەك ئەیانگێڕێ
بەم شەبەقە کەلەلایە چاوم لێیە:
وا"بەدلیسی" بووە بە"با"یەکی زەردو
پێش غەزەبی شمشێری سوورپۆشی والی و
پێش جەهەننەمی پاداری ئەو کەوتووە،
سەری مێردە باڵندەکەی من و
سەری کچە باڵندەکەی من و
سەری گۆرانیی کوژراوی ئەم باخانەی

**بەیەکەوە لە باوەشی ئەم بەیانییە خۆلاَوییەو**
**ئەم کازیوە ژاکاوەدا هەلگرتووە.**
**قەلاَی (ئەربائیلۆش) ئەلیّ:**
**ئیّستە (ئیدریسی بەدلیسی) نیوەی لەشی لە ئەنقەرە جیّ نیشتەیەو**
**نیوەکەی تری لە (بەغدا) میوانی کۆشکی"مەنصور"ە**
**دەستەکانی لە"سلۆپی" لە مەشجەبی ئۆردویەکدا هەلوَاسراوەو**
**"سەر"یش چەکمەجەی میّزیّکی بازگەی گومرگی خابوورە**
**ئیّستا، (ئیدریسی بەدلیسی) بە ئیّواران لە بالَقۆنی قادسییە**
**کە بەسەر دەشتی ئەنفال و شانزەی مارتدا ئەڕوانیّت و**
**ڕوو لە"T.V"ی مەرگی کۆچ ڕەو ڕوو لە ڤیژەی کەژەکان و**
**ڕوو لە هەلَمی ڕیزە کۆست و ڕوو لە تابووتی پەرلەمان،**
**ڕوو لە دارەمەیتی ئاشتی، بەیەکەوە لەگەلّ قەعقاع**
**قاوەی ڕەسەنی عەرەبی ئەخۆنەوەو بەسەر ئەسپی تکریتەوە**
**سەری کۆیەو سەری حاجی بە نیشانە ئەنیّنەوە.**
**ئیّستە (ئیدریسی بەدلیسی) تۆپچیشە لای"زەعیم صدیق"**
**ئەو ئەتوانیّ، لە سەرشانی مەخمورەوە، لەو دوورەوە**
**ملی باریکی مستەوفی بپیّکیّت و هەورەبانی مالّ بەمالّی**
**شیعرو چیرۆك داگریّتەوە.**
**ئیّستە (ئیدریسی بەدلیسی) سواری زریّ پۆشیش ئەبیّ،**
**ئەو دەبابەی (T.72) لە کەرکوکەوە بۆ هەولیّر ئەئاژویّت و**
**لە ئاسمانیشدا ئەو ئیّستە فڕۆکەوانی کۆپتەرو فڕۆکەوانی ڤانتۆمی**
**سەر باکوورو سەر باشوورە ئیّستە. (ئیدریسی بەدلیسی) هەموو ڕۆژیّ،**

به شقارتەی "نەجم و هیلالی" ئەنقەرە ڕیشی (شێخ سەعی) و (سەی رەزا)
ئەسووتێنێ و جارێکی دی هەر بە نێزە کەی (ئەتاتورك)
گەواڵە هەور ئەکوژێت و بارانی پەڵە سەر ئەبڕێ و بەژنی هەتاو ئەبڕێتەوە
جارێکی دی پەتی سەرۆکی فەرماندەو"ئەبو غرێب"
ئەکاتەوە ملی"شەهاب". ئێستە (ئیدریسی بەدلیسی)
بووە بە مەرگی باڵدارو
بووە بە داڵ بەرزو نزم بەسەر وڵاتی قوربانی و
جەستەی لەت و پەتی مندا ئەخولێتەوە
بەم کازیوە خۆڵاوییە
بەم شەبەقە کەلەلایە
بەم بەیانییە ژاکاوە..
ئەگەر دیجلەش قسە نەکا
دەمی قەڵایش نەیەتە گۆ
گەر دارسێوی بێوەژنیش پێمان نەڵێ..
نە بەردێ ماوە نەیزانێ و
نە چۆلەکەو نە ڕەوەزێ و نە شەقامێ و نە ڕووبارێ
نە پەنجەرەی هیچ ماڵێك و.. نەمنداڵێ
کە ئێستاکە... (ئیدریسی بەدلیسی) چێکاو
بەم بەیانییە خوێناوییە ئەچێ بۆ کوێ؟!

1997/11/6

## سێ لەیەکچوون

تەنیاییم و ڕەگێکی قووڵ.
تەنیاییم و چاوی هەورێ.
تەنیاییم و بنی زەریا، لەیەك ئەچن.
ڕەگ ڕۆئەچێ
تاکوو ئاو ئەدۆزێتەوە.
هەور لەگەڵ خوادا ئەدوێ.
زەریا گەرای بوون دائەنێ و
تەنیایی من: زمانی نوێی مەملەکەتێ!.

# كۆیە و حاجی

لەو شارەدا پیاوێك هەبوو
سەری بەقەد چرایەكی دیواركۆ بوو
كەچی شاخی "هەیبەت سوڵتان"
لەو سەرەدا جێی بوو بۆوە
لەو شارەدا پیاوێك هەبوو
چاوی بەقەد بادەمێك بوو
كەچی دەریاچەی "زرێبار"
لەو چاوەدا جێی بوو بۆوە
لەو شارەدا پیاوێك هەبوو
دڵی هێندەی قۆخێك ئەبوو
كەچی نەخشەی گشت كوردستان
لەو دڵەدا جێی بوو بۆوە
بەڵام ئەوەی هەرگیز هەرگیز
نە لەسەری ئەم پیاوەداو
نە لە چاویاو نە لە دڵیا
قەت جێگەیان نەئەبۆوە:
زرڕەی ترس و گەردی ڕیباو
پەنجە مۆری تاریكیی بوو!.

## نووسین

دڵۆپێ ڕووناکیی

تکایە سەر شەوی مانایەك

مەراقم داگیرساو.. لەبەریا

ئەوینی

تۆم نووسیی

# مۆزارت

**لە گۆشەی ئەوسەری کافتریای سپیدا بەتەنیا دانیشتووی**
**دوو چرای کلاّولار، لەسەر ڕا، لابەلا، ئەتبینن**
**یەکەمیان: لەملەی سەرشانت و**
**خۆرئاوای ناو قژتا**
**غەریبی و گوڵەزەرد.. پێکەوە ئەڕوێنێ و**
**دووەمیش: سەرمێزی بەردەمت پڕئەکا**
**لە شیعری نارنجیی!.**
**"مۆزارت"یش پرووشەی مۆسیقای لە کلووی نۆتەدا**
**بە کاوخۆ هەڵئەفڕێ و.. وا پیانۆ خەریکە بیکاتە کرێوەو**
**کەمانچەیش خەریکە بارێزەی هەناسەی لە ڕۆحتا هەڵبکات.**
**مەلێکی بێ جووتیش، لە تابلۆی شین باوی دیواردا،**
**لەسەرلا، "با"ی لاسار ئەیبات و ناتوانێ ڕاست بفڕێ و**
**پەڕووباڵ گیف گیڤن وەك پەڕی خەیاڵت  و لە خوارێش**
**هەر لەناو تابلۆدا، لە کەنار زیوینی زەریادا، حۆریی ئاو،**
**"کە نیوەی ماسییەو نیوەی ژن" هاتۆتە سەر بەردێ و**

تەماشای ئاویلکەی ئێوارەی  زەمین و تەماشای دواکۆچی
سەدەیەك لە هەڵمی ئازارو سەرابی تۆ ئەكات
لە گۆشەی ئەو سەری کافتریای سپیدا
بە تەنیا دانیشتووی
تۆ بۆخۆت دەوەنی پەپوولەی ڕەشیت و
لە باخچەی ئاوازی بەفریندا دانیشتووی.
گوێ ئەگری لە مۆزارت
لێدانی ژێی دڵی"سەدسالی" : ولاّتی بێوەژن
زریکەی رووبارو، کڕووزەی گەنم و جۆو، کڕووزەی
بەفرو خوێن، ناڵەی گڵ، نووزەی بەرد، قریشکەی
درەخت و تەنیایی.. ئەبیسی.
کە گوێت گرت لە مۆزارت
گوێ ئەگری لە زەریاو لەمەحاڵ
گوێ ئەگری لەو عەشقەی لە کلێپەی"وەجدێکدا"
باوەشی توانەوە بەخوادا ئەکات و
لە کێوی"ئیشراقا"
نووری دەنگ.. ماچ ئەکات!
لە گۆشەی ئەوسەری کافتریای سپیدا بەتەنیا دانیشتووی
هەرهەموو حاسەکان بوون بە گوێ
گوێ ئەگری لە مۆزارت
زەمانی دابڕان.. ئەبینی.
زەمانی دابڕان: لەنمەی بێ هێزو خزاوی

**سەر شووشەی پەنجەرەو،**
**باوێشکی ڕۆژنامەی سەرکورسی و،**
**بازنەی پچڕاوی دووکەڵی جگەرەو،**
**لە سووتووی تەپڵەك و،**
**لە خلتەی فنجان و،**
**زەمانی دابڕان.. لە خۆت و پەنجەت و سەرنجت و بینین و،**
**زەمانی دابڕان.. لە درزی ئاوێنەی شکاوو بالآتا ئەبینی.**
**زەمانی دابڕان.. ئەدوێنی..**
**لە ڕێگەی شمشاڵی دووکەرت و**
**لە ڕێگەی ئەوینی دووکەرت و**
**لە خەونی دووکەرتدا سەدەی نوێ ئەدوێنی.**
**لە گۆشەی ئەوسەری کافتریای سپیدا بەتەنیا دانیشتووی**
**تا مەلی ناو پیانۆ هەڵفڕێ و باڵ لێکداو کۆچ بکا.. تۆ ناڕۆی.**
**تۆ ناڕۆی تا کلووی کەمانچەو پەپوولەی سیمفۆنی بباریٚ.**
**تۆ وەختێ هەڵئەسی کە مۆزارت لە عەشقا سەرخەوێ بشکێنیٚ**
**ئەوساکەیش لە گۆشەی ئەوسەری کافتریای سپیداو لە دوای خۆت**
**خەزانی ئەم شیعرەو، وەسێتی بارانی شاعیرێ.**
**بۆ مۆزارت جێدێڵێ!.**

ستۆکهۆڵم
1999/11/25

## عوسمان عوزێری

کەس نەیزانی ئەو چۆن کوژرا؟!
شایەتی ئێمە بە تەنها:
کۆترە شینکەیەکی شاخ و
پەڵەهەورێکی کۆچەری و
گەڵای شیعرێ بوو"با" بردی!
کەس نەیبینی لە کوێش نێژرا؟!
ئەو چاوانەی لەو شەوەدا،
لەگەڵ چاوی دوارۆژدا بوون و بینیان،
لە کوێ نێژرا!
چاوی درەختێکی تەنیاو
چاوی بەردێکی سەرەڕێ و
چاوی لێڵی کانییەك بوون.
لەو دۆڵەدا
ئیتر مێژویان قفڵداو..
لەو چاڵەیشدا ئەویان تیاکوشت،

**هەر لەوێشدا پرسیاریان کوشت،**

**نەهێنیشیان هەر بە جلی خۆیەوە ناشت.**

**بەلاّم ئێستا**

**یەك کۆترە شینکە.. هەزارە.**

**فرمێسکی یەك پەڵە هەور.. چەند رووبارە.**

**گەلاّ شیعرێ.. چەندین پەنجەرەی ناوشارە**

**مێژویش بوومەلەرزە لێی داوە**

**قفڵ شکاو، نەهێنیی هەر بەو جلانەوە**

**گەڕایەوەو، ئەوەتا وا**

**پرسیار زیندوو ئەبێتەوەو**

**پرسیار زاووزێ ئەکات و**

**هەموو ساڵێ، سەردانەوەی برینەکانی"عوزێر"یش**

**لەسەر هەڵگورد**

**زەردەخەنەی دەم گوڵجارە!**

2000/3/29

# وەڵام

کلاوکوورە
بەشێك لەو خەمەی هەیەتی
لەبەر کڵاوە جوانەکەی، سەرسەرێتی
بەم ڕۆژگارە هەزار باڵندەی بێ کڵاو
لە داخاندا
باڵ لە بوغز وەرئەدەن و
چاویان هەڵنایە بیبینن.
بەشێك لە مەراقی مامز
لەبەر بۆنی خۆشی ئەو مسکەیە لێی دێ
بەم ڕۆژگارە هەزار ئاژەڵی بۆن ناخۆش
لەسەرە ڕێگای ئەویندا.. لێرەو لەوێ.. لە داخاندا
داوە مەرگی بۆ ئەچێنن.
بەشێك لە ئازاری کرمی ئاوریشمینیش
لەبەر قۆزاخەی ئاوریشمە
بەم ڕۆژگارە هەزار کرمی بێ قۆزاخەو هیچ پێ نەبوو

**له داخاندا، ئەچنە ماڵی ئاوریشمەوەو**

**پەردەی ژووری خەونەکانی ئەژاکێنن**

**بەشێك لە ژانی تاڤگەیش**

**لەبەر بەرزیی باڵایەتی**

**بەم ڕۆژگارە هەزار ئاوی کورتە باڵاو تەنکەبوار**

**لە خوارەوە، لە داخاندا**

**ئەچنە سەرشانی کەڵەکی داڕووخاوو**

**بەردی ئێرەیی تێ ئەگرن!**

2000/3/28

# ماك

لەناو ئەم بێشە چڕەدا
من وتم: تەنها درەختێ هەبێ و جوان بێ و
ئەستێرە بۆ دوارۆژ بگرێ... ئەوە منم!
(لەو ڕۆژەوە
شەڕی دارستان هەڵگیرسا!)
لەناو ئەم شاخ و داخەدا
من وتم: تاقە چیایەك هەبێ و سەركەش،
تاقە كەڵێ خۆری هەقی لێوە هەڵبێ،
ئەوە منم!.
(لەو كاتەوە
شەڕی شاخەكان هەڵگیرسا!)
لەناو ئەم ڕەوە ئەسپەدا
من وتم: تاقە ئەسپێكیش هەبێ و رەسەن
حیلەیەكیش هەرگیز نەمرێ.. ئەوە منم!
(لەو دەمەدا

**شەڕی ئەسپەکان هەڵگیرسا!)**
**ئەم خوێنانە پێناچێ بکوژێنەوە**
**تا ئەو ڕۆژەی لەناو سەرما**
**ڕاستیەك دانەگیرسێنم:**
**کە من هەرگیز هەموو جوانی و ڕەنگەکان نیم!**
**کە من هەرگیز هەموو خۆرو شەوقەکان نیم!**
**کە من هەرگیز هەموو ئەسپ و حیلەکان نیم!**

2000/1/4

# ئـــەو

کە تەوقەمان لەگەڵ یەکتریدا ئەکرد
ئەو قەت لە ئێمە نەئەچوو
ئەو ژمارەی پەنجەکانی دەستی ڕاستی
تەنها دووان بوون!
ئەو وەختی خۆی لەسەر باڵای جوانی کەژێ
سیانی بەخشین بە دەستەکانی ئازادیی!.
کە پێکەوە سەیری تابلۆکانمان ئەکرد
ئەو قەت لە ئێمە نەئەچوو
ئەو تاقە یەك چاوی هەبوو
ئەو وەختی خۆی لە شەوگاری ئەوینێکدا
ئەو چاوەیدا بە جێژوانی ڕووناکیی!.
کە پێکەوە ئەڕۆیشتین
ئەو قەت لە ئێمە نەئەچوو
قاچێکی ئەو دارینە بوو
ئەو وەختی خۆی لە ژیانێکی مین ڕێژدا

ئەو قاچەیدا بەڕێ و بانی گوڵ و ئاشتیی!.
ئەو قەت لە ئێمە نەئەچوو
ئەو سێ پەنجەو ئەو چاوێك و
ئەو قاچێکی لە هەر یەکێکمان کەمتر بوو
کەچی وەختێ بەیەکەوە
لەبەر ئاوێنە گەورەکەی وڵاتێکدا ڕائەوەستاین
ئەو لە گشتمان تەواوتر بوو!

2000/2/1

# ماڵەکەمان

ماڵەکەمان، چ ماڵێکی مڕومۆچ و
پەستمان هەیە. ماڵەکەمان!.
حەسارەکان.. ڕووناکییان دەرکردووە.
دەرگای حەوشە.. ڕووخۆشیی کلۆم کردووە.
نە ڕۆژێ هەتاو ئەبێتە میوانمان و
نە شەوێك مانگ سەرێك ئەدا لە پەنجەرەی
سەر ژوورمان و
نە جارێك"با" لە هەیواندا
گۆرانییەکمان بۆ ئەڵێ و
نە باڵدارێك لەلای هەواو
بارانەوە دێ بۆ لامان.
ماڵەکەمان چ ماڵێکی گرژو مۆن و
پەستمان هەیە. ماڵەکەمان!
باوکم. باوکم. ڕیشی باوکم
بووە بە پەردەی پەنجەرەو

بووە بە عەبای درەخت و

بووە بە پەچەی گوڵەکان.

ریشی باوکم بەر دەرکی خەونی گرتووین و

هەورەبان و سەر سەربان و چیمەنمانی داپۆشیوە.. ڕیشی باوکم.

باوکم. باوکم. دەنگی باوکم

لەناو ژووری خوشکەکەمدا،

مقەستێکە ڕائەکشێ و هەڵئەسێت و

لە کەنتۆردا

کراسێکی ئاودامانی تا بەرپێیە

هەموو ڕۆژێ پەناو پەسیری ناوسەرمان ئەپشکنێ و

بۆ مۆسیقای کراسی کورت و بۆ لێوی سووری گۆڤارو

بۆ دەنووکی ئاوازێك و بۆ خەیاڵێکی تەنك و

بۆ نوکتەی قاچاغ ئەگەڕێ!

ماڵەکەمان! چ ماڵێکی مڕومۆچ و پەستمان هەیە. ماڵەکەمان

دارەمەیتی ماڵەکەمان!.

# هەتاو و گۆرانیی و بۆن..

لە"ئۆسلۆ" دیم.
لە ئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە گەڕابۆوەو
لەگەڵ خۆیدا
پڕ باوەشێ خۆرەتاوی هێنابۆوە،
تۆزێکم لێ سەند بۆ چاوم،
تا هەفتەیەك هەردوو چاوم
ڕووناکییان تیا هەڵئەقوڵی.
لە"لەندەن" دیم
لە گەرووی ڕۆژهەڵاتەوە گەڕابۆوەو
چەند گۆرانیی زەردو سووری لەگەڵ خۆیدا
هێنابۆوەو
دووانم لێ وەرگرت بۆ ڕێگام
تا مانگێکیش ئاوارەییم
لە وێستگەکانی سەفەردا سەرچۆپی کێش،
هەڵئەپەڕی.

لە"بەرلین" دیم
لە باخچەی ڕۆژهەڵاتەوە گەڕابۆوەو
لەگەڵ خۆیدا، مشتێ بۆنی هێنابۆوەو
تۆزێکم لێ سەند بۆ شیعرم
تا ئەو وەختەی خۆشم گەڕامەوە لاتان
تەنیایی من هەر لەو بۆنەی هەڵئەمژی!.
"خۆرەتاو.. کۆیی بوو
گۆرانیی.. سابلاّخی و
بۆنەکەیش.. دهۆکیی!"

مارتی/2000

# سۆراخێك

"ئاوێکی ئێجگار غەمگینە"
باڵندەیەك وتی: چونکە
هەموو جارێ هەور ئەگاتە سەر سەری و
کەچی پەشیمان ئەبێتەوە بباریێ!.
شەپۆلێکی لاواز وتی:
نەء پرسەداری ماسییە!..
درەختێکی کەنار وتی: لەو دۆڵەدا
جۆگەیەکی لێ ونبووە
پردێك وتی:
نەء. بەنداوێکی کوژراوە
هەتاو وتی:
سێبەر دڵی تەنگ کردووە.
سێبەر وتی:
سوورە هەتاو نیوەی لەشی کرد بە هەڵم
کیژۆڵەیەکیش وتی نەء..

ئێوە کەستان نەتانزانی

بەر لە چەند ساڵ

ئەنفال بەلایدا تێپەڕی!

# دایکم

دایکم لە شۆڕەبی پایز ڕووتەڵە تر..
لە تاق تاقکەرە تەنیاتر..
لە پەڕەسێلکە هەژارتر.. دایکی منە.
دایکم تاریکە شەو کراسێکی دایەو
گەڵاڕێزان لە بەریکرد.
دار هەنارێکی بێوەژن
جووتێ (پانی بەرزی)دایەو
بارێزەیەکیش لە پێی کرد.
کۆڵوانەکەی تەم داوێتێ و
گێژەڵووکەیش ڕستێ بازن.
ئەو وەختەی دایکی من ئەدوێ
لەمەراقدا
ئاوی وشە شلوێ ئەبێ.
ئەو وەختەی دایکم ئەڕوانێ
لە چاویەوە..

**وردە پەپوولەی قەترانیی باڵ ئەگرن و دێنەدەرێ.**

**ئەوەی هیچی، بە دایکی من، نەبەخشیوە**

**هەر بەتەنها ڕووناکییە**

**دایکم ئەڵێ:**

**من نازانم ئەو لە کوێیەو**

**من نەمدیوە!**

# لەمیترۆدا

هەروا ڕێکەوت لە"میترۆ"دا
یەکتری ئەبینینەوە..
یەکتری ئەناسینەوە
دوو پایزین
بەرامبەر یەکتر دانیشتووین
ڕابووردوو هەڵئە کۆڵین و.. ئیتر دوور دوور
بەناو گوڵجارێکی خەونا
بەیەکەوە ئەچینەوە
بەر بارانێکی بەهاری ڕێی"کانی با"
هەر ئەوەندەو ئیتر قسە
لە دڵۆپی سەر ڕوومەتی هەردووکماندا
ئەخنکێت و
دیسانەوە وەك دووگەڵای نێو خەزانێ
لە یەکتر جوێ ئەبینەوە
هەروا ڕێکەوت لە"میترۆ"دا!

# بــۆن

مەلێ دەنكە تۆوێكی برد
دای بە بەردێ
بەردیش داوای بارانی كرد
باران هات و ماچێكی كرد
لە شوێن ماچدا، گوڵێ پشكووت
لەو بەرەوە دڵدارێ هات، بەرِێوە بوو بۆ جێ ژوان
گوڵەی لە لاسك كردەوەو
دایە دەست یار
یار دای لە قژ
هێندەی نەبرد
مۆردی قژیش شەماڵێكی بزێو بردی و
شار بۆنی خۆشەویستی گرت!

# تـــاڤگه

لەسەر شاخێك ئاوێ دیل بوو
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاوی گیراو
خەمی شینی گەورە ئەبوو
هەتا جارێ خەم تەقیەوەو
ئاوی كۆیلە
دەرگای بەردیینی شكان و
بە گوڕ هات و
لەو بەرزەوە
بازێكی داو
بوو بە تاڤگە!

# ئــەوین

له شەوێکی ڕەشەبادا
دایان بەسەر ژوورەکەتاو
هەرچی دیاری و یادگاری ئەوینمانه
گشتیان دزی:
موستیله، خەون، ملوانکه..
بازن، چرپه، زەردەخەنه.
له عەسرێکی تەماویدا
لەسەر شەقامێکی گشتیی
دەوریان گرتی و
بەدوا شیعری منیشەوه
جانتای دەستیەکەیان بردی
که گیرایشی له زیندانا
نامەو
ماچ و
شووشه عەترو

خۆزگەو وێنەو

دەنگ و سەنگی

هەردووکمانیان هەموو دزیی

بەڵام نە لە ماڵەوە نە

لەسەر شەقام

نە لەناو بەندیخانەدا

نە بە بردن

نە بە گرتن

بۆیان نەکراو نەیانتوانی

ئەوینی ئێمە بدزن!

# ڕەنگ

لەو کێوە
خۆرنشین بە دەستی دارلیمۆی قەدپاڵێ
کاکۆڵی ئێوارەی زەرد زەرد کرد
ئێوارەیش بە پەنجەی پرووشە
بەردێکی ڕەشتاڵەی سپی کرد.
لاوێکیش لەسەر پشت کەوتبوو
بە فوارەی سەرسنگی
ئێوارەو
بەردەکەو
بەفرەکەی
سوور ئەکرد!

# بیـــروڕا

لەسەر"قەڵا"
چۆلەکەیەك
بە پەلکەگیایەکی ئەوت:
ئۆتۆنۆمیی
پەنجە تووتەی درەختێکی
"ڕەحیم ئاوا" ناهێنێت و
کەچی ئێمە باڵای هەزار
دارستانمان
لەسەر سووتان!.

# بۆ ئیسماعیل بێشکچی

داریٚ وتی:
ئێمه ئێستاکه ناتوانین شەقامێکی"دیاربەکر"
بەناوی تۆوه ناو بنێین.
گوڵێ وتی:
ئێمه ئێستاکه ناتوانین باخچەیەکی نێو"قامیشلی"
بەناوی تۆوه ناو بنێین.
شیعریٚ وتی:
ئێمه ئێستاکه ناتوانین کتێبخانەیەکی"سابلاٚخ"
بەناوی تۆوه ناو بنێین.
بەردیٚ وتی
ئێمه ئێستاکه ناتوانین پەیکەرێکت
له سنگی بابەگوڕگوڕدا بۆ داتاشین
دوایی"کوردستان"یش وتی:
ئەوەی ئێستاکه ئێمه ئەتوانین بیکەین
هەر ئەوەیه
وەك گوڵ و شیعرو ئازادیی
له گیانماندا هەڵتگرین!

# نەهێنیی

ڕەنگە ئیتر بۆ لەمەودوا
قەڵەمەکەم بەمە دەست"با"
ئەو لە جێی من شیعر دانێ
ڕەنگە ئیتر بۆ لەمەودوا
هەر تەنها"با"
ناونیشانی:
بەفرو
باران و
بڵێسەی
عیشقی تازەم پێ بزانێ!

# خەونە تاڵەکان

**هەموو خەونێ**

**دەیان هەڵبەستی شەهیدم**

**شوێن پێی قەڵەمم هەڵ ئەگرن**

**لەسەری کۆڵانی دێڕو**

**لەبەر دەرگای وشەکانما یەخەم ئەگرن.**

**لە سەربانی"ناونیشان" و"ژمار"ەوە**

**خڕکە بەردی نوقتەو فاریزەم تێ ئەگرن**

**ئەڵێن: ئێمەت لەبەرچاوی بابەگوڕگوڕ**

**دایە دەست عیشقی ئاگریین**

**کەچی ئەوەتا ئەبینین:**

**لە تازەترین دیوانی چاپکراوتا**

**ئێمەی تیانین!!**

# کە مردووەکانمان گەڕابوونەوە

لەوێ نەبووم کە شەقامی شارەکانم
بووبوون بە ڕووباری هەنگوین بۆ ئازادیی
لاتان نەبووم کە پەنجەرەی
گریاوی هەزار ساڵەی من پێکەنیبوو.
لەوێ نەبووم کە بەرد سوراوی کردبوو.
درەخت بووبوو بە شمشاڵ ژەن.
خانوەکانمان سێ ڕیز سێ ڕیز.. هەڵپەڕیبوون.
لەوێ نەبووم کە سەربەستیی یەکەیەکە
تەوێڵتانی ماچ کردبوو.
لاتان نەبووم ئەو بەیانییەی کە هەموو مردووەکانمان
گەڕابوونەوە ماڵەوە.
دووکەڵ بووبۆوە بە لاولاو
سوتوو بووبۆوە بە لانکە.
هاتبوونەوە ئەستێرەی ڕۆحی کشاو.
لەوێ نەبووم ئەو شەوانەی لە بەزمی بادەنۆشیندا.

**چیاکانمان بەرامبەریەك**

**پێکی مەیی ناو پەرداخی هەوری نزمیان هەڵبڕیبوو**

**لەسەرکەوتنیان نۆشی بوو.**

**لەوێ نەبووم**

**لەوێ بوومایە ئەزانم**

**هەر یەکەم سات**

**خۆیشی بە گەشکەی"قاقا"یەك**

**لە جێگەی خۆمدا ئەیکوشتم!.**

ستۆکهۆڵم
1991 –1989

# ئاماژەی جۆراوجۆر

## 1. کەوتن!

هەموو باڵندەکان ئەمرن
بەڵام هەموو گۆرانیەکان نامرن.
بەڵام دواجار، ئاسمان شەقڤنی فڕینێ و
درەخت دەنوکی خوێندنێ لەیادناکەن:
تفیان لە ئاوێنەی سەری خۆیان..
تفیان لە مێژووی فڕینی خۆیان..
تفیان لە هێلانەی وشەو
ڕەگی زام و
ئەلبوومەکانی ڕابوردووی (باران) و (با) و
عومری خۆیان نەکردبێ!
قسەت ئەکردوو... مردبوویت.
ڕاوەستابوویت و... کەوتبوویت.
چەند چرکەیەك.. ساڵانێکی رۆژ ژمێرتی
بەپەنگ ئەکرد!.
چەند ڕستەیەك.. کتێبخانەی کۆن و نوێتی

بەپەنگ ئەکرد!.
لەو ساتەدا تۆ ئەو نووکی قەڵەمەبووی
دەفتەری خۆت ئەتك ئەکرد!.

## 2. سەردان

دێیتە ژووریٚ
سەر ئەکەی بەناو مەراقما
لەناو ژوورەکەمدا ئەڕوێی.
وشەیەك ئەبیٚ بە تەیرو
لەسەرت ئەنیشێتەوە.
تۆ خەریکی بالاٌ بکەی وەك خەیاڵم و
وشەییش خەریکە بخوێنیٚ و..
لە پڕ دەرگا ئەکەنەوەو
وشە ئەفڕیٚ و
منیش بە ئاگا دێمەوەو
تۆیش ون ئەبی!.

## 3. تەوقە

تەوقەیەك و ئیتر ڕۆیشتی
چەند سەعاتە وا هەست ئەکەم

هەر پێنج پەنجەی دەستی ڕاستم
لە مەچەکم جویٚ بوونەوەو،
بە پێنج ڕییانی ناو شاردا
بوونە پێنج مەلی پرسیارو
بۆ هێلانەی لەپی دەستی تۆ ئەگەڕێن!.
تێبینیەك:
من نازانم ئەگەر ئەوان نەتدۆزنەوە
چۆن بنووسم؟!

## 4. بەخشندە

من ئەزانم ئەگەر دارسێوێکی ئەوین
بێت بۆ لات و سێوێکی خۆیت بداتیٚ
تۆ خۆت نایخۆی
لە بەرۆکتا هەڵیئەگریت هەتا ئەیدەیت
بەمنداڵێکی هەژاری گەڕەکەکەت.
من ئەزانم گەر ڕووبارێکی گەڕیدە
تووشت ببیٚ و پەرداخیٚ ئاوت بداتیٚ
تۆ خۆت هەرگیز نایخۆیتەوەو
ئەیبەیت هەتا ئەیدەیتە دەست
درەختێکی بێوەژنی
تاق و تەنیای گەرمێنەکەت!

من ئەزانم گەر کتێبخانەی خۆرەتاو
کتێبێکی سەر بە چرای تازەی خۆیت پێ ببەخشێ
دوای خوێندنەوەی، لە ناو چاوتا هەڵیئەگری
هەتا ئەیدەیت بە کۆلانێکی تاریکی نێو شارەکەت.
من ئەزانم گەر (با)یەکی یادەوەریی
بەسەردان بێتە ماڵتان و بۆنی شیعرێکمت بۆ بێنێ
تۆ ئەو بۆنە نادەی لە خۆت
لەناو سنگتا هەڵیئەگری
ئەگەڕێی بۆ ئەو شاعیرەی
لە دوا خەونی شیعری خۆیدا
دارسێوێك و منداڵێك و درەختێکی بێوەژنی
تاق و تەنیا ئەبینێت و
لە بەینیاندا ئەبێ بە سێوو بە ئاوو بە کتێب و
بۆ ئایندەی خۆشەویستی دائەگیرسێ.
من ئەزانم تۆ ئەوکاتە بۆنی شیعرم دەرئەهێنی و
لەو شاعیرەی ئەپرژێنی!.

تەمووزی/1999

# له مەملەکەتی کۆترەکاندا

کورتە شانۆنامەیێکی شیعرییە

**گەمەی هەورە برووسکەیە. باران سەر بە کلاّوە**
**ئەباری. پیرەمێردێك کە تەمەنی نزیکی حەفتا**
**ساڵان ئەبێت، کوێرەو گۆچانێکی بە دەستەوەو**
**عەینەکێکی ڕەشی لە چاودایە. بە ژوورەکەدا، ئەکەوێتە**
**هاتوچۆ. دیارە کە زۆر شپرزەیە**
**پیرەمێرد: ئەمڕۆ پانزەهەمینی ڕۆژی**
**چلەیەکی سەخت و شوومە..**
**سەخت بە وێنەی ڕەوەزەکانی تەمەنم و**
**شوومیش وەکو کوندەپەپوی چاوەکانم!**
**ئەمڕۆ پانزەهەمین ڕۆژی**
**چلەیەکی سەخت و شوومە**
**لە دەرەوە.. ڕەهێڵەیە.**
**گوێم لە غەزەبی ئاسمانە،**
**کە بەرۆکی کێو دائەدڕێ.**

گوێم لە تووڕەبوونی بایە
وەختێ قۆچ گیر ئەکا لە بەرد.
لەدەرەوە چەخماخەیەو
لەناو دەروونی منیشدا گێژەڵووکە.
لەدەرەوە گرمەی هەورە
لەناو دەروونی منیشدا گڤەی خەنجەر!
(وچان)
بەر لە چل ساڵ، وەکو ئەمڕۆ، لە زستانێکی وادا بوو
خەنجەرەکەم هەتا مشتوو لە سنگی خوشکێکی خۆمدا
داچەقاندو، کردم بە کێلی هەناسەی.
خەنجەرەکەم ڕاداو وەرداو کەڵە پشکۆی
تۆڵەیەکم لەو خوێنەدا کوژانەوە.
وەك بەفریش ساردم کردەوە.
بەر لە چل ساڵ تاقە مامزی ماڵی خۆم
بێ دەربەستانە سەربڕی و هەڵمدایە
ناو توونەکەی هەناومەوە
(وچان)
هەر لە ڕۆژێکی وادا بوو
چەخماخە ئەبریقایەوەو
ئەی وت: وەختێتی بیکوژە!
گرمە ژن و باسریشك و تۆفان ئەیانوت: بیکوژە!
لە گۆڕەوە.. کامە سەری باپیرانم

هاواریان ئەکرد: بیکوژە!

(وچان)

لەوانەیە ئەگەر هەوا

شین باوێکی ئاران بوایە.. نەمکوشتایە!

لەوانەبوو ئەگەر هەتاو لە کلاَوەی بنمیچەوە

بە هێووری تیریژەکەی بناردایە ناو ژوورەکەم

نەمکوشتایە!

(وچان)

ئەم کوشتنە، بۆ شتنەوەی پەڵەی عاری

سەر تەوێڵی پیاوەتیم بوو..

لەبەر سمێڵی باپیران..

لەبەر پەندە بەردینەکانی ڕەوشت بوو

لەبەر نەشکانی ئاوێنە دێرینەکان.

هەر لەبەر پەیڤی هەر لەبەر پەیڤی سەر زاران

تەنها لەبەرقسەوقسە

ئەم نەفرەتەم کرد بە کفنی سووری (شەم)و

سەری خۆیشم دایە دەستی پیرە شەیتان..

سەری خۆم کرد بە سێبەری مەرگێکی دڕ.

هەر لەبەر قسەی سەر زاران

کە ئەیانوت: (شەم)ی خوشکت..

هەڵفڕیوەو بووە بە کۆترێکی ماڵیی

نێو دەستەکانی (کاکە لاو).

به جووته‌یش هه‌ردوو بینراون له جیّ ژوان..
هه‌ر ئه‌یانوت و ئه‌یانوت..
ده‌نگ و تارمایی شه‌م: له‌گه‌لّ باراندا من کوژراوم.
من له به‌فری تازه باریو
پاکتر بووم و له نمه‌ی شه‌ونمیش ڕوونتر
پیره‌میّرد: هه‌ر له‌به‌ر قسه‌ی سه‌ر زاران
من (شه‌م)م کرد به خۆراکی خه‌نجه‌ریّك و
من خۆیشم کوشت.
هه‌ر له‌به‌ر قسه‌ی سه‌رزاران
ئه‌و قسانه‌ی دوای چل سالّیش
جیّی په‌نجه‌یه‌کیان دیار نییه.
ئه‌و قسانه‌ی نه ڕه‌نگیان بوو نه ناونیشان.
شه‌م: من له‌گه‌لّ ئه‌ویندا کوژرام.
هه‌ر له ڕۆژیّکی وادا بوو
له ناو چه‌خماخه‌ی خه‌نجه‌رداو
له‌ناو گرمه‌ی خویّندا کوژرام.
کاکه لاو: من خۆم ڕنۆ به‌فری گه‌لیی و
عه‌شقیش بوو بوو به ئاگردان له‌ناو له‌شما
خودا بۆ خۆی، به ده‌ستی خۆی
نووری (شه‌م)ی ڕژاندبووه ناو دلّمه‌وه.
من ئه‌شکه‌وت بوم ئه‌و چرا
به‌لاّم (شه‌م) خۆی هه‌ر دووراو دوور، ئه‌یسوتاندم

من هەر بە زاری ڕوانینم
لەو گەردن و لەو بەرسنگەم ئەخواردەوە
من هەر بەچاو ئەو ئەوینەم هەڵئەکەندو
هەتا کوشتیان
تا وشکیان کرد
دەمی خۆزگەم نەگەیشتە ئاو!
شەم: (کاکە لاو) بۆ من ئەستێرەی پێش نووستن بوو
لە ناو هەوری ژێر لێفەدا ئەیکردمە خەو.
بەس لە خەودا من مامزو
من جریوەی باوەشی بووم
بەس لە خەودا
من لەبەر خەون کوژراوم!
پیرەمێرد: هەر لە ڕۆژێکی وا شوومدا
ئەستێرەیەکم سەربڕی و
هەتاوی ماڵەکەی خۆم کوشت!.
خۆیشم سەری خۆم دایە دەس
(با)یەکی شوومی وەك ئەمڕۆو
ئیتر ڕامکرد
من هەڵاتم!
ژنی (1): من کوژراوی (شەم)م دی
لە ژوورەوە وەك نووستبێ
لە گوڵجاڕی خوێنی خۆیدا ڕاکشابوو.

ژنی (2): من (کاکی)م دی

وەختێ ڕایکرد..

لە گژەبایەکی بۆری تووڕەو

لە کەلێکی قۆچ خوێناوی ماندوو ئەچوو!

شەم، من نازانم بۆچی کوژرام!

من کانیی بووم.

من سەمەلی گوڵەگەنم و

من تریفەی مانگەشەو بووم.

بۆچی کوژرام؟

من نازانم!

پیرەمێرد: من ڕامکردو

من هەڵاتم

لەگەڵ سێبەری مەرگدا من هەڵاتم

لەتەك دووکەڵێکدا ڕۆیشتم

کە لە کەللەی خۆم هەڵئەسا.

هەر ڕامکردوو

تا گەیشتمە گوندی (بووبان)

(وچان)

ئەبوو ڕاکەم، ئەبوو تارمایی خوێناویم جێبێڵم

ئەبوو ڕووبکەمە تاریکی بێ ناونیشان

ئەبوو بچمە ناو دووتوێی شەوەزەنگەوە

گوناهەکەی خۆم حەشاردەم

**خەنجەرەکەم لەناو تەمدا بشارمەوە**

**ئەبوو لە ڕابوردووم هەڵبێم**

**لەناوی خۆم، لە دەنگی خۆم، لە ڕەنگی خۆم..**

**ئەبوو هەڵبێم**

**هەر لە ڕۆژێکی وادا بوو**

**کە هەلاٚتم**

**ژنی (1): وەرزێکی تر**

**وەختێ ئاسمان ڕەهێڵەو تۆفی گرتەوە**

**وەختێ هاتینە بەر دەرگاو هەڵترووشکاین**

**کە (مانگ) لە گەرمێن هاتەوەو**

**سەیرمان کرد**

**(شەم) منداڵی تریفە بوو لە باوەشیا.**

**ژنی (2): کەس نەیزانی گژەبای بۆر**

**سەری بەرەو کوێ هەلگرت و**

**کەس نەیزانی ئەو نەفرەتە خوێناوییە**

**لەکام شوێندا خۆی شاردەوە.**

**شەم: بۆچی کوژرام؟ من نازانم!**

**هەر لە ڕۆژێکی وادا بوو**

**منی هەتاو کەوتمە بەر ڕێژنەی خەنجەر.**

**لەو ڕۆژەوە خوێنم بووە بە تارمایی**

**ترس و بیمی براکەم و لێی ناگەڕێ.**

**لەو رۆژەوە خوێنم چنگی توتڕکێکەو**

وا لەسەر ملی براکەم
لەو ساتەوە ڕۆحم بووە
بەسێبەری شپرزەیی براکەم و
لێی ناگەڕێ!
پیرەمێرد: زۆر دەمێکە
من دار ژەقنەبووتی کوێرم و پەل ئەکوتم..
من تەنها یەك وەرز ئەبینم.
من تەنها یەك ڕەنگ ئەبینم.
ڕەنگ و وەرزی تاریکستان!
من چۆن کوێر بووم؟!
من نە کوێری نەخۆشیم و
من نە کوێری زگماکم و
نە کوێر بووی دەستی هیچ کەسێ!
لە بیرەوەری مێژوویشدا
چیرۆکێکی کوێربوون نییە
لەم چیرۆکەی چاوم بچێ!
شەم: بیگێڕەوە تۆ چۆن کوێر بووی؟!
بیگێڕەوە چی ئەو چرای چاوانەی تۆی
کوژانەوە؟!..
خوێنی ڕووناکیی بۆ رژا؟!
پیرەمێرد: لە (بووبان)ی ناو کێواندا
چوون داڵێکی پەڕەوازەی شەکەت

به دوو باڵی شکاوەوە.. گیرسامەوە!

لە (بووبان)ی ناو کێوانداو

لە نێوانی تاشە بەردو گەوەکاندا

نەهێنی زەردو خەنجەرو

خوێنی (شەم)یشم شاردەوە!

لە (بووبان)ی ناو کێواندا

بووم بە سەپانی کوێخای (دێ)

من ڕۆژانە عارەقێکی شین و مۆر بووم.

من خوێنی شەم گرتبوومی

بۆیە هەمیشەو بەردەوام

ئەستێرکێکی شلوێ و مات بووم.

بێدەنگ.. بێدەنگ.. وەك دارو بەرد.

بێدەنگ.. بێدەنگ.. وەکوو تاوانی پشت پەردە

چوون قولایی بنی ئەشکەوت!

ئێوارەیەك کوێخا بانگی کردمە لای خۆی

هەر خۆم و خۆی..

(وچان.. گەڕانەوە بۆ چل ساڵ لەمەوبەر)

کوێخا: ئەوە مانگێکە تۆ لێرەی

نانی بووبان و من ئەخۆی!

بەلام کە تەماشات ئەکەم

سرێك لە چاوتا ئەبینم

ئێجگار قوڵەو ئێجگار مەنگە

وەكو بنی نەبێ  وایە
سرێك لەو چاوانەدایە.. ئەڵێی:
بریسكەی چاوانی دڕندەیەكی كێوییەو
لە شەودا ئەدرەوشێتەوە!
تۆ كێیت و ڕاستی خۆت بڵێ
ئەگینا لەم بووبانەدا
جێی سەری تۆ نابێتەوە!
(وچان)
پیرەمێرد: سەرەتا ویستم هیچ نەڵێم...
ویستم لە پەنا درۆدا خۆم حەشاربەم
كوێخا وێڵكەم..
بەڵام بێ سوود بوو تەقەللای قسەكانم
من ناچار بووم پەردە لەسەر
خوێنی (شەم)و رابوردووی خۆم هەڵبەمەوە
من ناچار بووم.. پەلی نەهێنی بگرم و
لە قوڵایی دەروونمەوە ڕایكێشمە بەر
دەمی كوێخا!
ئەوسا چیرۆكی خوێناویم
لە نووكەوە گێڕایەوە
لە دواییدا كوێخا وتی:
كوێخا: ئاوا! ئاوا!
دوودڵ مەبە!... تۆ پیاوی پیاو!

تۆ شەرەفت پاراستووە.. تۆ قەڵغانی.

دەستت سەوزە.. ناموست کڕیوەتەوە..

دوودڵ مەبە! ئەی خەنجەر بۆ دروست بووە؟!

پیرەمێرد: لەو ڕۆژەوە وەك خەنجەری

بەر پشتێنەکەی کوێخا خۆی

وەکو تەزبیحەکەی دەستی

نزیکتر لە قلیانەکەی

لە کوێخا نزیك کەوتمەوە

بووم بە سێبەرو یاوەری!

شەم: بەڵام منت بیر نەچۆوە

خوێنەکەی من شەوانە هەر لە گەڵتابوو

لەناو گیانتا بە وێنەی باهۆزی ئەمڕۆ ئەیزریکان!

خوێنەکەی من دوای هەزاران جار شتنی

لەدەست و پلت نەبۆوە

بە دەروونتەوە لکابوو

بەبێ دەنگی و ماتیتەوە هەر لکابوو

بەفری ساڵ هات

بەفری ساڵ ڕۆیشت

خوێنەکەی من بەفری سوور بوو

هەر نەچۆوە.

پیرمێرد: نەء... نەچۆوە!

لەوەیش زیاتر هەموو ڕۆژێ

**لە دەروونما تۆختڕو تۆختر ئەبۆوە**

**نەء... نەچۆوە!**

**شەم: بەردەوام بە**

**چیرۆکەکەت بگێڕەوە بۆ ئەو خەڵکە؟!**

**تۆ چۆن کوێر بوویت؟**

**پیرەمێرد: بە ئەندازەی سەرینەکەی**

**لێی نزیك بووم!**

**بوو بووم بە نهێنیی.. کرِی**

**ناو سنوقە بۆراقەکەی ژووری کوێخا.**

**ڕۆژێکی تر کوێخا بانگی کردمە لای خۆی**

**هەر خۆم و خۆی**

**کەسی تر نا**

**کوێخا وتی:**

**کوێخا: لە ماهیەکانی (بووبان) داو**

**لە دەراڵی کێوەکاندا**

**شاخی کۆنە کۆتر هەیە**

**لەم شاخەداو لە هەناویا**

**هەزاران کۆتری سپی و شین و**

**مۆرو سەوزو زەردی تیایە.**

**گمە پەنگی خواردۆتەوە.**

**زۆر دەمێکە داخ لە دڵی ئەم کۆترانەم**

**ئەم کۆترانە بەوە نابێ بە ڕواڵەت**

وا ناسك و ئێسك سووكن..
ئەم كۆترانە لە دەنووكدا ژەهری مەرگی
پەتایەكی كوشندەیان هەڵگرتووە
پەتای كوشندەی گەنم و جۆ
پەتا بۆ ڕەزو بۆ باخ و كێڵگەكانم
هەمووساڵێ لەم وەرزەدا
ئەم كۆترانە
پۆل پۆل دێن و
چاوی شینایی و بژوێنم دەرئەهێنن.
دێن و گلێنەی بووبان و منداڵەكانی
من ئەخۆن
ئەم كۆترانە باڵی شوومی ئەم ئاسمانەن.
هەموو ساڵێ لەم كونەوە دێنە دەرێ و
خەرمانەكانم قڕئەكەن!
(وچان)
منداڵی (1): ئەو كۆترانە
كۆتری ناو سەری ئێمەن و
ئەو شاخانەیش جێگە خەونی
زەردو سورمان.
منداڵی (2): ئەو كۆترانە بە دەنووك چڵە ئاوازو
بە دەنووك گەڵای ڕووناكی و
بە دەنووك تاڵە ئەوینی

قژی (شەم)مان بۆ ئەهێنن.

(وچان)

پیرەمێرد: ئەی من چی بکەم؟!

ئەبێ هەر لە ناو هەناوی شاخەکاندا

هەر لەناو کونە ژەهردا

یەکەیەکە... بیاندەینە دەست چەقۆی خۆ

ڕێگانییە.. ئەمە تەنها چارەیەکە

ئەم ولأتە لەو ژەهرانە پاککاتەوە

ڕێگانیە.. ئەمە نەبێ..

گوێم لێبگرە!

بەرەبەیانی سبەینێ

پێش کازیوە..

پێش ئەوەی شاخ لە خەو هەستێ.

هەر خۆم و خۆت

بەرەو شاخی کونە کۆتر..

ڕێ بگرین و ئێمەیش بفڕین!

شەم: ئەو کۆترانەش لە من ئەچوون

ڕۆحی من و ڕۆحی کۆتر

هەر یەك ڕۆحەو

بەردەوامیش بەیەکەوە ئەگمێنن.

بیگێڕەوە.. چیرۆکەکەت بگێڕەوە!

تۆ چۆن کوێر بووی؟!

(وچان)

کاکە لاو: من کۆترێ وا لە سنگما

گمەی ئەو و خورپەی دڵم

بەیەکەوە دەنگیان دێت و تێکەڵ بوون و

من نازانم چۆنیان لەیەك جیاکەمەوە؟!

(وچان)

پیرەمێرد: بۆ سبەینێ هەر شەوەکی

وەختێ کە بەرپێت نەبینی و

هەر لە تاریکی هەڵنووتی

من و کوێخا کەوتینە ڕێ

بەسەر دانە بەردی شاخداو بە ڕەوەزدا

وەك دوو بەران

هەر هەلگەڕاین و هەلگەڕاین..

شەم: بەڵام سەرە بڕراوەکەم لە گەڵتا بوو

ئەویش لە کۆڵە پشتتا بوو

دەنگی خوێنم.. لە هەناسەو گەرووتا بوو

تەواویکە چیرۆکەکەت

تۆ چۆن کوێر بووی؟!

پیرەمێرد: کۆڵەپشتم هەر بە تەنها

ڕەشماڵێك و گوریسێك و

تێلاّیەکی زۆر درێژبوو..

شەوەکی بوو..

هەر هەڵگەڕاین و هەڵگەڕاین

لە دوو بزنە کێوی ڕەشی سەرسەخت ئەچووین.

لە ڕۆژێکی وادا نەبوو

ئاسمان وەك ئەمڕۆ شێت نەبوو

(با) شەرمنۆك.. زۆر هێورو لەسەرخۆ بوو

شاخ و داخیش هەر نووستبوون.

هەر هەڵزناین و هەڵزناین!

شەم: بەڵام خوێنم ئەستێرە بوو

چاوی لە چاوت بڕیبوو

سوور سوور بەوێنەی یاقووتێ

لەو بەرزەوە ئەیجریوان!.

پیرەمێرد: منیش ئەمدیی

ئەو ئەستێرە خوێناویەم ئەدیی

لەو کاتەدا

کەروێشکێك بووم و ئەترسام!

ژنی (1): وەك مێخەك بەند

خۆشەویستی (شەم)م

کردۆتە مل!

هەموو ڕۆژێ بۆنی ئەکەم!

ژنی (2): کە مانگ هەڵدێ..

لەبەر دەرگا هەڵئەتروکێم.

لە کەژاوەی خەرمانەدا شەم ئەبینم
بە کەناری ڕووبارێکی مەیلەو ئاڵدا تێئەپەڕێ!
(وچان)
شەم: تەواویکە چیرۆکەکەت
بیگێڕەوە تۆ چۆن کوێر بوویت؟!
پیرەمێرد: بەر لەوەی کازیوە بێت و
پووشی زیوین و تاریکی لە یەکتری جیاکاتەوە.
گەیشتینە کونە کۆتر
گەیشتینە سەر ترۆپکی
شاخی شینی کونەکۆتر
گەیشتینە بەردەمی کون
کونێکی خڕ ئەوەندەی دەمی تەندووری
گەیشتین و کوێخا وتی:

کوێخا: ئەمە کونی بەلاَکان. کونی مەرگ و کونە کۆتر، ئا لێرەوە دێنە دەرێ و هەر بە دەنووك پەتا ئەبەن بۆ ئاوایی ئا لێرەدا دێنە دەرێ و هەر لەسەر باڵ ژەهر ئەبەن بۆ ناو (بووبان). ئێستەیش وەکو هەموو رۆژێکی تر، وەختێ کە هەتاو ئەگەوێو، تیشك بە پلیکەی بەرددا، ئەڕوا ئەڕواو ئەیدا لە هەناوی شاخ و ئەیدا لە چاوانی کۆتر. ئەوسا ئیتر بەرەو سەروو، بەرەو ئەم پەنجەرەی شاخە، کە هەر تاقە پەنجەرەیە، پۆل پۆل، پۆل، پۆل باڵ ئەگرن و دێنە دەرێ. وا وەختێتی، لە سەردەمی کونەکۆتر، ئەم رەشماڵە هەڵبدەین و بیکەین بە ژووری مردن و، بیکەین بە زیندان بۆ ئەوان، من لێرەداو، لەبەردەمی

کونەکۆترا ڕائەوەستم وەك ملەی شاخ. تا هەر وەختێ یەکە یەکە هاتنە دەرێ. بیانگرم و لە تۆڵەی گوندی بووباندا ئەو بەلاّیانە سەربڕم. تۆیش بە گوریسی دوو لانەی لە ڕکی بەرد قایمکراو، لەناو قەدتا شەتەك دراو، ئەچیتە خوار. لە هەناوی پیرەشاخدا بەم تێلاّیە، بەرەو پەنجەرەی کەللەی شاخ دوا کۆتریان هەڵ ئەفڕێنی. تێگەیشتی؟!

شەم: من ئەوکاتە ڕۆحم لەناو

کونە شاخدا هەر گمەی بوو

منیش ئەوکاتە کۆتر بووم.

منداڵی (1): لە خەوما منیش ئەبم بە کۆتر

هەموو جارێ بە دەنووك گوڵێ هەڵئەگرم

ئەچم و ئەیبەم، ئەچم ئەیدەم

لە قژی (شەم)!

منداڵی (2): جووتێ کۆتری هاقووم هەیە..

هێلانەیان هەردوو دەستمە!.

(وچان)

پیرەمێرد: لە کازیوەدا ئامادەو، گوریسم توند کرد لە بازووی گاشە بەردو تێلاّکەم گرت بە دەستمەوەو لە کلۆری بەردینەوە، بۆ ڕاوکردن، چوومە خوارێ و، شۆڕبوومەوە: هەناوی شاخێکی گەورە، بۆشاییەك لە مەرگی قووڵ بۆنی تیژی گۆگردێکی تەڕو شێدار. هەر داچووم و شۆڕبوومەوە.

شەم: بەلاّم ڕۆحی منیش لەوێ

وەك باڵەفڕێی کۆترەکان

شەقزنی بوو. بەلام خوێنی منیش لەوێ
لە هەناوی ئەو شاخەدا، سێبەرت بوو.
تۆ چاوێکت هەر لێوەی بوو. بیگێڕەوە
تۆ چۆن کوێر بووی؟!

پیرەمێرد: سەرەتا هەزاران کۆتری سپی و شین و مۆری
هەڵنیشتووم دی. کە سەریان خستبووە ژێر باڵ،
هێشتا خەویان.. بە سامالەوە ئەبینی.
بێ دەنگیەکی سامدار بوو.
بێ دەنگیەك قوڵ بە وێنەی هەناوی شاخ

شەم: قسەی کوێخا، خەنجەرەکەی سەر دڵی من
هەر یەك قسەن. هەسانیشیان یەك هەسانە.
کۆتر کۆترەو، ئەوینیش تەنها ئەوینە،
ڕقیش.. ڕقە!.

پیرەمێرد: کە هەتاو هاتە ژوورەوە هەزار تیرێژی
ڕەنگاوڕەنگ لە هەناوی ئەم شاخەدا بوون بە بارانی مرواری و
بەسەر ولاتی کۆترو بەرددا بارین، کە هەتاو هاتە ژوورەوە
کۆترەکان چاویان کردەوە، وەك پێی بڵێین: بەخێرهاتی!. من لە
ئاسمانی بەردیندا لە هەوادا ڕاوەستابووم. چاوەڕوانی ئەم ساتە
بووم پۆلە کۆتر بەرەو کونی کەللەی چیا، بەرەو پەنجەرەی
خۆرەتاو باڵیان گرت و منیش کەوتمە دار ڕاوەشان بە چوار دەورا
تێلام وەشان، دەنگدانەوەی گڤەی دارو دەنگدانەوەی شەقەی باڵ و
دەنگدانەوەی گمەگمی ناو مەملەکەتی کۆترەکان، گرمەگرمی

هەوری بەدو لە سەرەوەیش بانگی کوێخاو ڤیژەی کوێخا هەموو
ئەچوون بە ناویەکدا. منیش لەناو ئاسمانی بەریندا، هەر
دارەکەم ڕائەوەشان!

شەم: لەو کاتەدا من بە چاوی ڕۆح ئەمبینی
خوێنی چەندین کۆترت ڕژان.
من بە چاوی ڕۆح ئەمبینی
چۆن دارەکەت سوور هەلگەڕا..
من بەچاوی دڵ ئەمبینی.. جارێکی تر
خوێنی من و کۆترت
تێکەڵ کردەوە بەیەکتر!.
لەوکاتەدا من بەچاوی ڕۆح ئەمبینی
باڵی کۆتر باسکی من و
چاوەکانیان چاوی من بوون!.

کاکە لاو: هەموو جارێ من بەچاوی ڕۆح ئەیبینم
(شەم)یش بۆتە تیتروسکی و
خۆی هەڵئەکێشێ لە چەمی عاشقان و
ئەوسا بەرەو لای من ئەفڕێ!.
(وچان)

پیرەمێرد: من بەردەوام
هەر دارەکەم ڕائەوەشان
پۆلە کۆتر تەواو نەبوون. چەندیان مردن. چەندیان کەوتن. تەواو
نەبوون. ئەم کونە شاخە پایتەختی مەملەکەتی کۆترەکانە. ناو ئەم

هەناوی بەردانە شارە گمەو شارە خوێندنی ئەوانە هەزاران پۆل بەدوای یەکدا ئەهاتن و، شەقژن، بووبوو بە ڕەشەبا جەستەی منیش بەنێوانی سەرو خواردا هەڵواسرابوو. هەر ئەهاتن و ئەکەوتن و هەڵ ئەفڕین و ئەهاتنەوەو ئەکەوتنەوەو من لێم ئەدان...

ئەهاتنەوە.. ئەکەوتنەوە.. لەیەك ساتدا سەدان دەنووك وەكوو بارانی دەرزیی بێ یان ڕەهێڵەی نووکە نەشتەر بەسەر جەستەمدا ئەباری و لەدەم و چاوما ئەباری و.. بێژەنگێکی ئاگر بووم و هەڵواسرابووم

شەم: لەو ساتەدا رۆحی منیش

بوو بوو بە کۆترێکی سپی

کونە کۆترو کەوتبووە سەر شنەی خەندە

ڕۆحی منیش لە خۆشیاندا

بوو بە گەڵای دەم (با)یەکی

ئەو کێوانەو کەوتە سەما!

ژنی (1): بە یادی ئەو!

دارسنەوبەری حەوشەمان..

ناو ناوە (شەم)..

ژنی (2): بە یادی ئەو

هەموو ساڵێ جارێ..

مانگی چواردە دێتە سەر (کەل)ەکەی ئەوبەر.

تۆزێك ئەگری و لە پرێکدا ئاوا ئەبێ!.

(وچان)

**پیرەمێرد: بارانی دەرزی و**

**ڕەهێڵەی نووکە نەشتەر**

**بەسەر مندا هەر ئەبارێ و هەتا ئەهات**

**زیادی ئەکرد، شەستی ئەکرد..**

**دەمامکی دەم و چاوی هەڵبەستراوم**

**پەڕۆیەکی ونجڕ ونجڕ.. جلەکانم..**

**هەموو ئەندامێکی جەستەم کەوتنە بەر نووکی دەنووکی**

**وەکوو پەنگر. لە ڕوخسارما، لە چاوانما**

**ئازار بروسکەی دایەوەو بارانی خوێنم داباری و**

**هەردوو بیلبیلەی چاوانم هەڵکۆڵران و**

**هەڵوەرینە قوڵایی ناو مەملەکەتی کونە کۆتر**

**ئاوا کوێربووم.**

"بێ پێشەکی و یەکسەر لە دارِژانی ڕەنگەکانەوە"

ئەم ئێوارەیە وا هاتووم..

لێرە ببم بە شمشاڵ و ڕەنگ بژەنم..

ڕەنگ.. ڕەنگ.. ڕەنگ.. ڕەنگ..
کێ ئەتوانێ ڕەنگ بژەنێ؟!.. من ئەیژەنم!
وەختێ فوو ئەکەم بە ((زەرد))دا گێژەڵووکەی زەردە پەڕێ
لەناو ڕۆحما هەڵئەکات و
گەواڵەیەکی زەردەڵەو ماڵئاوایی ڕەوتینێکی* ئەم پایزە
ئەمکا بە کاژەی* پێدەشت
بە ڕێڕەوێ لەباخی گشتیی خەمتاندا و
وردە وردە دامئەپۆشێ.
کێ ئەتوانێ ڕەنگ بژەنێ؟! من ئەیژەنم
ئەو دەمەی سپی ئەژەنم..هەر پەپوولەی سپیی خەونەو،
هەر نەورەسی سپیی شیعرەو..هەر حەیرانی بەفرانبارەو
هەر منداڵیی‌و کلووی یەکەم دڵدارییەو
بەسەرمندا دێنەخوارێ..!
ئەم ئێوارەیە وا هاتووم..
لێرە ببمە باڵەبان‌و ڕەنگ بژەنم
کێ ئەتوانێ ڕەنگ بژەنێ؟! من ئەیژەنم
وەختێ فوو ئەکەم بەڕەشدا، ڕووباری ڕەشی زوخاوێ
ئەهەژێت‌و شەپۆلی کوێر خۆی ئەکێشێ بەکەناری شەوی منداو
تەم‌و مژی کێوە ڕەشێ، لە هەردوو قاچی کۆچمەوە
تا سەروملی زایەڵەم دائەگرێت و لە دەراڵی تەنگەبەری

* ڕەوتین: خەزان‌و گەڵاڕێزان
* کاژە: بنەی بەجێماوی کاروان لە پێدەشتدا

هەناسەیشما، ڕەشەبایەك، ((با))یەکی رەش،
بەگڤەگڤی پرسیارو سۆراخەوە  دێت و ئەچێ.
ئەو وەختەی کە ڕەش ئەژەنم
سەرپۆشی ڕەشی ژنانی شیعرستانم و گوڵی ڕەشی
کچەکانی و بسکی درێژی شیوەنی زستانێکم تێ ئەئاڵێ!.
ڕەنگ.. ڕەنگ.. ڕەنگ.. ڕەنگ..
وەختێ پەمەیی بژەنم.. لەپاش تۆزێ ئەبم بەسوور
هەر وەختێکیش سوورم ژەنی
من ئیتر بووم بەزارگەلیی ئەو مێژووەی
دەنکە دەنکەی تەرزەی سوورو، نمە نمەی ژانی سوورو،
وشە وشەی دەنگی سورو، من هەلاڵەم تیا ئەبارێ.
ڕەنگ.. ڕەنگ.. ڕەنگ.. ڕەنگ..
من بەیەك ڕەنگ، یەك درەختم کرد بە دۆستم
((ڕەهەندێکیش بوو بە مەودا بۆ ڕوانینم))
من بە دوو ڕەنگ، دوو باڵندەم هێنایە ناو هەڵبەستمەوە
((دوو ئاسۆگەیش بوون بە مەراق بۆ فڕینم))
من بەسێ ڕەنگ سێ پەنجەرەم لەسەر خەیاڵم کردەوە
((ئەوسایش هەر سێ پێشانگا بوون،
بەسێ گۆشەی ورشە ورشکەر بۆ ئەوینم))
من بەچوار ڕەنگ.. من بە پێنج ڕەنگ
چوار کتێب و چوار قەوانم
کرد بە ئاشنای هەردوو چاوو هەردوو گوێچکەو

هەردوو دەستم

((هتدو.. هتدو.. هتد))

بەلاّم من بە گشت ڕەنگەكان

باخچەیەكم كرد بەدۆست و بەهاودەم و

هەزار باڵندەم هێنایە هەڵبەستمەوەو

هەزار ئاوازم پڕانە ناو گوێمەوە

ئیتر ئەوسا..هەموو زەمین..بوو بە كەژاوەی تەماشاو

بوو بەڕەنگدانی بەر دەسم و خەیاڵیشم بوو بە فەزاو..

ئیتر ئەوسا.. من لێرەوە.. قاڕەی پێست ڕەش و

پێست زەردوو.. قاڕەی سپی و سەوزو سوورم

یەك یەك دووان.

چیرۆكی ڕەنگ بووە بە چیرۆكی دیدەم

"یەك یەكتری ئەخوێننەوە"

منداڵیی ڕەنگ... بووە بە منداڵیی ووشەم

((یەك لە ناو یەكدا ئەبارن و

یەك یەكتری ئەنووسنەوە))

ئازایی ڕەنگ، هاواری ڕەنگ، شۆڕشی ڕەنگ

بوون بە باوكم..

((ئەگیرێن و كۆت ئەكرێن و ڕائەپەڕن و

ناچەمێنەوە لە بەردەم ڕەشەبادا))

فرمێسكی ڕەنگ، برسێتی ڕەنگ، كراسی ڕەنگ

بوون بە دایكم:

ئەبنە گوڵی بێوەژنو
((لە گوڵدانێکی شکاودا ڕەش ئەپۆشن.))
ئەبنە قومری سەرباڵ شینی کوێرەوەری
((لەنێوان دوولقی وشکا هەڵئەنیشن.))
ئەبنە گۆرانی گریاوو.. لەناو تەنیایی ژوورێکدا
سەوز ئەنێژن.
ئەبنە ئاخو ئەبنە داخو ئەبنە پەپوولە پاییزەو
((با)) ئەیانبا))

من لەبیرمە، ڕەنگەکانیش دەنگیان هەبوو
بۆ وێنە: دەنگی پەمەیی
ئەو دەنگەبوو کە دڵدارێ لەتانو پۆی باڕێزەدا
لەدوای خۆی بۆ بیرەوەریی
((دارژاڵەیەك جێیهێشتبوو))
ڕەنگەکانیش پەیڤیان هەبوو
بۆ وێنە: پەیڤی نارنجیی
ئەو پەیڤە بوو
لاوك بێژێ لەناو گەوەی دەربەندێکدا
(( بۆ مانگەشەوو بێریڤان جێیهێشتبوو.))
من لەیادمە
جووکە جووکی چۆلەکەکان
بەورشەو پرشەو بریقەو ڕەنگیان هەبوو

نه کەسك بوون، نه سووربوونو نه زەردبوونو
هەمووشیان بوون.
برسێتی ڕەنگێکی هەبوو، دڕو چەموش،
لەناو هۆدەکەی ئێمەدا، هەر بەڕەنگی زەردێکی کاڵ
لەسەر لێوو لەسەر گەردنی دایکمو لەسەر سەبەتەی نانەکەو
لەسەر گۆنەی خوشکەکانمو لەدەفتەری ڕەسمی منداو
لەسەر جانتای پەڕۆی مەکتەب، ئیشی ئەکرد!
ترسو بیمیش ڕەنگی هەبوو،
ڕەنگێکی دڕدۆنگو ڕێ ڕێ، تێکەڵ لە ڕەنگی قەدەغەو
ڕەنگی هەڕەشەو گوڕەشەو ڕەنگی زللەو
ڕەنگی پرسیاری تۆقیوو.. هەموو جارێ
هەڵیئەکێشام لەخۆیو
لە پشت ملەوە ئەیگرتمو هەڵیئەدامە سووچێکی
مت بوونەوەو چوکلێتێکی لە گیرفانی بێ دەنگیدا
دەرئەهێناو ئەیخستە ناو قوڵی مشتم.
ڕەنگەکانیش چاویان هەبوو
وەختێ ئێمەیان ئەبینی
بە تەلیسمی ڕەنگاڵەیی
لە شاخ بوایە، ئەیانکردین، بە ((شین))ێکی
شێتو شەیدای مێلاقەیی.
لە دەشت بوایە ئەیانکردین، بە زەردێکی حەپەساوو
لە دارستانیشدا بوایە

ئەیانکردین بە سەوزێکی بەرهەتاوی خۆشەویستیی.

هەرهەموویشمان لە ئاوێنەی شەبەنگێکدا

تیشکاو تیشك بەناو یەکدا ئەشکاینەوە

ڕەنگەکانیش کتێبخانەو ئارشیفی پەلکەزێڕینەو

ژووریان هەبوو

وشەیان تیابوو ڕووناك بوو

((وەك سەری خەج لەناو کۆشی سیامەندا))

قسەیان تیابوو، تاریك بوو..

((وەك کراسی شەو لەبەری درەختێکی نائومێددا))

ڕستەیان هەبوو شین باوبوو..

((چون سادەیی کوژەکەیەك لەسەرتەوێڵی منداڵێ))

ئاوازیان تیابوو ..زیوین بوو..

(( چون سەمای تەرزە لەبەردەم کازیوەدا))

ڕەنگیان تیابوو  پڕ بەسینەی چەم ئەگریاو

ڕەنگیان تیابوو لە باڵای ئاوێنە ڕێژی شاخو کێودا پێئەکەنی.

ڕەنگ زمانی هەموومان بوو.

من خۆم ئەمدی.. ڕەنگەکان. شیعریان ئەنووسی لەسەرتەمو

حیکایەتی ڕەنگاوڕەنگیان ئەدا بەدەم بای وەشتەوەو

من خۆم ئەمدی: لە کۆنسێرتی وەرزەکاندا،

دەستیان ئەکردە مل یەكو

لە میهرەجانی ئاویشدا

دارودرەختیان ئەژەنی))

**من حیکایەت خوانی ڕەنگم. چیرۆکی ڕەنگ بۆ دەنگ و بۆن**
**ئەگێڕمەوە. لەیەکەم ساتی زایینو پشکوتنی چاویانەوە،**
**تێڕامانێکی ئەبەدییم. من ڕەنگ لەناو هەستو نەستا ئەگرمەوە.**
**لە گریانی هێلکەکانو زەردەخەنەی ئاسۆکانو لە تێکئالانی**
**تانو پۆی نێرەو مێیەی ڕەنگی تۆخو ڕەنگی کالو**
**لەجۆشدانو خرۆشانی گەرمیانەوە، لە موچڕکەی لەشیانەوە.**
**تا داوە تەزووی جووت بونیان، تا ساردبوونەوەی هەناسەی**
**ئاوابوونو خۆرنشینیان، سەرنجێکی ئەزەلیمو ورد ئەبمەوە.**
**زەقەکانیان وەك سورەتاوی پێدەشتێ سەروملم داخ ئەکەنو**
**نەرمەکانیان  بە بێدەنگیی وردە وردە لە خۆیاندا ئەمتوێننەوە.**
**ڕەنگی ساوا ڕائەژەنم..**
**تا لەلانکەی تاریکیدا بنوێ**
**لەگەل خۆمدا ڕەنگ ئەبەمە ناو جێگاوە**
**قژی درێژیان لەخولیام ئەئالێنم.. تا دائەکاتە بارانو**
**ئیتر ئەوسا بۆ بەیانی تەلێ دوو تەل..**
**سێ تەل چوار تەل، لەسەر سەرینەکەم ئەڕوێن**
**لەگەل خۆمدا ڕەنگ ئەبەمە  ناو جێگاوە،،**
**خەویان لەناودا ئەبینم، جەستەم ئەکەن بە پێشانگاو،**
**ئیتر هەرچی پەپوولەیەو هەرچی تەیرەو..**
**هەرچی زارۆكو عاشقە دێن بۆ سەیرم.**
**لەگەل خۆمدا ڕەنگ ئەبەمە ناو جێگاوە..**
**لە گومانما بەیەکدا دێن، ئەمکەن بە ڕەشنووسی دوودل،**

بەتابلۆیەکی نیوەچڵ، ڕێ ڕێم ئەکەن..
لە یەقینما وەکوو خودا ڕوون ئەبنەوەو
لە یەقینما زڕەکانیان ئەڕوێنەوەو.. نەزۆکەکانیان
هەمدیسان ئەزێنەوەو گوڵی خۆرم نیشان ئەدەن، ڕەنگ نیگایەو
نیگایش ڕەنگە. ڕەنگ بیرکردنەوەی جیاوازی ناو دنیایەو، ڕەنگ
لێك نەچوونی بینینەو، ڕەنگ گۆڕانە لەماناداو، ڕەنگ
گەڕانە بەکیشوەری هێماکانداو، نە ڕەنگ لەزایین ئەکەوێو
نەوشەی من.
من حیکایەت خوانی ڕەنگم، من بەناو قولایی ڕەنگدا
ئەگەڕێمو ئەچمە خواریێومانای ڕەنگین ئەدۆزمەوەو
هەوێنەکانیان دەردێنم. ڕەنگێ نییە من سەردانم نەکردبێو
نەمناسیبێو، ڕەنگێ نییە، لەتێ لە ئاوێنەی خەمیو
یاخود تاڵی لە کاکۆڵیو یان دوو وتەی خۆی نەدابێ
بەشیعرێکمو بۆ یادگار وێنەیەکی لەگەڵ دووکەڵی جگەرەو
پەنجەکانما نەگرتبێو لەدواییشدا من سڕێکی هەڵنەهێنم!.
من کە بەحر گوێ لە تووڕەبوونی ڕەنگم ئەگرێ هەڵئەچێت و
من کە بەحر گوێ لە ڕەنگی هێدیم ئەگرێ دا ئەچێتو
من ئەمجارە لە سیحرەکانی ڕەنگەوە
دێمە ناو نیگاتانەوەو
من بە زمانی زەردوو سوور ئەتاندوێنم.
ڕەنگ ژنە، وەختێ ئەمانکا بە سترانێکی ئاڵ ئاڵ و
بەئەوین دامان ئەپۆشێ.

ڕەنگ شیعرە.. وەختێ ئەمانکا بە پرسیارێکی گوڵ گوڵیو
لەگومانمان هەڵئەکێشێ.
ڕەنگ مەرگە وەختێ ئەمانکا بە نادیارێکی بێ ڕەنگ و
بە کۆتاییمان ئەبەخشێ.
بە ڕەنگ دۆزەخ و دیرۆکم لەیەکتر جوێ ئەکەمەوە.
بە ڕەنگ نامۆیی و نیشتمان بەیەکەوە ئەبەستمەوە.
بە ڕەنگ زریان ئەئاژوومو
هەر بە ڕەنگیش من ئاگرو خۆڵەمێش و
چارەنووسم ئەنووسمەوە.
من بۆئەوەی ژانی ڕەنگێ لە دەفتەرما بڕسکێنم
هەردوو چاوم کرد بە زنەی زیوییینی ئاو.
من بۆئەوەی مەلی ڕەنگێ لە ڕوانینما هەڵفڕێنم
خۆشەویستیم کرد بە هەواو سەریشم پڕکرد لە هەتاو.
ڕەنگەکانم خودی خۆمن،کە سپی بم
بەفرو پاکژی و منداڵییم تێکەڵ ئەبن.
ڕەنگەکانم خودی خۆمن، وەختێ سوور بم
مێژووی سەرم و دەنگی خوێنم و
هاوارەکانی ئازادییم تێکەڵ ئەبن.
ڕەنگەکانم خودی خۆمن، کە سەوز بم
لاوێتیم وخۆشەویستیم و پاشەڕۆژ تێکەڵ ئەبن
ڕەنگەکانم خودی خۆمن، کە ڕەشیش بم
شەوەزەنگ و بێکەسیم و بەختی تینووم تێکەڵ ئەبن.

من حیکایەت خوانی ڕەنگم.. چیرۆکی ڕەنگ ئەگێڕمەوە:
هەتاکو دایکم نەناسی تۆ ڕەنگی ڕەش ناناسیت و
لەهێماکانی ڕەش ناگەیت. شەوت بۆ ناخوێندرێتەوە.
هەتاکو خاکم نەناسیت، تۆ ڕەنگی سوور ناناسیت و
لە نەهێنی سوور ناگەیت و، خوێنت بۆ ناخوێندرێتەوە.
تا بێ ڕەنگی و تا تەنیایی و هەتا غەریبیی نەناسیت
ڕەنگی بێکەسی ناناسی و
کورد ناناسی و
خودات بۆ ناخوێندرێتەوە.
من حیکایەت خوانی ڕەنگم.
من لە دەفری ئەم دیوانە تازەیەدا
ڕەنگی تازەی قەت نەبینراو ئەگرمەوە:
بەیانییەکی قرمزیی
تۆ کەوتیتە نێوباوەشی گوڵە لیمۆی ژنێکەوە
تۆ خاڵخاڵۆکەی بچووکی سەرگەردن و بەرۆکی بووی
دایکت پڕ بوو لەکازیوەو لە قەڵبەزەی پێکەنین و
لەو ڕەنگانەی تازەبووك بوون.
یەکەم جار بوو ڕەنگ بناسیت
چاوت تەمەنی دوو ساڵ بوو، کە ورشەی ئاڵی پشکۆیەك
لە ڕوخساری زستانێکدا خەیاڵی بردی بۆ ژووریێ کە
پێخەف و سەرینێکی سووری لێ بوو. لەبەرچاوت ڕەنگی
دایکت ئەبوو بەڕەنگی پشکۆی ناو مقەڵیەکە.

پشکۆ هەر ڕێزەی پریشکی لێ ئەبۆوەو پزیزەکان
ئەبوون بە وردە پەپوولەو لەناو قژیا ئەنیشتنەوەو
لەدواییشدا بریق و باقی جاجمێك دایئەپۆشیت.
یەکەم جاربوو ڕەنگ بناسیت
لەگەڵ ڕەنگەکاندا ئەدوایت.
چاوت ئەبڕیە نێو چاویان و
گوێت لە سروەو گوێت لەهاژەو
گوێت لە گڤە گڤیان ئەگرت.
لەپڕێکدا لووزەوی* ڕەنگ ئەهاتنە ناو سەرنجتەوە
ئیتر تۆ ئەبووی بەگەمیەو ئەوان ڕووبار.
ئەوان ئەبوون بە نەهێنی و تۆیش بە پرسیار.
بۆیەکەمجار لەبەربارانی ڕەنگاڵەی کچێکدا بوو،
بووی بە پێدەشتی ئاوازو نێرگزەجاڕ.
لە جادەکانی ڕەنگەوە گەیشتیتە گۆڕەپانی گۆرانیی شار.
لە نۆتەکانی ڕەنگەوە فێری ژەنینیی ئازاربووی.
لە زامەکانی ڕەنگەوە چوویتە ناو ڕۆحی شیعرەوەو بووی بەهاوار.
((لەڕێی ڕەنگێکی زەردەڵەی باریکەوە
من گەیشتمە ناو ئەشکەنجەی گیانی ژنی ئەم وڵاتە.
لە ڕێی ڕەنگێکی شین باوی لارەملی ئاوێکەوە
من گەیشتمە ناو کرووزەو ناو فرمێسکی منداڵانی ئەم وڵاتە.
من ڕەنگێکی خۆڵەمێشی دەستی گرتم و

---

*لووزەو: بەتەوژم و بەخوڕ

بردمیە ناو ڕەنگی تۆخ و ڕەنگی ژان و
دیرۆکی مەرگەساتەوە.
چیرۆکی ڕەنگ ئەگێڕمەوە:
کە شەوی مانایەك درێژ ئەبێتەوە
شەوی ڕەنگێکیشی لەگەڵدا درێژ ئەبێتەوە
کە چرای دیوارێك ئەمرێ
چرای وێنەیەکیشی لەگەڵدا ئەمرێ.
کە((با))یەك نائومێد ئەبێ و
بەخەنجەری لوتکەیەك خۆی ئەکوژێ
لە بناردا ڕەنگێك خەڵتانی خوێن ئەبێ.
چیرۆکی ڕەنگ ئەگێڕمەوە:
سەرگوزشتەی ئەو ڕەنگانەی لەناو بێ ڕەنگیدا خنکان.
ئەو سورانەی کۆچیانکردوو
لەناو بەفرا ڕەق بوونەوە ئیتر واگل* نەبوونەوە.
ئەو شینانەی لە قەراخ شار لاشەکانیان دۆزرایەوە.
ئەو سپیانەی هەر بە ئاسمانەوە کوژران.
چیرۆکی ڕەنگ ئەگێڕمەوە:
حیکایەتی ئەو ڕەنگانەیش لەدوای سڕینەوەو مەرگیش
جارێکی دی بۆ ناو گوڵزار گەڕانەوە.
((چەندین تابلۆی هەمەڕەنگی ئەو پێشانگایەی
کە بەنیازم لە یادی ساڵڕۆژی لەدایك بوونی

* واگل: گەڕانەوە

وێنەکێش((خالید سەعید[*]))دا بیکەمەوە

**تابلۆی یەکەم:**

ئەو وەختانەی تەنیاییم و
جەستەی خەیاڵ لەگەڵ یەکتردا جووت ئەبن
هێندە نابا لەناو ژووری حەپەساوما
ڕەنگێك ئەزێ
نە ئەوەتا بڵێی ڕەنگی تەمتوومانە
لەبوولێڵی غەریبیداو
نە ئەوەتا بڵێی شێوەی لە سەرابەو
یان کت و مت لە دووکەڵ و سوتماك ئەچێ.
من نازانم ڕەنگێکە نزیك لەو ڕەنگەی
وەختێ کە ئاوی کانیەکەی عاشقان و
قریشکەکانی ژنان و
خۆڵی ئەنفال
تێکەڵ ئەکرێ!

**دووەم تابلۆ:**

خۆرنشینێ کە ((ئەرخەوانییم)) پێگەیشت
وەك گۆزەبم لەملەوە هەڵیگرتم و
پڕیکردم لە ئەوینی ئاڵی خۆیو

---

[*] خالید سەعید: یەکێك بوو لە هونەرمەندە پێشەنگەکانی هونەری شێوەکاری لە کوردستانی عێراقدا.

قڵپ..قڵپ.. شیرین شیرین

ڕژانمیه ناو جوانیی ژنێکی شەنگەوە

لەو جوانیەدا مامەوە.. هێند مامەوە

گەڕامەوەو بووم بە شەراب

لەو ساتەوە عەشقێك لەمن ئەخواتەوە

نەئەو دەمم لێ هەڵئەگرێ و

نەمن کۆتاییم بۆ هەیەو

نەهیچ ڕەنگێکی دیکەی تر وەك شەرابیی

لەناو خۆیدا غەرقم ئەکات!.

**سێیەم تابلۆ:**

لە ئاخ و داخی ((زەرد))ەوە

رۆژێ نامەیەکەم بۆهات

زەرفی نامە لە توێکڵەژانی نێرگزێ تەنکتربوو

لەمدیوەوە، دیوی ئەودیوی تەنیایی ئاوارەبوون

هەمووی دیار بوو

وەختێ نامەیشم کردەوە

ئاگاییم بوو بە خەو بینین

وەختێ زانیم سەدان پەپوولەی پەمەیی

لەناو چاوما هەڵئەفڕین و هەڵئەوەرین.

**تابلۆی چوارەم:**

من حەزێ بووم خۆڵەمێشیی

نەم ئەزانی ڕەنگی ماچی کچ چ ڕەنگە
لەسۆراخی ئەو ڕەنگەدا لێوی خۆمکرد بە باڵندە
لەدوای لێوت ماچم بینی
ڕەنگاڵەیی لەناوناخما ئەتکێتەوە
بۆ خۆیشم بووم بەتەیرێکی ڕەنگاڵەیی

**تابلۆی پێنجەم:**

ڕەنگت ئەوەندە ناسکە
گوڵ بریندارت ئەکاتو
ئەوەندەیش ڕەنگت خوێن گەرمە
لەژێر بەفرا قوڵپ ئەداتو
هەر لەنێوان ناسکییت و خوێن گەرمیتا
من ڕەنگێکی پایزەیی ژەنگارمو
وا خەریکە باڕێزەکەی عومر ئەمبا!

**تابلۆی شەشەم:**

زەریای بەسامو کەشتییەك،
ڕەنگی نەهات.
هاژەی شەو و، ڕەوە قرش و، مانگە شەوێکی ترساو و
((با))یەکی شێت.
زەریای بەسامو کەشتییەك،
ڕەنگی نەهات.

له خەون دوورتر كەنارە و
له ڕەنگی وولاتیش دوورتر چراكانە و
ئەوەی نزیك بێ هەر بزەی سمێڵەكەی قاچاخچییەو
ئاوێكە شێت.
بەحری ئیجەو كەشتییەكی پیرەمێردوو
فەرهادێك و شیرینێك و ڕەنگێكی شێت.
زەریای سامدار
كەشتییەكی سەرەونخون
ڕەنگێكی مۆن
هاژەی مەرگو
گەلەقرشێ
خەون بە زیندویی ئەخۆن!

**تابلۆی حەوتەم:**

دوێ شەو جڤینێكمان هەبوو
زوربەی ڕەنگە ناودارەكان لەلام بوونو
تا درەنگانێ مانەوە.
((زەرد)) له پووشووی ئەم پاییزە،
شەپقەیەكی بۆ كردبووم. لێم وەرگرتو كردمەسەری
زەردەپەڕی خەمێكی خۆم، وەختی هەستان
منیش هەورێكی بزۆزی شپرزەیی سەرم دایە
كەپری بوو لەباگژەی بێ دالدەیی و

له نمەنمی تەنیایی و له مەوسیمی شیعرپژان!
لای ((سوور))ەوه زامێك هاتبوو كرمانجیی
باریكەله چون خەیاڵی بەلاڵوك و بەبریسكه
چون مەراقی ڕەنگی ژاڵه و
بۆینباخی گوڵ ئەستێرەی ((یەڵماز گۆنای)) له ملدابوو.
وەختێ ئەدوا.. پریشك له قسەی ئەبۆوەو
وەختێ ئەڕۆی گوڵ هەنار شوێنی ئەكەوت و
كەوەختێكیش لەبەردەمی پاشه ڕۆژدا ڕائەوەستا..
شاخ ئەچووه سەر شانی شاخو..
لەچوارلاوه بۆیشی ئەبوون به كامێرا..
لای((كەسك))ەوه سنەوبەرێ میوانم بوو
مژدەیەكی لەش پاراوو هەرزەكاربوو
گیرفانی پڕ لەبەهارو
كۆڵەپشتی وەرزەكانی پڕ ئاوێنەو پڕ گۆڤارو
درەختێكی خوێندەوار بوو.
ئەستێرەیەكی بچكۆله بەقەد تۆپێ
لەلای ((شین))ەوه هاتبوو
وەختێ كەوته نێو باوەشم
هەربەسەرنج هێدی هێدی شینی كردم و
لەوساتەوه ساماڵ چاومەو
زەریایش لەشم!

**تابلۆی هەشتەم:**

لەتابلۆما ڕەش و سپیی
بەرابیەك لەدەشتی زەین دروست ئەكەن
نیوەی هەتاو، نیوەی سێبەر.
كە هەتاو بچێ بۆ سەفەر
سێبەر ئەخاتە پاشكۆی و دوور دوور ئەڕوا..
ئەوسا ئیتر لە تابلۆما بەفر ئەبارێ و
قەلەڕەشكە پەیدا ئەبێ و سەوزیش ئەنوێ
دیسانەوە جارێكی تر ڕەش و سپی
بەدوای یەكتردا دێنەوە..
ئەمجارەیان ئەویان قژی ژنەكەمە كە ((با)) ئەیباو
ئەویتریان شەوقدانەوەی شیعرێكی خۆم.
لەتابلۆما ڕەش وسپیی
ئەچنە ناو ڕۆحی یەكەوە..
چارشێوەكانی ڕواڵەت فڕێ ئەدەن
ڕەنگە، هاواری سترانێ ڕەش پۆش بێت و
ڕەنگە برینێك سپی پۆش
ئەشێ ئازارێك سپی بێ و
گوڵزارێ ڕەش !.
لەتابلۆما ڕەش و سپی
من هەندێ جار.. ڕەشەكانم پێ ئەكەنن و
سپیم ئەگری.

**تابلۆی نۆیەم:**

ئەشێ لای تۆ ڕەنگی زەرد ببێ بە ڕەنگی تێکشکان و
ڕەنگی باوێشکدانی پایز، ببێ بەڕەنگی ئاویکلەی
هیوایەکی کزو نەخۆش، ببێ بە ڕەنگی دابڕان
لەنێوانی دوو گۆرانیی و دووباڵندەو دوو دڵداردا..
کەچی لای من هەر ئەو ڕەنگە
ئەبێ بەڕەنگی پێکەنین
ئەبێ بە ڕەنگی دیداری ئێوارانی خۆشەویستیو
بەمانگە شەوی خەوبینین.
هەردوو، کێڵگەی گوڵە بەڕۆژە و زاری خۆر
وام پێ ئەڵێن.
ئەشێ لای تۆ ((شین)) هەر ڕەنگی هەڵفڕینو
شەقڕن بێت و ڕەنگی بەرزیی و ڕەنگی باڵی ئەسپی زەریاو
ڕەنگی نەینووکی ساماڵ و ڕەنگی نیگاکانی ئەوین.
کەچی لای من هەر ئەو ڕەنگە
ئەبێ بەڕەنگی ترساوی منداڵیم و ڕەنگی پرسیاری
ناو سەرم و گیر ئەخوات و وەك ئەستێرە
لەژورێکدا حەپس ئەکرێ.
ئەشێ لای تۆ ڕەنگی ڕەش ببێ بەڕەنگی
مەرگی باخچەو ڕەنگی گریان و تابووتی سەرنجدان و
پرسەی ئاوو، لاوانەوەی گوڵە باخو،
تارمایی ژین..

کەچی لای من هەر ئەو ڕەنگە
ئەبێ بەجوانترین ڕەنگی پرشنگداری دەم بەخەندەو
ئەبێ بە شەوی مۆسیقاو بەرگی بەفرو
بە خوێنی گەرمی خەمێکی شێوە شیرین
وەختێ یارم، گوڵی سپیم
تاریکیەك لەبەر ئەکاو ڕەش ئەپۆشێ.

**تابلۆی دەیەم:**
ڕەنگ هەیە دوور لە پێکدادان
بەهێمنی، بێ وەی بۆ خۆی، لەناو جێگەکەیدا ئەمرێ.
وەکو ڕەنگی ((پەناگیری))
_گەردوون پڕە لەم ڕەنگانە_
ڕەنگ هەیە عەشق ئەیباتە ناو زریانەوەو
لەناو تۆف و ڕەهێڵەدا ئەبزوێت و گەرا ئەخاو
سەردەردێنێ و لەگێژاودا زۆران ئەگرێ و
لەنێو گەرداویشدا ئەمرێ
وەك ڕەنگەکانی باوەڕو
چون ڕەنگەکانی سەربەستی!

**تابلۆی یانزەهەم:**
من لە وەرزی دابڕاندا..
پەڕەمووچم کرد بەناو قوڵایی زەردا

زەرد گرتمی و
زەرد ڕایکێشام بۆ بنەوە
لەو ساتەوە من بووم بە زەردە ماسییەك
جۆگە جۆگەو ڕووبار ڕووبار ئەگەڕێمو
لەسۆراخی خەونەکانی یاقوتێکدام،
لێلاو لەگەڵ خۆیدا بردیو لێلاو لەمنی شاردەوەو
هەرچەند ئەکەم نایدۆزمەوە.
ڕەنگت فێربووە گشت شەوێ
وەنەوشەیی ئەهێنێتە نێو ژوورمەوە
وشەم ئێستا وەنەوشەیی و من خەیاڵم وەنەوشەیی و
خۆشەویستی وەنەوشەییش
بووە بەبادەی ڕوانینم و
لە پەیمانەی شیلانەیی چاوەکانتا ئەیخۆمەوە.
هەتا ئێستاش،
مەگەر ئاوێنە ڕەنگی عومری خۆم بیرخاتەوە
ئەگینا من لەو ڕەنگانەم وەکوو سەروو
بەتەنها هەرئاوی سەوزی یەکەم عەشق و
یەکەم ماچم لەناو ڕۆحدا ماوەتەوە.
من تەمەنم
پلوسکێکە.. لەگشت بەدەر
لەخوارەوە چەندە ساڵی لەبەر برژێ و لەبەر بڕوا..
لەسەرەوە، لە ڕنوەکانی عەشقەوە، دووئەوەندە

ساڵی سەوزو ئاوی عومری
وەنەوشەیی ئەچێتەسەر

**تابلۆی دوانزەهەم:**

کە شەو داهات
لەناو دۆڵێکی وڵاتدا
لەهەر کوێیەك خۆت بتەوێ
ئەتوانی سێ ڕەنگ تێکەڵکەی
بەیەکەوە و لەناو یەکداو لەناو دۆڵدا
تێکیان هەڵدەی:
((شەوی مەرگ و
لمی سەحراو
زریکەی کۆچ..))
بەیەکەوە تا بەیانی بیانشێلی
ئەنجام ڕەنگێك دروست ئەبێ، ڕەنگێکی نوێ
پێی ئەڵێن: ڕەنگی ((ئەنفالیی))!
ڕەنگە ئەنفالیەکان، بەردەوام ئێواران، لەخۆرنشین و
زەردەپەڕ وردئەبنەوەو چیرۆکی خۆیان ئەگێڕنەوە.
یەکەم چیرۆکی نێو ڕەنگدانەکەی من بەمجۆرە کەوتە دووان:

ئێواران، هەمووجار، ئێواران
مەراقم زەردەیەك لێی ئەداو هەڵئەبێ

لەگەڵ خۆم مەراقی داگیرساو هەڵئەگرم
ئەیبەمە دەرەوە بەر دەرگای کوختەکەم
لەو دەشتە هەردووکمان پێکەوە ئەچینە سەر چیچکان
هەردووکمان پێکەوە دەستێکمان ئەخەینە ژێر چەنەو
بەرەو خوار بەرەو خوار ئەڕوانین
هەتاکوو تخووبی خەو بینین، ئەوپەڕی پێدەشتی نامۆیی
ئەوپەڕی سنوری بێدەنگی، ئەڕوانین
پێکەوە تەماشای وەرینی ڕووناکیی و وەرینی گۆرانیی و
تەماشای ڕێی کۆچ و مردنی ڕەنگ ئەکەین
مەراقم هەزارەو خۆم یەکێك
سەد بەژنی خەیاڵ و خۆم بەژنێك.
ئێواران هەمووجار ئێواران
لە ژێڵاّ پۆلەمەل: ڕەش، سپی، خاڵ خاڵ و زەردباوو
پەمەیی و نارنجیی
دێنەوە بۆ ئێرە
ئەو کاتە مەراقم لابەلا سەیرێکی سووتانم ئەکات و پێم ئەڵێ:
تۆ بڵێی ئەوانیش ڕۆژێ بێ، زەردو سوور
بەکۆمەڵ لە ژێڵاّ هەمدیسان بێنەوە بۆ ئێرە؟!
من ناوم ((کوێستان))ە
ژنێکی کەلاریم
بەڕێکەوت، هەربەناو، ((کوێستان))م
ئەگینا من پڕم لەگڕەو

ئەگینا من باوکم لەخێڵی پەنگرەو
من دایکم لە هۆزی ژیلەمۆو سوتانە.
تەنیام و بێوەژن.. خۆم و خوا
تەنیام و بێوەژن.. وەك تاقە ڕەشماڵێ
لەبەردەم گردێکی رووتەنا.
شۆڕەبی هەڵقرچاو لەبەردەم چۆمێکی وشکدا
لەو ئەچم.
ڕەنگیشم لەڕەنگی ڕەشتاڵەی
خەمێکی تەڵخ ئەچێ و
ژیانم سێبەری کون کونەو
ئەستێرەی بەختیشم ئاوێنەی شکاوەو
خەندەیشم گەر هەبێ، ئەوە هەر جریوەی زامانە.
لەبەردەم هەتاوە سوورەکەی
نێرینەی ڕۆژگاردا، ڕەنگێکی مێیینەی چوواوەم.
توخمی من، لەم ناوە، هەر ئەڵێی تریفەی ژێر هەوری
مانگێکی ترساوە.توخمی من،
لاسکە گیای ژێر پێیەو هەمیشە و هەمیشە
ئاوێکی گریاوە. ئەوەتەی لەبیرمە خەنجەری سمێڵدار مۆڕەی
دێ و و نەڕەی دێ و هەر بەژوور سەرمەوە وەستاوە.چەمۆڵەی
جەستەمم. چەمۆڵەی دەشت ودەر، چەمۆڵەی شاخ و داخ. ڕووخسارم
نانێکی سووتاوەو بەژنیشم بانیژەی حەزێکی روخاوە. ئەوەتەی
ڕەگەزم بیرێتی: من جەستەم ماسییە لەتۆڕی پیاواندا گیراوە.

ئەوەتەی لەبیرمە سێبەرم و تارمایی گوناهم و ئەوەتەی لەبیرمە،
من گسکی ناو ماڵم و لە هێلکەی پیس ئەچم و
بەختیشم لەپووش‌و پەڵاشی سەرئاوە.
دەمێکە لەشیشم وەك ڕۆحم گڵمتکی
تینوەو هەربە شوێن ئۆخژنی ڕەنگیکی پاراودا گەڕاوە. ئەوەتەی
لەبیرمە((خەیاڵم)) ئەویشم هەرهی خۆم نەبووەو هی پیاوە:
منداڵ بووم براکەم نەیئەهێشت
ئەستێرەی بەورشەی ئاسمانیش بۆمن بێ
گەشێکی دائەنا بۆ خۆی و
ئەبوایە کزێکیان هی من بێ
ژاڵەبووم گەورەبووم.. چون ئازار غەدریشیان
لەگەڵما گەورەکرد.. ڕەنگ بووم و ڕەنگ نەبووم
مێینەی ڕەنگێ بووم هەربەزۆر تێکەڵی ڕەنگێکی
نێرینە کرام و.. وا شووم کرد.. ژنێکی کەلاریم،
من ڕەنگی سوتماکیی و ڕەنگدانی ئەنفالییم
حەوت ڕەنگ بووین لە خەونی باخێکدا
سێ ڕەنگی مێینەو چوار ڕەنگی نێرینە
حەوت ڕەنگ بووین لەباوەش گوڵدانی گردێکدا
ڕۆژێکیان ڕۆژی حەشر، ئێوارە
ڕۆژێکیان قیامەت نەفخی سوور، ئێوارە لەپڕدا. ئێوارە
هاتن و خۆیانکرد بەزام و زریکەو ناو ژان و
ناو ماڵو ناو باخدا. خۆیان کرد بەخەون و خەیاڵدا ئێوارە

((بارق)) هات.
مردن هات بەجلی عەسکەری و
بەتاج و نەجمەوە.
((بارق)) هات.
غەزەب هات بەخودەی ئاسن و، ئاگر هات
بەجووتێ چەکمەوە..
بەڵا هات خۆڵاویی و سەحرا هات
بەگڤەو لورەوە.
دۆڵپا هات پۆستاڵی پۆڵاڕێژ لەپێداو
تاعوون هات عەگالی لەسەرداو،
زمانی شینکیی خۆم پێش تیغی سەرملم ئەکەوت و،
قەمسەڵەی خاڵ خاڵی دووکەڵ و عاگولی لەبەردا.
قاچی خۆم، قاچی خۆم، ئەچووە ناو بۆسەوە بۆسەرم و
دەستی خۆم، دەستی خۆم، تابوتی چێ ئەکرد بۆ لەشم و
پەنجەی خۆم، پەنجەی خۆم، ئاگری لەشارای گیانی خۆم بەرئەداو
ڕەنگی خۆم سوتاوو ڕەنگی خۆم سوتێنەر
ڕەنگی خۆم جامانەی بۆ حەربە ئەبەست و
دەنگی خۆم پێش هاوەن ئەکەوت و
چاوی خۆم، چاوی خۆم، چاوی خۆم
هەناوم و کانیم و چرامی نیشانی عوجاج و لم ئەدا.
ئێوارە لەپڕدا ئێوارە، بارق و کاسکێت و یاشێخ و جامانەو
پشتێنی گوڵ گوڵی و خەنجەری دەبان و

دووربینی گەردن و دەمانچەی کەلەکەو
شەڕواڵ و دزداشەو شەجەرەی سەییدو تێکەڵەی خەفیفەو
غەوارە بەجلی دەبابەو کلاوی ڕاجیمەو چاویلکەی قەمەوە
پێکەوە هاتن و خۆیان کرد بە ماڵە سەوزەکەی ڕەحماندا
بەژووره سپییەکەی قورئانداو
لەسیمای نوورانیی میحرابدا
لەوێدا؛ گۆشاوگۆش
سورەتی ((بەقەرەو نیساء))و
((مریەم و یوسفیان))،
وەك مانگا زەردەکەی خانزادوو
یوسفی هەڵەبجەو
ئاسکەکەی مەولەویو
مریەمی بادینان سەربڕی!
لەوێدا کوت کوتی گۆشتیشیان لەزەرفی
کاغەزی کوژراوی کتێبی خودادا بەشکردوو
لەوێوە، من خێری گۆشتێکی حەڵاڵ و شیرین بووم
قوربانیی ئاسیای بچووك بووم، لەوێوە
بۆ دوورگەی عەرەب و ماڵانی ئەمەوی و تا تکریت
یەك بەیەك ئەندامی جەستەمیان
بەئێسكو خوێنەوە بەخشیەوە!
ڕۆژێکیان، ڕۆژی حەشر ئێوارە
ڕۆژێکیان، قیامەت، نەفخی سوور، ئێوارە

هاتن و حەوت ڕەنگ بووین بردیانین
ئێواران هەموو جار ئێواران، لەو دەشتە
مەراقم، زەردەیەك لێی ئەداو هەڵئەبێ.
لەگەڵ خۆم قوتیلکەی مەراقی داگیرساو هەڵئەگرم
ئەیبەمە دەرەوە بەر دەرگای کوختەکەم، لەوێدا،
بەرامبەر ڕەنگی خواو چاوی خوا ڕایئەگرم
بۆئەوەی تێکەڵی پەنهانیی ئەوبم و
لەڕەنگی نادیاردا خومگەری تەنیایی و نەهێنی شەوبم و
لەچاویا ئەستێرەی سەرسامبوون بژمێرم!.
ئێواران هەموو جار ئێواران، ((با)) دێنمە ناو ڕەنگی،
ئەنفالیی خۆمەوە، ((با)) ئیتر بەڕەنگی ئەنفالیی ڕەنگ ئەبێ،
((با)) وەکوو دەشت ئەگری و با وە کو خۆڵ ئەگری و
کڕووزەی ڕەنگێکی زامدارو بێ داڵدەی لێوەدێ.((با)) ئەدوێو
هەر ئەدوێ و فوو ئەکا بەباڵای کون کونی ژیانماو
شەش تەرمی ئاوازو شەش ڕەنگی قوربانیم..
پێکەوە لەکفنی شەش هەوری کۆچەردا هەڵئەگرێ. ئەو باسی
سەفەری درێژی ناو لم و جیهانی ((عەرعەر))م بۆ ئەکاو کۆستیشم
پێدەشتی پاراوی جەستەمەو  مەراقم کەروێشکەی تیا ئەکاو ئازارم
سەرانسەر هەر گوێیەو گوێ ئەگرێ!
ئێواران هەموو جار ئێواران
هەڵئەسم شەش کراس، شەش ڕەنگی کوژراوو
شەش وەرزی خڵتانی ئەشکەنجەم ئەهێنمە دەرەوە،

بەردەرگای ماڵەکەم
شەش کراس، ڕائەکەن، باوەشم پیائەکەن
شەش پارچە کراسی ڕەنگاو ڕەنگ
کراسی هەر شەشیان سیانیان مێ و سیانیان نێر
ئەیانکەم بە پەتی تەنافی بەردەمماو
لەسیلەی ئەسرینی چاومەوە سەرنجیان لێ ئەدەم.
دوای تۆزێ ڕەنگەکان ئەوانیش بەکاوخۆ ئەدوێن و ئەجوڵێن
ئەوەیان: کراسە شینەکەی باوکیانە
ئەو وەختەی ئەمبینێ
گیرفانی پڕ ئەبێ لەخەندەو
بەرۆکیش گوڵێکی شین ئەگرێ. ئەو وەختەی ئەمدوێنێ
هەر دوو قۆڵ دەس ئەکەن بەسەماو
ملیوان ئەبێتە کۆترێ و هەڵئەفڕێ.
ئەوەیشیان کراسە کەسکەکەی گەورەکیژ
تائێستەیش ئاودامان هەر بۆنی گۆرانیی زیرەك و
مامڵێی لێوە دێ. ئەمبینێ و ئەبێتە پەڵەیەك
لەپوونگەی گوێ کانیی ئەوسای ((دێ)).
ئەویتر کراسە مۆرەکەی ڕیحانەی بچکۆلە
ئەمبینێ و لە جێی خۆی شەماڵی ڕەنگینەو هەڵئەکاو
کزیەك لە گڕەم ئەدات و
دەرونم و ئامێزم و ناو قژم
پڕ ئەکا لە وردە پەپوولە.

ئەو دووانەیش کراسی هەردوو کوڕ زەردو سوور
قریوە ڕۆئەکەن لەدەشتی بەردەمماو
دوو جوانون ئەو وەختەی لەخەوما غار ئەکەن
لەژووری تەنەکەو لەهۆدەی خەفەتما
تۆزو خۆڵ لە کۆستم هەڵئەسێ.
ئەمەیشیان کراسی خامەکەی ڕەزێیەو
تائێستەیش بریسکەی ئاڵ ئاڵی لەشینکی تورنجیی و
لیمۆیی لێوە دێ.
ئێواران هەموو جار ئێواران
شەش کراس کە دەورەم لێ ئەدەن
من ئەکەن بەکەلی گورگە زێو
ڕەنگاو ڕەنگ باوەشم پیائەکەن.
شەش کراس، شەش ڕەنگی، بێ سەرو بێ شوێن و
شەش ڕەنگی ڕەوەندی ناو لم و شەش ((با)) ی وێڵ،
شەش سەراب، شەش هاوار، ئێواران هەموو جار
ئێواران، من ئەکەن بە داری چاوەڕێو بنچکی چاوەڕێو
نە دێن و نە دیارن و نە مۆمێك لە ژانما هەڵئەکەن.
من ناوم ((کوێستان))ە
ژنێکم کەلاری و
ڕەگەزم لەڕەنگی دووکەڵەو
وڵاتم لە ڕەنگی سێڵاوەو
پێناسەم لە ڕەنگی ڤیژەیەو

**چاویشم لە ڕەنگی پێدەشتی شەوانە.**
**ئێستاکە تەمەنم چل ئاخی تەواوە و**
**سەریشم بۆ ڕەنگی کۆچکردووی شەش ئەوین**
**ئێواران هەموو جار ئێواران مۆمدانە.**
**ئێواران هەموو جار ئێواران**
**خۆ بەخۆم**
**بەڕەنگی بۆشایی و تەنیای خۆم ئەڵێم:**

**ڕەنگە ((زمناکۆ)) ئەو ڕەنگەی بیر نەمابێ**
**کەجارێکیان لەناکاوێ**
**لەڕەشاوێکی هەڵکێشاو**
**تووشی پرسەو گریانێکی بەکوڵی کرد.**
**ڕەنگە ((سیروان)) ئەو ڕەنگەی بیر چوبێتەوە**
**کە زستانێك لەگەڵ لافاوێکدا**
**هات و لێڵاوی چاوی داهێناو**
**بۆ ماوەیەك هەر کوێری کرد.**
**لەوانەیەو ڕەنگە هەموو تەیرەکانی**
**ناو ئاسمانی باوەشاسوار، ئەو ڕەنگەیان بیر نەمابێ**
**کە جارێکیان، لە خوارێ ڕا، وەك ڕەنگێکی بۆرەقنەی**
**گەردەلوولێ لەپڕ هات و**
**ڕەنگی عەشقێکی بەهارەی لە کۆشدا کوشت.**
**لەوانەیە، باخەکانی پرتەقاڵ و**

**دار هەناری شارەبان و**

**گوڵە بەرۆژەی دەشتی دوز هەندێ ڕەنگیان بیر نەمابێ**

**تەور بەدەس چۆن هاتن و**

**لەناوقەدا، ڕەنگی ئەوینیان بڕیەوەو**

**دوو دوو سێ سێ لەپاڵ پەرژینێکی نزما:**

**پێکەنینی جۆگە ئاوو**

**حیکایەتی منداڵان و گۆرانیەکانی گەنم و جۆو**

**ڕەنگی خۆزگەو بارانیان کوشت.. ڕەنگە هیچیان بیر نەمابێ!.**

**بەڵام.. بەڵام..**

**بەڵام تەنها تاقە ڕەنگێ..**

**کەڕەنگی ئاوی گۆڕیوەو**

**ئاو ناتوانێ وەك ئۆکسجین لەپێك هاتەی دەرهاوێژێو**

**وەك سەرچاوە، لەبیری خۆی بباتەوە..**

**تاقە ڕەنگێ کە چۆتە ناو دەروونی قوڵی بەردەوەو بەرد ناتوانێ**

**وەکو زەڕڕە لە جەستەی خۆی بکاتەوە. تاقە ڕەنگێ کە بۆتە**

**ڕەنگی فڕین و مەل ناتوانێ وەکوو هەوا لە باڵی خۆی بکاتەوە...**

**تاقە ڕەنگێ کە بۆتە ڕەنگی زەمان و ڕەنگی جێگەو سەعات**

**ناتوانێ لە چرکەی بکاتەوە.. گوڵە بەرۆژە لە چاوی. باخی پرتەقاڵ**

**لە دەنکی، گوڵی دار هەنار لە ڕەنگی، شار لە شەقام ، زمان**

**لە فەرهەنگ و وشەی، شاخ لە لوتکەی، ئەم وڵاتە لە سك و**

**زای، ڕۆژەکانی و ڕۆژمێریش لە داهاتووی بکاتەوە:**

**ئەنفالەو ڕەنگی ئەنفالەو ڕەنگی ئێمە ڕەنگی مێژوو**

ئەنفالەو ڕەنگی ئەنفالەو ڕەنگی ئێمەو ڕەنگی
ئەنفالەو ڕەنگی ئەنفالەو ڕەنگی ئێمەو
ئەنفالەو ڕەنگی ئەنفالەو ڕەنگی
ئەنفالەو ڕەنگی ئەنفالە
ئەنفالە و ڕەنگی
ئەنفالە !
((لاوانەوەی شیعرێ بۆڕەنگێکی بچکۆلەی ناو ئەنفال،
لاواندنەوەیەك دوابەدوای درێژەی
کۆچ و ونبوونی هەزاران ڕەنگی زەردو سوورو
نەگەڕانەوەی هەزاران گوڵ و ئاوێنەو ملوانکەو بازن و مێخەکی نێو ماڵ!))
مەگری ڕەنگە بچکۆلەکە
تۆ لە مانای ئەم سەفەرە شینە ناگەی
لە زەمانی کۆچ تێ ناگەی!
ڕەشەباکان و زیلەکان پەلەیان بوو لە مردن پەلەتریان بوو
ڕەشەباکان لە پێچپێکدا تۆیان لە دەست کەوتە خوارێ و
نەوەستان و درەنگیان بوو.
مەگری ڕەنگە بچکۆلەکە
ڕەنگی ئاڵی ناو بەیانیی
مەگری تۆ لەم ڕۆژگارە تێناگەی
تۆ لە مانای خۆرئاوابوونی بەیانیان
لە دووکەڵی سەفەر ناگەی!
بچکۆلەیت و تۆ چووزانی چەند درێژە کۆچی سورو

هەناسەکانی ڕێی عەرعەر

مەگری ڕەنگە بچکۆلەکە!. ڕەنگی زنە. ڕەنگی شەمامەی

خاڵ خاڵ و ڕەنگی هەنگ و ڕەنگی تێکەڵی زەنگیانەو

ڕەنگی کزەو ڕەنگی شنە. مەگری ڕەنگە بچکۆلەکە!.

مەگری با بنە دەوەنێ لەم دەشتەدا. نەتبینێت و ئەویش بگری

کە ئەو گریا پەپوولەیەك پێ بزانێ و ئەویش بگری لە فرمێسکی

پەپوولەوە باخ بیزانێ و ئەویش بگری و کە دار گریا

بەردیش بگری و

لە فرمێسکی بەردیشەوە

گریانی بتەنێتەوە بنار بگری و لوتکە بگری و

گوڵە کێویلەکان بگرین،

مەگری با باڵندەیەك نەتبینێ و

ئەویش بگری کە ئەو گریا

ئەمجارە ((با)) بەکوڵ بگری و

کە((با)) گریا ئاسمان بگری و

لە گریانی ئاویشەوە،

مەراقێ بتەنێتەوە هەموو جەستەی

ئەم نەخشەیە و ئەم ڕەنگدانە بگرێتەوە

مەگری ڕەنگە بچکۆلەکە مەگری

لە کوڵی گریانی تۆدا وا خەریکە

وڵاتێ سوێی ئەبێتەوە!.

**((گەڕانەوەیەك بۆ لای گیتارە خۆشەویستەکەی ((ئازاد)) و**

**هەموو ئەو ڕەنگانەی کە لەڕەنگدانی دۆڵێکدا و لەژووره نسرمەکاندا**
**خەویان بەئایندەی سپی و خۆرەتاوی ئازادییەوە ئەبینی))**
له هەڵەمووتی مەرگەوە و له  هەڵدێری ڕەنگەکاندا.
له زەمانی قووچو خزی تەمەنێکی بەگینگڵ و دژوارەوە،
چەند ئومێدی زێڕین ئاسای خەونی ئێمە به تروسکەو پریشکەوە
چون گلۆڵەیەك  له پرشنگ پەرت پەرت بوون و لەو
دوندەوە بەربوونەوەو یان وەکوو شوشەی مانگه شەو
کەوتنەخوارێ و وردوخاش بوون. وەك نەبووبن چوونەوە
ناو ڕەنگەکانی بەر له ((بوون)) و هەپرون هەپرون تێکەڵ
به سرووشت بوونەوەو لێمان ونبوون!
لەو دۆڵەدا
که ڕەنگمان تیا ئەکرد به دەنگ
دەنگیش به قووڵپەقوڵپی ئاو
ڕەشمان تیا ئەکرد به سەوزو
سووریش به ڕێگاکانی چاو
لەو دۆڵەدا..
گیتارەکەت دەم و لێوی ڕووبارێکی دیکەی ڕەنگ بوو
هەموو جارێ لەناو دەربەندی ڕۆحماندا پله پلەو مله مله هەڵیئەکرد
وەکوو کلوو ئەیبردینو ئەیداینه دەست وژەوژی  ئەفسونی ((با))
گیتارەکەت لەو دۆڵەدا سەمای ڕەنگەکانی شارو پەنجەکانی
شارستانی و پرچی ژنو زەردەخەنەی پاشەڕۆژی مندالآن بوو.
یەکەم جاربوو گوڵەکێوی‌و گاشەبەردو هەوای ئەوێ

لەو ڕەنگی دەنگە ببیسن‌و
لە ئەشکەوت‌و کەوێڵەوە بجولێن‌و بێنە دەرێ.
وەختێ گیتارت لێ ئەدا.
لەبن زوقم‌و سەهۆڵەوە گوڵە هەتاوێ ئەبزووت‌و
لە سکی گردی تینوویشدا
زنە ساوایەك ئەجوولا. وەختێ گیتارت لێ ئەدا
ڕەنگ هەر ڕەنگی لێ ئەبۆوەو،
ئەبوون بە هەزار، ڕەنگی جیا.
خۆت‌و گیتار ڕەنگتان لە ڕەنگی چنارە زیزەکان‌و
لە چرای کزی شەوانەی ژووری قوڕو
لە ڕووخساری ((ژیلوان)) ئەچوو.
گیتارەکەت ڕەنگی قوربانیی ئەژەنی. لە هەوادا ڕەنگەکان
ئەخەنینەوە. ڕەنگەکان ئەبوون بە ڕشتەی بیرەوەری داگیرساوو
بە زەنگیانەی هەڵفڕیوو
لەناو ژاندا چەخماخەیان ئەدایەوەو
لە دوایشدا ئەبوون بە ئاگری سەرچیا.
گیتارەکەت ڕەنگی قوربانیی ئەژەنی،
ئەیکرد بە تۆف‌و با پووسکە.
قوربانیەکان بە جلی گوڵەهێرۆوە- یەکە یەکە ئەهاتنەوەو
لە گەڵماندا دائەنیشتن‌و پەروانەبوون دەوریان ئەدا لە
چراکە. گیتارەکەت بەهاری ناو باوەشت بوو، پەنجەکانی دەستی
ڕاستت لە فەزای شینی ئاوازدا ئەبوون بە مەل‌و باڵندە،

ئەیانخوێندو  شەقژنیان بوو.
گیتارەکەت ڕەنگی ژنو
باڵای ژنو کەزیی ئەوانی ئەژەنی
ژێی یادگارو ژێی ڕەنگی
کۆچی بێ وادەی ئەژەنی.
ئاوازەکان وەك باڵندە، ئەڕژانە ناو ژوورەوە.
ئێمەیش ئەبووین بەدرەختو کونە شاخو بە هێلانە
ئاوازەکان پەیڤی ڕەنگینی گیتار بوون لەسەر باڵی سەمەندەری
ئەفسانەیی ئەیانبردینەوە بۆ شار. ئەچووینەوە سەرشەقامو
ناو ژوورەکانی کتێبو سەرشانۆکانی دراماو بەر ئاوێنەی
لاپەڕەکانی ڕۆژنامە. ئینجا ئەبووین بە حەزێکی پیرۆزەیی ،
بە نقێمێ لە موستیلەی پەنجەی یارداو لە دواییشدا هەموو
ئەبووین بە چەند دڵۆپێکی زیوین لە نێو چاوانی گیتاردا.
لەو دۆڵەدا
لە شەوێکدا هاتم بۆ لات، ڕەنگ بەستبووی
کرێوەی ڕەنگی مێژوو بوو،
چون دەستی بەردو دەستی دار
دەستی وشەیشم  تەزیبوو.
گیتارەکەت لەسەرمادا تانگۆیەکی گرمۆڵەبوو.
لەسەر ڕەفەو لەناو باوەشی کتێبدا هەڵئەلەرزی.
بەڵام تۆ خۆت ڕەنگی گەرمی سروودێ بووی
لەناو هەناوی شەختەدا

پشکۆت تیا ئەگەشایەوەو
روو لە ((با))یەکی دڕیش بووی.
شیعرەکانم بە چوارمشقی لە ژووری سەماو ئاوازدا دائەنیشتن.
گیتارەکەت دائەگرتو بە ڕۆح گەرمت ئەکردەوە.
ئەوسا ئیتر لەنێوانی پەنجەکانتا ڕەنگ هەڵئەقوڵی.
لە چاویشتا تروسکایی ئاگری دوورو ، شەبەقێکی ئێجگار کاڵی،
ئەودیو تەمی چارەنووسمان دەرئەکەوتن.
ئاوازەکان هەڵئەگیرسان
ئەتکرد بە چراخانی ڕەنگ
ئەبووین بە باخی خەیاڵ و لەناو ڕەنگی دەنگەکاندا
کە یەکەم گزنگ لێی ئەداین سەرو ملمان پرتەقاڵیی‌و
تەنیاییشمان زەردێکی کاڵ هەڵئەگەڕا.
کە ((با))ی ئاخیش هەڵیئەکرد.. تاریك ئەبووین
ئەبووینەوە بە تارمایی‌و بە بنچكو دەوەنی شاخ
لەو دۆڵەدا
لەیەك ڕەنگیی سیاسەتو
لەیەك ڕەنگیی کتێبەکان یاخیی ئەبووین.
بۆئەوەی جۆگەی خەونەکان ڕەنگین بکەین:
ژنو کتێبو مۆسیقاو دڵداریمان ئەکردە ناو.
بۆ ئەوەی سەرمان بکەینە مێرگو بژوێن
تیشکی جیاجیاو دەنگی جیاجیاو
بەیەکەوە ڕەنگی دژمان تێدا ئەڕوان.

لەو دۆڵەدا، گیتارەکەت، باران، بارانی ئەباران
لە وەختێکدا باران هەر لەولاترەوە یەخسیری نێو سیاساڵ بوو.
گیتارەکەت دنیایەکی ئەهێنایە ئەو دۆڵەوە
بەڕەنگی تر تەماشامانی ئەگۆڕیو
بەڕەنگی تر ئەیکردینەوە بە منداڵ.
لەو دۆڵەدا ڕەنگەکانمان برسیی بوونو
وەختێ ژەم بوردە ئەچوونە ناو ڕەنگەکانی بێهۆشیو نووستنەوە
خەویان بە ڕەنگی شیرینیو،
ڕەنگی چەوریو
ڕەنگی گۆشتەوە ئەبینی:
لە خەویاندا داروبەردو بەفرو گڵێش
ئەبوون بە خۆراکی جیاجیاو
ڕیز ئەبوونو ئەچوونە سەر
سفرەو خوانی بەتامو بۆی
هەمەڕەنگی خواردەمەنی
هاوڕێیەکم، پارتیزان، ڕەنگ برژاوێکی کەرکوکیی
جارێك گێڕایەوەو وتی: من شەوێکیان هەر لە خەوما، کەرتی
دابڕاوی کەندێك، چین چین زەردو چین چین سپیو لەسەرەوەیش
ڕەنگ قاوەیی لەبەرچاوم بوو بە کێکێك، لەو خەوەدا،
تیپەکەمان، ڕەنگ ماندووەکانی بیستو یەك، هەموو نیشتبووینە
سەریو کەچی سوچێکی گەورەکێك کەل نەئەبوو. هەر لەخەوما
دوورە ڕنوی بەفری کێوێك، لەبەرچاوم،

ئەبوو بە دووگی هەڵواسراو،
لەبەرچاوم لەمپەڕەوە هەتا ئەوپەڕ، کێلەبەردو بنەداری رەش
هەڵگەڕاو ئەبوون بە بزنو ڕانەمەڕ، دەنکە چەو ئەبوو بە چوکلێت
هەور ئەبوو بە پەشمەكو
گڵەسوور ئەبوو بە حەڵواو،
لەوسەریش ڕا،
لەبەرچاوم گردی زیخی رێ و رێ و ڤات ڤات،
ئەبوو بەیەك سەفەرتاسی ئێجگار گەورەو
هاڵاوی چێشتێکی تازەی لێ هەڵئەسا.
لەو دۆڵەدا ڕەنگەکانمان بێ کاڵا بوون،
ڕەنگەکانمان خەویان بە کراسی سپیو
بە ڤاتێکی ڕەنگ زەیتوونیو
بە گوڵی سەر بۆینباخو
قۆپچەی سەرقۆڵەوە ئەدی.
من هەندێجار لەناو خەوی ڕەنگ پۆشتەدا خۆم ئەگۆڕی:
لەپەڕەی پانی گوڵ هێرۆ کراسی سپیم ئەدووریو لە گەڵاکانی
دار گوێزیش ڤاتێکی جوانی زەیتوونیو لەتەڵاشی گەورە گەورەی
دارستانیش پاڵتۆیەكو لە گوڵەکانی دەمەشێر بۆینباخو لەدەمی
خونچە سەد قۆپچەو.. وەختێ خەبەرم ئەبۆوە، تاقە ڤاتی،
خاکیی بەرم بای سارد کرژی کردۆتەوەو، بن میچ دڵۆپە ئەکاتو
ژوورەکەیشم وەکوو لەشم لەسەرماندا هەڵئەلەرزی.
لەودۆڵەدا ڕەنگەکانمان بێ ژن بوونو ڕەنگی بێ ژن

له ژیانی خۆمان ئەچوو: له پەنجەرەی بێ شووشەمان،
له ڕەنگی نایلۆنی بەربا وەختێ سوچێکی بەرئەبوو.
له ڕەنگی پەتووی سەر دەرگا که بارانی هەڵئەمژیو
لانەئەدراو قورس قورس ئەبوو،
ڕەنگی بێ ژن، ڕەنگی لایتی دەستمان بوو،
وەختێ له ڕۆیشتنی شەودا، له نیوەی ڕێ،
یان پیلەکانی ئەمردوو یان چاوی تەواو کز ئەبوو.
ڕەنگی بێ ژن، لەو دۆڵەدا، له ڕەنگی پێخەفی چڵکن،
له کراسه بێ قۆپچەکان، له سوراحی دەسك شکاو، له ڕەنگی
زەردی پڵێتەی زۆپایش ئەچوو، کاتێ ئیتر شین نەئەبوو.
ڕەنگی بێ ژن، له ڕەنگی کەمانچەی کزی بێ مۆسیقار،
له ڕەسمێکی بێ چوارچێوەی کەمێك دڕاو،
له ڕەنگی پشکۆی کوژاوە..
لەڕەنگی ئەو خۆڵەمێشەی دەرمان ئەداو
ڕەنگی بێ ژن ، له ڕەنگی ئەو دارەیش ئەچوو، له چاوەڕێی
بارانێکدا لەسەر گردێ تاقو تەنیا ڕاوەستابێو به چواردەوریا
هەربڕوانێو بەڵام ئیتر نەباران بێ و نه کۆتایی بێ چاوەڕێ.
ڕۆژەکانی ڕەنگی بێ ژن..
له پەڕەپەڕەی دەفتەری هەڵوەشاوو
شەوەکانی ڕەنگی بێ ژن.. له پرتەپرتی فانۆزێ
لەبەردەمی گژەباداو..
له تەنیایی قەڵەم پاندانێکیش ئەچوو..

مەرەکەبی تیا نەمابێ و هیچ نەنوسێ،
لەو دۆڵەدا، ئەو وەختەی ڕەنگی بێ ژنم،
ئەچووە ناو ڕەنگی مێینەی خەوێکەوە،
ئیتر خەو بۆنی ئەگریجەو بۆنی ڕەنگێکی ناسكو
بۆنی شەمامەی خاڵ خاڵو
بۆنی خۆشی ژنی ئەگرت.
لە ژێر هەرزاڵی خەوێکدا،
لەبەرچاوم، دارهەناری بەر ژوورەکەم،
ئەبوو بەژنێ سوور پۆشو
ئەچووە گوێ کەناری چۆمو
چاوم لێبوو، پارچە پارچە گەڵای بەریو
گوڵی جلی دائەکەندوو
رووت ئەبووەوەو، لەسەر سینەی بەرەڵڵاوە،
هەردوو مەمان بەرەو لای من هەڵئەفڕینو
هێواش هێواش لەسەر دەسم ئەنیشتنەوە.
هەر لەخەودا ئەبوومەوە
بەڕەنگێکی گەرم گەرمی هەرزەکارو لەسەفەری
هەنگوینیدا ، ئەچوومەوە ژووری ئاڵی یەکەم شەوو
لەسەر چرپای تیشك و پەموو،
بەهارێك بووم پاڵ ئەکەوتم،
بووکەکەی خۆم، سپی سپی لەگەڵ ماچی ڕەنگ پەمەییو
بەدەم باڕێزەی حەزەوە،

ئارەزووی سوور ئەهاتەوە نێو باوەشم.
ئەو وەختەی ئەمویست نزیکی ڕەنگی تێکەڵبوون ببمەوە..
لەپڕ خەبەرم ئەبۆوە ،
سەرینی پەڕ لە باوەشداو، توورە توورە
سەرینەکەم تووڕ هەڵئەداو،
چاویشم ئەنووقاندەوە، تا خەوی نوقسان تەواوبێ و
جارێکی تر بووکەکەی
خۆم ببینمەوە!.

لەو دۆڵەدا کە منداڵانمان ئەبینی:
تەیروتواڵی ڕەنگ کزی گوندنشین و جوجکی نەخۆشی کولانەو،
نەو نەمامی لارە مل و ڕەنگی رووتوقووتی هیواو،
تەراخومای چاوی کانی و گوڵمان ئەدی.
لەو دۆڵەدا کەمنداڵانمان ئەبینی، بەیەکەوە
سەهۆڵ و پشکۆی لەرزوتاو، ڕەنگی وڕێنەی پەلکە گیاو،
ڕەنگی وێرانەی مەکتەب و ڕەنگی مەرگی نەخۆشخانەو،
شوشەی کوژراوی دەرمان و ڕەنگی کلۆڵیمان ئەدی.
لەو دۆڵەدا وڕەی تەیارە ڕەنگێکی دێزی هەبوو
وەختێ ئەهات،
سیمای ئاسمانێکی شیرین،
لەپڕێکدا وەکو سیمای گرژی پیرە ژەنەڕاڵێکی لێ ئەهات،
ناشرین و تاڵ تاڵ ئەبوو.

هەندێ جاریش لەو دۆڵەدا
مردن هێند نزیك ئەبۆوە:
نینۆکەکانی پەنجەیی و چەناگەیی و بزەی چاویمان ئەبینی.
لەو دۆڵەدا، ڕەنگی شەهید
ڕەنگی هەق بوو، وەختێ کە سوور هەڵئەگەڕا.
ڕەنگی تەنیایی ئێمەیش بوو، وەختێ دنیا
لە ڕیزدا دەری ئەکردوو ئەیدایە دەس تاعوونی ((با)).
ڕەنگی سەرکەوتن لە ڕەنگی یاقووتی بەر باران ئەچوو
لەڕەنگی خەندەی هەتاوێك، دزەبکاو بێتە ژوورێ
لەبێشەڵانی تاریکدا.
ڕەنگی پاشەکشەو ڕەنگی هەڵاتنی تفەنگ
لە ڕەنگی ونبوونی ڕێگا لەڕێبوارو،
لە ڕەنگی  باڵی شکاوی هەڵۆیەك و
لە بێدەنگبوونی ڕەشەباو لە زریانێکی شەل ئەچوو
لەو دۆڵەدا ڕەنگی ئێمە بۆیە مابوو
ڕەنگی ئێمە بۆیە ئەژیا
چونکە هێشتا ئاواتێکی ڕەنگ زیوینی لە ناودابوو
چونکە هێشتا ڕەنگی ئاوازێکی سپیی .. لە گیتارەکەی ئازادو
لە ژێی دڵیەوە ئەهاتو
هەموو ڕۆژێ ((ڕۆژباش))ێکی سەوزوتەڕی
لە ئایندەمان ئەکردو ئەوسا ئیتر بەرچەکانی ناو خەونو
بە توولە ڕێی ناو برسێتی و ئێستەماندا هەڵئەگەڕا!

ئازاد! ئەی هاوڕێی ڕەنگی شاخو

ڕەنگی سروودو

ڕەنگی خەو..

ئەی هاوڕێی هەموو ڕەنگە ئازادەکان!

دوای چەندین ساڵی خۆکوژی ڕەنگەکان و

پەرت پەرت بوونی ئاوازەکان،

لەدوای ئاوابوونی لەشت و مانگی سەوزی گیتارەکەت:

لە ((ئۆسلۆدا)) زەردەپەڕێك،

لەسەر بەفری درەوشاوە، وەك تورنجی رۆکردبێ‌و

شەقام بووبێ بە خامەکی ئاڵی لەشی،

ئەو هەتاوە بە جێماوە،

ئێوارەیەك کە غەمگینتر بوو لە شیعری ئاوارەم‌و

بێ تاقەتتر لە زمانی بێ هاوڕێی کوردیم لەوێ.

لە ڕێکەوتێکی زەردباودا ، لەسەر بەفری بەر زەردەپەڕ

لەسەر جادەیەك بێ ڕێبوار،

چۆڵ‌و درێژ

چون جادەکانی ئازاری دوای ئەنفالم،

تووشی هاتم،

گۆرانییە بێوەژنەکەت ، مامزە بێوەژنەکەت،

درەختە بێوەژنەکەت.

تووشی هاتم. کە دیم ئەتوت گیتارەکەت ئەبینمەوە.

لەوکاتەدا تورنجەکانی زەردەپەڕ

کاڵبوونەوەو ، گەواڵەیەك لە هەوری دوور
هەر لەشێوەی گیتارێکدا
نزیك بۆوەو نزم بۆوەو، هێندەی نەبرد
گیتار بەسەر هەردووکماندا باریو
لە دواییشدا بێدەنگ بێدەنگ بێ ڕەنگ بێ ڕەنگ
تۆ بەرەو ژوور من بەرەو خوار، لەیەکتری جویێ بووینەوە!.

**(( ڕەنگی ئاوارەم لە کافتیریایەکی ئۆسلۆدا، لە نهۆمی دەیەمدا شیعرێکی نووسیی!))**

تەنیایی لە شوێنی بڵندا بۆ ڕەنگی ئاوارەم ئەبێتە جۆلانە
هەمدیسان لە هەمان کافتیریای ڕەنگاڵەی فڕیوی نهۆمی دەیەمم
من ئێستا پێش خەڵکی خوارەوە، نوێترین پەپوولەی ئەم بەفرەو
نوێترین سەمای ئەو لەباوەش ڕەنگێکی شیریدا ئەبینم.
لە هەمان چایخانەی ڕەنگاڵەی پەنجەرە بازنەیی نهۆمی دەیەمم
چەند جوانە کەناوی ئەم جێیەش ((باڵندەی باران))ە
ئەڵێی من لەشەوی ڕەهێڵەی وشەدا
ئەم ناوەم لێ ناوەو
وا ئەویش گەرمەو گوڕ لە سەرمای ژێر سفری قوتبێکدا
بۆم بۆتە باوەشی پڕ پووشووی زەردەڵەی ، هێلانە،
لە هەمان چایخانەی ڕەنگاڵەی
پەنجەرە بازنەیی نهۆمی دەیەمم
هەرلەسەر قەنەفەی گوڵ گوڵیی ڕۆژانەی لە هەفتە زیاترم دانیشتووم.

کات ڕۆژەو نیوەڕۆی لەش سپیی ، کەچی من
بوولێڵێ هاتۆتە سەر مێزم و
وا تازە خەریکی نووسینی شەوێکی درێژی ڕەشپۆشم
ئەنووسم تاریکی ئەئاژووم دوور ئەڕۆم، دوای تۆزێ
لەسیلەی دێڕێکدا وشەیەك بەگیرم ئەهێنێ و ئەوەستم
ڕەشنووسم ئەشلەژێو ناچارم
ئەو کورسیە شکاوەی ژێر وشەم لابدەم.
بەدەنکێ شقارتە بەرەولای جگەرەی نێوانی دوولێوم
گرێکی بچکۆلە هەلئەکەم
شەوقێکی مەیلەو ئاڵ خۆی ئەدا لە شووشەی چاویلکەم
ئەنووسم.. لە هەمان چایخانەی ڕەنگاڵەی
پەنجەرە بازنەیی نهۆمی دەیەمم
من ئێستا لە گەشتی ناو ڕەنگدا
میوانی ناوبەفری نەرویجم
لە ڕێی کام ڕەنگەوە هاتم؟!
کۆچی ڕەنگێکی سەرابیی پێشم کەوت و
منی گەیاندە نزیکی بارەگای خواو
لای بەتریقی قوتبی ژوورو.
ڕەنگەکانی  ناونیشتمان بە دەستی یەکتر ئەکوژران
بە شوێن  سپیدا ئەگەڕام
ڕەنگێك.. هێورمکاتەوەو سەری ماندووم لە هەورێکدا ڕابژەنێ.
خۆمدایە دەست کۆچی ڕەنگێکی سەرابییو خەو بردمی

بەیانییەکی تەماوی لە بۆشایی یەکەم باوێشکی زەریادا
گیرسامەوە. هەڵبەستێکی کەڕولاڵ بووم
من نەعلەتی سەرهەلگرتووی شاخو داخ بووم
ئەمویست سەری لە نیشتماندا لێ کەوتووم لە هەندەران بدۆزمەوە
کەچی نە ئەوم دۆزیەوەو نە ئەو نەعلەتەم لێبۆوە.
لە چاوەڕێی نامەیەکدا
دە ساڵ پۆستێکی بەتاڵ بووم
من هەڵم بووم
کۆچی ڕەنگێکی سەرابیی دوور بردمی
بۆ ناو خەونێ و
کەچی نە کۆچ بڕایەوەو
نە ئەو خەونەیشم هاتەدی

لە دەفری خاڵیی غوربەتا
لە ڕەنگی وشەو ڕەنگی خەم
من زیاترم نییە ئێستا لەگەڵ یەکدا تێکەڵیانکەم
بۆ ئەوەی ڕەنگێ دروست کەم
بۆ تەنیاییم تازەبێتو
لە دوای خۆیشم
چاوی ئێوەو فرمێسکتان بکا بە شایەت!.
من نانووسم
من تەنها وەختێ ئەنووسم

که نووسینم بیرچێتەوەو
که رووناکیم تیا نەمێنیَو
تاریکیی بکەم بە شایەت!
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە
دڕدۆنگن ڕەنگەکانی من
وەك دڕدۆنگیی دەمو چاوو دەروونی خۆم
لەیەك ساتدا من چاوێکم دووکەڵ کێشەو
ئەویتریان تاقە بۆ مۆم.
دڕدۆنگن ڕەنگەکانی من
چون دڕدۆنگیی دەستەکانم
لەیەك ساتدا من دەستێکم وا لەناودەستی ژیانداو
کەچی دەستەکەی تریشم هەرهەمان سات
ڕامئەکێشیَ بەرەو ڕەنگی دۆزەخێکی پڕ مەرگەسات.
دوودڵن ڕەنگەکانی من
چون دوودڵیی پەیڤەکانم
لەیەك ساتدا ڕەنگێکم ئەیکا بە تۆفو
ڕەنگێکی ترم لەولاوە ڕۆژژمێری سیاساڵە.
من خاوەن ڕەنگێکی ڕاڕام
پڕم لە قەوزەی گومانو
پڕم لە رەڵمی* نائارام
ئەو دەمەی تۆ وائەزانی بای دڵنیا من ئەباتو

* رەڵم : وردە زیخو لی بن کانی و رووبار

کەشتیم دوورە لە گەرداوو
گەییومەتە ڕۆخی ئارام
هەر ئەو ساتە من چارۆگەی دڕدۆنگیمو
مەراقێکم بنم کونەو ئاو تێم ئەچێو
بووم بە بەڵام!

وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە
لەبەرهەتاو لە تەنیاییم وردبیتەوە ڕەنگێکی زۆرکاڵ ئەبینی
ڕەنگێکی مت، ڕەنگێکی مات،
ئەوە ڕۆحی منداڵیمە لە شووشە بەندی عومرما
ماوەتەوەو نیازی نییە قەت بێدەنگیی جێبێڵێتو
سەفەر بکات
لەبەر چرای کزی ژووری: لە خەیاڵم وردبیتەوە،
ڕەنگێکی زۆر تۆخ ئەبینیت، ڕەنگێکی چڕ، ڕەنگێکی بێ بزەو
خەندە، ئەوەیش کراسەکەی دایکمە
وا لەبەری ڕابوردومداو نیازی نییە
قەت فڕێی باو ڕەنگێکی تر لەبەربکات، لەبەر ئاوێنەی دەروونما،
لە ڕاڕایم وردبیتەوە، ڕەنگێکی دڕدۆنگ ئەبینی، دەمێ زەردەو
دەمێ شینەو دەمێکی تر هیچیان نییەو بەردەوامیش بەدەوری
خۆیدا خول ئەخوات. ئەوەیش ڕەنگی ئەو ترسەیە
وەکوو خڵتە لەناو ناخما ماوەتەوەو نیازی نییە قوڵایی خۆی
قەت دەربدات. لەبەر بڵێسەی گڕێکیش لە پیاوەتیم وردبیتەوە

ڕەنگێکی سوور، ڕەنگێکی زۆر زەق ئەبینی ، ئەوەیش ڕەنگە
مەغرورەکەی نێرینەیە
لوتی کردۆتە ئاسمان‌و
نیازی نییە بێتە خوارێ‌و
جێ بۆ یەکسانی چۆڵ بکات.
لەبەر تیشکی مانگەشەوێ،
لە ئەوینم ورد بیتەوە، ڕەنگێکی
سادەی مۆری کاڵ بەدی ئەکەیت،
ڕەنگێکی هێدی‌و لەسەرخۆ،
ڕەنگێکی پڕ لە تریقە،
ئەوە ڕەنگی یەکەم کچە کە خۆشمویست،
ڕەنگێ کە ڕەنگی چاویشمەو، ڕەنگی دەنگمەو،
ڕەنگی بۆنمەو، نیازی نییە هەرگیز ڕۆژێ
یادگاری خۆی جێبێڵێ‌و
یان پێم بڵێ: کۆتاییم هات!

**(( گۆرانییەکی نەخشین بۆ ئەو کچە سەوزەڵەیەی**
**ڕەنگەکانی منی پۆشی‌و منیش دوراو دوور**
**ئەم پەلکەزێڕینەم بۆ نووسی‌و لە دواییدا کردمە ملی))**

هەر دوور بەدوور بوو بینیمی
تۆ لەولاوە سپی پۆش بوویت

لەم لاوە من هەستم ئەکرد
بەفر پرووشەم تیا ئەکات.
هەر دوور بەدوور بوو بینیمی
تۆ لەولاوە کەسك پۆش بوویت
لەم لاوە من هەستم ئەکرد
شیعر شکۆفەم تیا ئەکات.
هەر دووربە دوور بوو بینیمی.
زەردپۆش بوویتو
من لەم لاوە هەستم ئەکرد
بای خەزان تیامدا هەڵئەکات.
هەر دوور بە دوور بوو بینیمی
شین پۆش بوویتو
من لەم لاوە هەستم ئەکرد
دەریاچەیەك بانگم ئەکات.
ئەڵێم ئەگەر نزیك بیتو باوەشێکت پێدا بکەم
ببین بە هەورە برووسکەو لەیەك بدەین
ئەبێ ئەوسا لەم شارەدا
بارانی چەند ڕەنگ دابکات؟!
وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە
بە ڕەنگدا من پێ ئەزانم ئەو ڕۆژە بۆنی چیت لێدی.
بە ڕەنگدا من پێ ئەزانم ئەو ڕۆژە دەنگت غەمگینە،
یان بەختیار؟!

له ناو ڕەنگدا تفت و تاڵیت یان شیرینیت تام ئەکەم و
له ناو ڕەنگدا ئەتخوێنمەوە گەشیت یان سیس؟!
بە ڕەنگیشدا پێ ئەزانم لەوکاتەدا
تۆ بیر لەچی ئەکەیتەوە.. هەربە ڕەنگیشدا ئەزانم
تۆ ئەوساتە خۆشت ئەوێم
یاخود بێزاری له ڕەنگم!.
وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە
کە خولیای خۆم و جوانیی تۆم ئاوێتەکرد

ڕەنگێك دروست بوو نە زەردبوو
نەسپیی بوو.. نە شینی کاڵ
ڕەنگێك زیاتر هەر لەڕەنگی
گۆرانییەکی ئاوارەو
بارانێکی غەمگین ئەچوو.
کە وشەی خۆم و بزەی تۆم لە ناویەکدا ئاوێتە کرد
ڕەنگێك دروست بوو نە کەسك بوو
نە زەیتوونی و نە مۆری کاڵ
ڕەنگێك زیاتر هەر لە ڕەنگی
شپرزەیی گەڵایەکی دەم باپووسکەو
شڵەژانی کوت و پڕی تاریکیەك لەبەردەمی ڕووناکیداو
ڕەنگێك زیاتر هەر لە ڕەنگی شکانەوەی
جۆگەیەکی دوودڵ ئەچوو!.

که ئێوارەی کۆچکردنت و بێدەنگیتم
لە ناویەکدا ئاوێتەکرد
ڕەنگێك دروستبوو، نەئاڵ بوو نە یاقووتییو
نە سووری کاڵ..
ڕەنگێك زیاتر هەر لەڕەنگی ئاوابوونی مانگی سەری شاعیرێكو
سەرگەردانیی هۆنراوەیەك لەناو زمانەکەی خۆیداو
ڕەنگێك زیاتر هەر لەڕەنگی ((مەولەوی)) دوای شانزەی مارتو
هەر لەڕەنگی گڒوگیای دوای ئەنفال ئەچوو!
وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە
ڕەنگی هەژارو بێدالْدە، ڕەنگی ئاوارەو پەشموورده
ڕەنگی نانمە  لە گریانی پارویەکداو ڕەنگی ئاومە لە هەنسکی
دێراوێکداو ڕەنگی بەرەڵلاٚی ئاژەڵی بێ چەپەرو بێ خاوەنی
گوم ناوومە.. لەو دەشتەدا..
ڕەنگی ڕاونراوە ڕەنگم، لەم خەریتەی دووکەڵەدا، هێڵێ نییە
بۆ سنووری هەڵقرچانمو نە بۆشایی باوەشێکم پیا ئەکاتو
نە ڕەنگی کۆست بۆ ساتێکیش دەست لە کۆتەڵم بەرئەدات.
که دانیشتم ئاوێنەمو لە پشتەوە ئەمکرێننو تۆخ بم کاڵم
ئەکەنەوەو بجریوێنم ئەمسڕنەوەو گەر هەڵیشسم ڕەنگێکی دیم
بەسەردا قلْپ ئەکەنەوە.
ڕەنگی بێ شەوقو تریقەی ماڵی خۆمم..
وەکوو ئاوێنەی وردوخاش لە ژێر پاژنەی ئەفسەرێکدا
ڕەنگی بێ شەوقو تریقەی دەرکراوم.

چون کۆترێکی کەرکوکیی
لەهێلانەی ئەغیارێکداو
چون ڕەنگی کچە فەیلیەك لە پشتی شەوی زیلێکدا.
هەموو قولانجێ لە هاوار، هەموو بستێکیش لە ئازار،
لەباڵای ئەم نەخشەیەدا، ڕەنگی منە
توونی باباو ئاوی ئاموون ، ڕەنگی منە
من لەناو بێ ڕەنگیی خوادا،
ڕەنگی تەنیاییم گرتەوە.
لەبێ شوێنی خودایشەوە،
بێ شوێنمو بێ نیشتمان..
ڕەچەڵەکم لە بێکەسیی خوداوەیەو
شەجەرەی من ئەچێتەوە، سەر نامۆیی پیاوێ بێناو.
شەجەرەی من ئەچێتەوە، سەر تەنیایی دارێ سووتاو.
شەجەرەی من بریتییە لە پژوپۆی ئەو دووکەڵەی
گەڕۆکە ئاگرەکەی لەشیو، ئاگردانیشی بێجێیە
لەهەر شوێنێ پووشووی زەردو پزیزکێکی ژانی لێبێ،
ئەو لەوێیە!

**(( فاکسنامەیەك لە خەوێکی سەرهەڵگرتووی هەندەرانەوە**
**بۆ ناوەوەی وڵاتو بۆ هەرکەسێ قسەی ئەوو دەردی ئەوی**
**مەبەست بێ یان مەبەست نەبێ!))**
ناوم خەونەو

جگە لە ڕەنگی مۆتەکەو وێنەکانی
خەوێکی خۆشم نەدیوە.
من لە خەوما یان ئەبم بە: بەرانێکی سپیی کێویو
لە ڕەوەزێکدا ئەسووتێم..
یاخوود ئەبم بە قەڵەمێکی فیرارو، بە شەقامی
شاری خۆمدا ڕاوئەنرێم!
خەوێکی تەمەن سی ساڵم
بەیانییەك، ئەو وەختەی جادەکانی شار، بۆ یەکەم جار
جلی ترسیان لەبەری خۆیان داکەندوو،
سرودو مەشخەڵو خەندە
هەموو ڕژانە گۆڕەپان.
من ئەو کاتە پەنجەیەکی دەستی چەپی ڕاپەڕین بووم.
سێ برابووین، برایەکم لەسەیرانێکی ((گزار))دا، ئەو زەمانە
کردیان بە بوتڵێکی خاڵیی کۆلاو
لەسەر شانی حەوتی نیسان نایانەوە بەنیشانە..
براکەی دیم.. هەربۆ خۆشییو هەربۆ قاقای فەرماندەیەك
هەڵیانگرتو خستیانە ناو لوولەی تۆپێ و هەر ئەوەندەو
ئیتر برا.. لەپێش ئەسپەکەی میعراجدا..
گەیشتە ناو بارەگای خوا!.
باوکم فیشەك لغی کۆنو باڵای عەقڵی خانەبڕبوو..
دایکم تامرد.. هەر گوڵاڵە فرمێسکی تازەی ئەدایەو..
دایکم تامرد.. هەر قەلەڕەش جلەکانی خۆی ئەدایەو

من خەوێکی سی ساڵانەم.. من نیوەڕۆی سی ساڵانەم..
پڕم لە گڕەی ئارەزوو
تا لاتان بووم، ڕەنگی نانو ڕەنگی ژنو ڕەنگی ماڵێکی
بچکۆلەو، ڕەنگی پرسیاری نەترسم لە ئێوە ویست.
نانی خوێناویم پێ نەخوراو .. دەسم هەلگرت
من ڕۆژێکیان لە شەقامی ناو شیعرێکدا ژنم ماچکرد..
بە بەردەکانی رەجمەوە خێو شوێنم کەوت تا شیعری گرت.
ژوورم پڕبوو لەوڕێنەی قاوغە فیشەك، ماڵم پڕبوو،
لەچاوی دز، لەدەستی دز، لە ڕەنگی دز..
من ڕەنگێکی ترسنۆك نیم.. بەڵام هەڵدێم
هەڵدێم لە ڕەنگی بکوژی ڕەنگدانی خۆم
هەڵدێم لە چاوەکانی باوکمو هەڵدێم..
هەڵدێم لە چوارچێوەی تابلۆکانیو هەڵدێم لە نیشتمانەکەی!
نیشتمانی من و باوکم دوو ڕەنگی بەیەك غەریبن
لە ناو نیشتمانی باوکما
تەنها هەریەك ڕەنگ سوڵتانەو
ڕەنگەکانی تر کۆیلەن.
ڕەنگم عەبدەو
هەڵدێم لە نیشتمانەکەی، زەوی حەرام.
پەیڤی حەرام لەناو دەمماو
لەناو سەرماو
جووڵەی حەرام

لەناو لەشماو
ڕەنگی حەرامیش لەبەرما!
هەڵدێم لەیەك ڕەنگیی ژیان
لەپاسەوانی تەماشای
لە یاساوڵی ڕاوەستاو بەدیار ڕەنگی جیاوازمەوە
بەدیار دەنگمەوە چۆن ئەڕواو؟!
بەدیار دەسمەوە چی ئەکاو؟!
بەدیار لەشمەوە کامە ڕەنگ لەبەرئەکا؟!
هەڵدێم لەیەك ڕەنگیی ژیان.
لەپاسەوانی تەماشای
ڕەنگم حەپسەو هەڵدێم لە حەپسخانەکەی ناوسەری خۆم
لەوەردیانی تەماشای
لە ڕەنگە چەقۆکێشەکەی
کە ژن لە گیانما ڕاوئەنێو
پرسیار لەسەرما ڕاوئەنێو
ڕەنگی جیاوازم ئەکوژێ!

**((ڕەنگی بێزاریی تێبینیەك لەبارەی بەشی هەرەزۆری پیاوانی وڵاتەکەمەوە)).**

لەم وڵاتە عەقڵ قفڵو،
بێ کلیلەی مندا گەر پیاو،
لەم نیشتمانە ڕیشنەی مندا گەر پیاو،
ڕەنگ کوێریش بێو بگاتە نوختەی مزمەعیل

لەناو پێخەفی مەرگا بێ‌و
گیانیش بدا.
ئەوسایش گۆچانێکی پێیە
لەژن بدا!

**((ڕەنگێکی نارنجی هەمیشەیی و جێگیری وڵات .**
**نا ڕاستەوخۆ وەڵامێکی کورتی فاکسنامەکەی هەندەران ئەداتەوە))**
لەوانەیە بەیانییەك قەلەباچکەیێ قاچاخچی
تاقە درەختی حەوشەکەم فریوبداو هەزار گەڵای لێ بسێنێ‌و
لەدواییدا ئەویش هەڵبێ بۆ هەندەران.
((بەڵام ئەفسووس.. لەوێ هەرگیز درەختەکەم
جارێکی دی سەوز لەبەرناکاتەوەو ڕەقەڵەو وشك
لە پانتۆڵ‌و کراسێکی زەردا ئەمرێ!))
لەوانەیە بەیانییەك بەر لەوەی من لەخەو هەستم
پەنجەرەیەکی ماڵەکەم لەناو شووشەی خەیاڵێکدا
کۆشکێکی شۆخی ئەورووپای بینیبێت‌و
شەیدای بەژنی بەرزی بووبێ‌و
خۆی لەدیوار دەرکێشابێ‌و بە کڵووکۆی ئەو عەشقەوە
ڕایکردبێ بۆ هەندەران.
((بەڵام ئەفسووس..
من ئەزانم لەوێ نایکەن
بەپەنجەرەی کۆشکی شۆخ‌و

**لەگەراجی سەردابێکدا تاقو تەنیا ڕائەوەستیٚو**

**کەپیریش بوو**

**لەناو ژەنگێکدا قاوەیی بێدەنگ ئەمریٚ!))**

**لەوانەیە نیوەشەوێك ئەستێرەیەکی ناو شیعرم**

**هەر بەڕێگای کاکێشاندا، ئەویش هەڵبیٚو سەرهەلگریٚو**

**شوێن مانگێکی دوورگەکانی ئەویٚ کەویٚو**

**بچێتە ژووری ئاوەوەو**

**نەگەڕێتەوە بۆ دیوان!.**

**((بەڵام ئەفسووس**

**من دڵنیام لەویٚ هەرچەند بجریوێنیٚو**

**بەهەردوو مشت زیو برِێژیٚ بۆ کەناری گۆمەکانو**

**لەویٚ چەندە زێڕ ڕۆکاتە بەردەم شەوگار.. هەرچی بکا**

**هەرپێی ئەڵێن:**

**تۆ ئەستێرەی ئێمەنیتو بڕۆرەوە بۆ کوردستان!))**

**من ئاوازێکی نارنجیی ڕاپەڕینم**

**لەژێی گەرووی شاخو شەقام جویٚ نابمەوە**

**تا دوا کلووی نۆتەکانم و تا دوا شەقەی باڵی ڕەنگم**

**لای گیتارەکەی ((ئازاد))و**

**لای ئێوارانی ((کوێستان))و**

**لای ئەڵڵاوەیسی ڕەشتاڵەی ((عەلی مەردان)) ئەمێنمەوە!.**

**وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە**

من ڕەوازی* هاتو چۆی ڕەنگی تەنیاییم..
من ڕەوازی پیاسەی خولیاو چاوەڕوانیم..
من تەنیایی هێندە هاتوچۆی تیاکردووم
پەلکەگیایەك لەناو مندا شین نابێتو
تاقە گوڵێ لەناو مندا پێناکەنێ!.
من تەنیایی هێندە بەسەرما هاتووەو..
هێندە بەسەرما ڕۆیشتووەو.. هێندە منی پەستۆتەوەو
هێندە لیکی ڕۆژگاری خۆی پێداکردووم..
گەر بەڕێکەوت ڕیبوارێکی نابەڵەدی دنیای خەنین
بێتە سەرم، لەسەر لووسیم هەڵئەخلیسکێو ئەکەوێتو
جارێکی دی بەلای مندا نایەتەوە.
من ڕەنگێکی هامووتام* و پەڕاگەندە
مەگەر هەر بێ ڕەنگیەکەی خوا.. من ببینێو من بناسێو
مەگەر هەرتەنها ڕەنگی ئەو لەمن بچێ!.
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە!
من شاعیری ئەو ڕەنگانەم پڕن لە پەپوولەو خەیاڵ
من شاعیری ڕەنگی سادەم بۆ خۆم کاڵمو بۆ خۆم پڕم
لە پاکژیی ڕەنگی کێوىو لە ئەستێرکی ڕوونو ساکار.
نە ڕەنگە تۆخو تێرەکان، نە شاڕەنگو نە میر ڕەنگو
نە شاژنە زێڕینەکان.. هیچیان هیچیان من ناناسن،

* ڕەواز: هەر شوێنێ کە زۆر هاتوچۆی تێدابکرێ
* هامووتا: پەڕاگەندە

ئەوەی بمناسێ هەر ڕەنگی هەژارانەو ڕەنگی عەشقەو
ڕەنگی خاکەو چاوی منداڵ!
من لە سووری تۆخ ئەترسم
بەڵام چیبکەم لەوەی کە دیم..
بەڵام چیبکەم لە نیشتمانی ناو خوێناو
ئەو هەموو شیعرەی پێ نووسیم!
من ئەبوایە هەر ڕەنگی سپی باڵم بێ
هەر بە ڕەنگی کەزیی ژنو بەدەنووکی
تیتراوسکو بە پوولەکەی وردە ماسیو
بە تریفە بمنوسیایە!
بەڵام چیبکەم لە ئاسمانێ، کەبەردەوام هەورێ دێنێ
پڕە لە شەستی زامانو پڕە لەشەستی گریانو
دووکەڵ ئەکا بەقەدەرم و چاوی مێژووم
هەر بە تەنها بەرایی ڕەنگی هامووتاو
کۆست ئەبینێ!
بۆ کوێ ئەڕۆی؟! ئەی ڕەنگی هەڵبزرکاوی دەمادەمی تراویلکەو
ئەی ڕەنگی وەختی ئاویلکەو ئەی ڕەنگی پەژمووردەی پەرتو
ئەی ڕەنگی لانەوازی من؟! ئەڕۆی بۆ کوێ؟!
تۆ کوێت هەیە ڕووی تێ بکەی
جگە لە سەحرای ترافیە* و وێستگەکانی ڕەنگی هەڵمو
توانەوەتو بزربوونی

* ترافیە: ئاوارەییو غەریبی

ئەبەدیی خۆت؟! پەنا ئەبەیتە بەر کام ڕەنگ؟!
ئەچی بۆ کوێ؟!
لەسەرانسەری برینو لە جوگرافیای زوڵمدا،
لێرەو لەوێ، هەرچەند ڕەنگێ:
دەمو چاوی تێك شكاوو نەزیفی خوێنی دەنگیانو
زریکەیان لە تۆ ئەچێ!..
ڕەنگی کتێبی سوتاوو  ڕەنگی ئاوێکی ڕاوەستاو
ڕەنگی تۆیە،
ڕەنگت کوژراو بە ڕەنگی  خۆت ، تەماشاکە:
سەعات ژمێرێ خۆی خوێنی سەعاتی خۆی
بەزمان بلێسێتەوەو، شەقامێ پیادەڕەوی خۆی
بکا بە تابووت بۆ مەرگی ڕێبواری خۆی،
تەماشاکە: شاخێ بە ملپێچی
لوتکەی درەختی خۆی بخنکێنێو
لقو پۆپی تف لە ڕەگی خۆی بکاتو
تەماشاکە: پرچێ بۆ خۆی
ببێ بەپەتی سێدارە بۆ سەری خۆی، تەماشاکە:
پەنجەرەیەك چاوداگرێو
دەست درێژکاو پاچ بێنێتە سەر ژووری خۆی..
ئەبێ ئەو ڕەنگانە چی بن؟!
من بێ دەنگم و دە تۆ خۆت ناویان لێ بنێ؟!
ئەچی بۆ کوێ؟!

**گەر بەتەمای لە ناو ڕەنگێکی  دیکەدا سەرمات گەرمی بێتەوە؟!**
**گەر بەتەمایت لەناو باوەشێکی تردا**
**جێگەی ڕەنگت ببێتەوە؟! ڕەنگێکی گەوج!**

**ئەڕۆی بۆ کوێ؟! ئەی ڕەنگی ژنی ڕۆژهەڵات**
**((ڕەنگی ژنان: وەختێ تێکەڵ بە ڕەنگەکانی قامچیو**
**ڕەنگی تەباخی موبەقو**
**ڕەنگی پێڵاوی پیاوانو**
**ڕەنگی مایینی ڕەسەنو**
**ڕەنگی عەقڵێکی نوقسانو**
**ڕەنگی هەقی یەك لەسەر سێو**
**وەختێ تێکەڵ بە ڕەنگی دەوری بەرد ئەکرێ!))**
**ئەڕۆی بۆ کوێ ؟! ڕەنگی منداڵی ڕۆژهەڵات**
**((ڕەنگی منداڵ، وەختێ تێکەڵ: بە ڕەنگی دار حەیزەرانو**
**ڕەنگی شەقو ڕەنگی ترسو ڕەنگی پرسیاری قەدەغەو**
**ڕەنگی حەیوانی بچکۆلەو ڕەنگی کەڕییو ڕەنگی لاڵییو**
**تێکەڵ بە ڕەنگی زراوچووی ناو خەوێکی زڕاو ئەکرێ))**
**ئەڕۆی بۆکوێ؟!**
**ئەی ڕەنگی بۆری خەرافات؟!**
**ڕەنگی درنج.. ڕەنگی پەڕۆ.. ڕەنگی زرگو ڕەنگی فاڵو**
**ئەی ڕەنگی تۆخی پێستێکی هەزار ساڵە**
**ڕەنگی خەنجەری ئەزەلیی سەر گەردنمو**

ڕەنگی خوێناویی شەوانەو ڕەنگی ڕۆژانەی کارەسات!
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە!
با دەم‌وچاوی ئەمشەوتان لە شەوانی ترتان نەچێ
با هیچ نەبێ بۆ چەند ساتێ بتانبەمە نێو بەرایی ڕەنگێکەوە
کە زەردێکی ئێجگار کاڵەو پەنجەرەی گوڵە لیمۆیەو
بەژنی کچێکی کەرکوکەو لە قەڵاوە ئێوارانێ
زەردە.. زەردە..
بەسەر عەشقماندا ئەڕوانێ!
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە
با ڕەنگەکانی ئەمشەوتان لەشەوانی ترتان نەچێ
با هیچ نەبێ بۆ چەند ساتێ بتانبەمە ناو قوڵایی ڕەنگێکەوە
قاوەییەو بەڵام کاڵەو..
شێوەی لە خۆڵ‌و گڵمتکەو
پێستی لە پێستی ئاسکەو.. لەگەڵ ((ئامەد))
لەیەکیان جوێ ناکەیتەوەو
لە چۆڵەوانی ڕەنگماندا ئەبارێنێ!.
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە
با بیرەوەری ئەمشەوتان لەشەوانی ترتان نەچێ
با هیچ نەبێ بۆ چەند ساتێ بێنە ناو ئەو ڕەنگانەوە:
کە سووری زەق، کە سەوزی زەق
کە زەردی زەق ، هونەری زەق

هەموو دێنەوەو ئەبنەوە بە یادی ((حەسەن فەللاح*))و
لە ژووری ساردی حەمامدا لەسەر دیوار وەکو جاران
بۆ یەکەم جار چاوی شار زەق ئەکەنەوەو
ڕەسم ئەکەن بە ئاسۆکانی سەرنجدان.
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە!.
با خولیاکانی ئەمشەوتان لە شەوانی ترتان نەچێ
با هیچ نەبێ بۆ چەند ساتێ بتانبەمە نێو بەرایی ڕەنگێکەوە
کە ئەویش  مرد
مرد وەك ڕەنگی تاراو خەنەو ڕەنگی شاییو
ڕەنگی مارمارۆکەی سەرتەندوورو یان ڕەنگی تێکەڵی بەفرو
دۆشاو!. مرد وەك ڕەنگی پشکۆکانی ناو مقەڵیو
مرد چون ڕەنگی ئێسك سووکی باڕەکەوی بەرهەیوانو
ڕەنگی گۆزەی هاوینانی سەر سەربانو
ڕەنگی چیغو مانگەشەوو
مرد وەك ڕەنگی کارێزەکەی وەستا شەریف:
ئەویش ڕەنگی سادە سادەی خۆشەویستیی شارەکەم بوو
سادە سادە .. ساکار، ساکار
کە لە ڕەنگی قسەکانی خاڵە رەجەب، لە چوڕەی شیرێکی
تازەو، لە کارژۆڵەی تازە زاوو، لە ڕەنگی شیعرێکی
ئازای ئەحمەد* بەگو، لە سێ بازی ناو سەوزە گیاو،

---

* حەسەن فەللاح: لە پێشڕەوەکانی هونەری شێوەکاری لە کوردستانی عێراقدا.
* ئەحمەد بەگ: مەبەست لە  (حەمدی) شاعیرە.

له ڕەنگی حەمامیی ژنو، له کەڵەشێری سەر بارەدارو،
له ڕەنگەکانی چاوبازی و سەرەتاتکێی نێو دەروازەو،
له تاقو شووشەی پەنجەرەی ڕەنگاو ڕەنگو
له چریکەی ((دیلان)) ئەچوو!

**((تکایە سەنج بدەن من بەو شێوەیەی کەلە خوارەوەو**
**لەچەند نمونەیەکدا ڕیزبەندم کردوون،**
**بەو جۆرە، ڕەنگی شتەکان تێکەڵ ئەکەم بۆ ئەوەی پێکهاتەی**
**ڕەنگی تازەیان لێ دروست بکەم))**
له پێکێکدا ڕەنگی شیعرو ڕەنگی شەرابو ڕەنگی ژنو
ڕەنگی مۆسیقام کرد بە سەریەکدا، له دواییدا ڕەنگێ
لەدایکبوو تازە ناوم نا ((ڕەنگی ئەوینیی))
کە قومێکم لێ خواردەوە
ڕەنگی ئەوینیی کردمی بەشەماڵو
بەمانگەشەوی هاوینیی.
له ژوورێکدا ڕەنگی ڕۆمانو ڕەنگی فەلسەفەو
ڕەنگی زەینو ڕەنگی نووری پێغەمبەریم لەناو یەکتردا
تێکەڵ کرد، له دواییدا ڕەنگێ لەدایك بوو تازە
ناوم لێ ناو پێم وت ((ڕەنگی بلیمەتیی))
کە خۆم هەڵکێشا له ڕەنگی بلیمەتیی
له پاش تۆزێ ئیتر من بووم
بە خەیاڵی ناو ژوورەکەی ((دستۆفیسکی))

له واگۆنی غەریبیدا ڕەنگی شەوو ڕەنگی وەڕسبوونو
ڕەنگی نیشتمان و ڕەنگی هەموو هاوڕێکانم و ڕەنگی تەمو
ڕەنگی دووکەڵی  جگەرەم تێکەڵ یەك کرد
ڕەنگێ لە دایك بوو تازە
ناوم نا ((ڕەنگی  تەنیایی))
کە چوویشمە ناو ئەم ڕەنگەوە
لە پاش تۆزێ، ئیتر من بووم بە بای وێڵو
بەشەقامی چۆڵو هۆڵو بەئازاری پیاسەکەری کەس نەناسو،
بەچەترێکی بەجێماوی ناو ترێنو، ئیتر من بووم بە
پۆستێکی لەڕێ ونبوو.. ئیتر ڕەنگم، بوو بە ڕەنگی
جانتاکەمو، ڕەنگی جانتام بوو بە ڕەنگی ژوورەکەمو
ژوورەکەیشم بوو بە ژووری نالیی و حاجی!
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە
ئای کە ڕەنگی ترسنۆکم زۆرە
من بۆ خۆمماڵەکەم  پڕە لەو ڕەنگانە
لە ڕەنگی کوێر
لە ڕەنگی لاڵ
لە ڕەنگی کەڕ
ئای کە ڕەنگی ترسنۆکم زۆرە
بۆ نمونە یەکێ لەو ڕەنگانەم ڕۆژێ
ڕۆژنامەیەکی گرتبوو بە دەستەوە
ڕەش و سپیی ئەخوێندەوە

**ڕۆژنامە ناوی ((ڕاستیی)) بوو**
**دوو هەنگاو لەولای ڕەنگمەوە**
**جامانەیەك ڕەش و سپیی لەملی گوڵێ ئاڵابوو**
**ڕەنگم دەستی لە ڕۆژنامەکە بەرنەدا**
**ئەو هەر ڕاستیی ئەخوێندەوەو**
**گوڵیش خنکا.**
**وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە..**
**ڕەنگی تەنیام ، ئاو پێی ئەڵێ لە شەپۆلم نەرمتری**
**گوڵ پێی ئەڵێ لە هەناسەم ناسکتری**
**وریای ڕەنگە تەنیاکەم بن..**
**ئەی بای دووری و لێك دابڕان!**
**وریای ڕەنگە تەنیاکەم بە**
**لەو سەرەوە کە هەڵتکرد لەم خوارەوە**
**خۆڵ نەکەیتە چاوانمەوەو ئاوم لێڵ کەیت**
**چونکە ئێستا لەخوار تۆوە شیعرێك لەمن ئەخواتەوە**
**بە روونی نەبێ مەراقی منی ناوێ و**
**بە تازەییش نەبێ هەرگیز**
**هەڵوەرینی گەڵاکانی خەونی ناوێ**
**وریای ڕەنگە تەنیاکەم بە!**
**بە ئەسپایی پێت لەسەر زەردەی دابنێ و**
**بە هێواشی بەلای پایزیا گوزەرکە!**
**نەبادا خەمی خەو سووکم، نەبادا ژووری خەو سووکم،**

کسپەی بێدار ببێتەوەو، یان لەوحەیەکم داچڵەکێ.
بە هێواشی بەلای ئێوارەمدا ڕەتبە
نەبادا ئەم کۆچی ڕەنگە، پەڕەسێلکەی ڕەشو سپیی،
پەڕەسێلکەی لاواندنەوەی نزم فڕی ئەم حەسرەتەی لێ بتەرێ!
ئەی کۆچی ڕەنگ! کۆچی بینین
بەلای هەر دەوەنێکدا ڕەت ئەبی، پەپوولەیەك لە تەماشای
تەڕی منو یەکدوو دڵۆپ لەم بارانە ئاوارەیەم بەجێدێڵی
بەلای هەر یادێکدا ئەڕۆی، وەنەوشەیەك لە پەخشانو
لاپەڕەیەك لە چیرۆکی ڕەنگەکانم بەجێدێڵی، ئەی کۆچی ڕەنگ!
ئەی ڕەنگەکانی منداڵیی، ئەی ماسیە بچکۆلەکانی نێو ڕووباری
پیرۆزەیی، ئەی ڕەنگەکانی دڵداریی! ئەی ئارەزووی پڕ لە قوڵپی
ڕەنگاوڕەنگو ئەی قریوەی وەك زەماوەند ڕەنگاو ڕەنگ و
هەستو نەستی ئەرخەوانیی!
((ئەو وەختەی دار کلۆر ئەبێ،
ئینجا ئیتر ئەچێتەوە بۆ لای پژوپۆی دێرینیو
بیر لە پەنجەرەی سەوزی ڕابوردووی ئەکاتەوەو ڕائەمێنێ.
تا مردن نزیك بێتەوە، پۆستەچیەکانی یادگار،
ژمارەیان زۆرتر ئەبێو
ڕابوردوویش زیاتر ئەمدوێنێ.
وەختێ چاوی ڕەنگ کز ئەبێو
ئاوی ڕەش دێ، ئینجا ئیتر، چاوی ناخم، ڕوونتر لە چاوی
ئێستاکەم، ڕەنگی دوورو، ڕۆژی بەسەرچوو ئەبینێ))

ئەی ڕەنگەکانی منداڵیی! ئەی ڕەنگەکانی دڵداریی!
جارێکی دی لەگەڵ خۆتان بمبەنەوە بۆ ئەو ڕۆژەی:
ئەچوومە ناو بڵقی کەفی سابوونەوە
نە خوێندنەوەی کاتژمێری دەستی وەختو
نە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکانی خەفەتو نە ڕەنگەکانی ئیرەییو
گەورەبوونم نەئەزانی!
لاسکە گیابوومو لە ڕەنگم نەئەگەیشتم
هێشتا فێری درۆی ڕەنگو
درۆی دەنگو درۆی تەماشا نەکرابووم.
ئەچیتەوە بەر ئاوێنە بچکۆلەکان
سەیری ڕووخساری خۆڵاویی و برینێکی ژێر چەناگەی
عەجولیی خۆت ئەکەیتەوە.
بەشانەی تەختە قژی پڕ دائەهێنی.
کلۆیەك شەکر ئەخەیتە ناو دەمتەوە.
لە ناکاودا چۆلەکەیەك لە پەنجەرەی کراوەوە دێتە ژووریٚ
پەنجەرەکە دائەخەیتو لەناو ژووردا ڕاوی ئەنێی،
خۆت ئەکێشی بە دۆڵابدا،
شەکردانێكو قوتویەك بەرئەبنەوە.
کاشیەکی خۆشەویستی دایکت ئەشکیٚو
لەترساندا ئیتر ڕائەکەیتە دەریٚ.
ئەچیتەوە بەر پرژەپرژی دڵداریی
یادگارت تنۆکی سارد لێی ئەداتو دائەچڵەکی.

((کووچەی گەڕەك لە هاوینانی جاراندا
دەمەو عەسر دێتەوە ناو تەماشاتو
ئاوڕشێنێ لەبەر دەرگای ماڵی ياردا
ڕەنگێکی مەيلەو قاوەيیو بۆنێکی خۆش لە خەياڵتا بە جێدێڵێ
ئەچيتەوە بەر پرژەپرژی دڵداريی
بۆ يەکەمجار شەش حەوت دێڕێکی شڵەژاو
ڕەنگی کورتو ڕەنگی درێژ، وشەی بەرزو وشەی نزم،
خەتی ترساو، لە کاغەزێکی شين باودا، هاتنە لامو
بۆ سەرنجم: شەش حەوت ڕيزە داری باخو شەش حەوت
پێپليکەی خۆزگە بوون. شەش حەوت دێڕێ، لە کاغەزێکی
شين باودا، شەش دار گوێزبوون لەکەنار گۆلێکی مەنگدا
لە ڕۆژێکدا من هەزار جار خۆم لەو شينە هەڵئەکێشاو چاوەکانم
چون سمۆرە ئەچوونە سەر ئەو دارانەو  بە پليکانەی ڕستەيشدا
ئەهاتنە خوار. نامە ئەبوو بە جۆلانەو تيا ئەخەوتم.
زستان ئەهات نامەم ئەکرد بە چەترێكو
لەبەر بارانی عەشقێکدا هەڵم ئەدا.
کاغەز ئەبوو بە بەلەمو سەوڵەکانيش هەردوو دەستم. نامە
ئەبوو بەئاسمانو ئيمزای ئەبوو بە فڕۆکەو مەراقيشم
بەپەروانەو ئەخولايەوەو سەرئەکەوتم. شەش حەوت دێڕێ
لە کاغەزێکی شين باودا.
حەرفەکان ئەبوون بە هەنگو
کونی شانەو حەزيان شيلاويی ئەکردم.

وشەکان ئەبوون بە گردوو هەڵئەگەڕام بەسەریانداو لەدامێنی
نامەیشەوە ناوەکەی بانگی ئەکردم.
شەش حەوت دێڕێ لەنامەیەکی شین باودا.
لەسەری دێڕدا ڕووباربووم رامئەکردوو
لە کۆتایی دێڕەکاندا تۆڕی پرسیارێ ئەیگرتم.
لەژێر بەردی نوختەکاندا ئەتاسامو
لە پێچەکانی وێرگولدا گێژ ئەبوومو
لەنیشانەی سەرسوڕماندا وەك کەروێشکی بەرشەوارە
ئەوق ئەبووم و بەهەورازی وشەی ترسا سەرئەکەوتمو
لەسەرەوە لەناو وشەی ((گیانەکەم))دا
کزەبایەك لێی ئەدامو لەدواییشدا لەسەر کورسی
وشەی ((بەڵێن)) پشووم ئەداو دائەنیشتم
یەکەمجار بوو لە کاغەزێکی شین باودا ببم بە مەلی شاعیرو
لەڕەنگی خۆشەویستیدا تا لای ڕەنگی پیرۆزەیی
کچێ بفرم!
ئەچیتەوە نێو ڕەنگە سادەکانی شار
ئەبیتەوە بە شەش حەوت ساڵ
ئەبیتەوە بە پەشمەكو بەماجوومیو
عەزیزییەکی خەت خەتی شین لەبەرداو
تۆپێکی پەڕۆ لەکۆنە کراسێکی سووری دایکت
لەبەر قاچی پێخاوسداو پێکەنینت تۆزاوییەو
لەناو هەناسەسواریدا، ناوبەناوێ، قسەکانت ئەخنکێنو

لەناکاودا خۆت ئەکێشی بە پیاوێکداو
ئەویش قژی بژت ئەگریو تۆش سست ئەبیو
لەو لاشەوە باریکە ئارەقی لاجانگ
خەتی قوڕاویی سەر دەمو چاوتەو ئەخزێتە خوار.
ئەچیتەوە نێو ڕەنگە سادەکانی شار
لەقەراغ شار وەکوو پیشۆك لەبن عەردا دەربهێنی.
بیرەوەریت هەڵئەکۆڵی.
وەك دەست بکەیت بە شارە زەردەواڵەدا
ڕابردووی خۆت ئەوروژێنی:
ڕەنگەکان دێنە دەرەوە
بە چواردەوری سەروملتا گیزەیان دێ
ئەترسیتو ناترسیتو بەدەستێ دەریان ئەکەیتو
دەستەکەی تر لە کونی گوێسەبانەدا بۆ زەڕنەقووتە ئەگەڕێ!
لە پڕێکدا قاوەییەکی چزوودار پێوەت ئەدا
زیرەیەکی تیژو خێرات لێ هەڵئەسێ.
لەسەر پشتی هاوڕێکەت دائەبەزی.
لەپاش تۆزێ. گوپەکانت بەرزونزم، چاوێك بچوکتر لەویتر،
ڕوومەتێکیان زۆر سوورتر لەویتریانو تا بناگوێت هەڵئەئاوسێ.
ئەچیتەوە ناو ڕەنگەکانی منداڵیی
لە کۆڵاندا.. ڕەنگت ئەکڕی
فڕفڕۆکەی سەوزو سوورو.. هەوا کپەو
تۆ ئێستاکە لە چاوەڕوانی ((با))یەکدای بێتو لێی باو

دووسێ جارێ بخولێتەوە.
ڕەنگەکان ئەڤروسکانەوە لە کولانەی کەلاوەدا..
ڕەنگی تووتك، سپیو خرپن. کلك کلاّفە.. ڕەنگی تازە.
لەولایشەوە. دوو ڕەنگی قاوەییو سپی
پێوە ئەبوون، پێچەوانە، یەکتریبان رائەکێشا
ڕەنگەکان لەناو یەکتردا شەڕیان ئەکرد
ڕەنگەکان گیف ئەبوونەوە
تا خوێن لە پۆپنە ئەتکاو هەتا یەکێکیان ئەبەزی.
ئەمجارەیان ڕەنگەکان ئەبریسکانەوە:
لە ناو حەوزی بن بەرد درێژی، بەر هەتاوی مزگەوتێکدا
ڕەنگەکان ئەبریسکانەوە:
پشتی ماسیی و پوولەکە بوون:
زەردێکی کاڵ لەناو کەسکێکی زۆر تۆخداو
نوختەیەك سوور لەبن گوێداو
بەرسکێکی سپی سپی درەوشاوە:
کە شلێپەی گەورە ماسییەك لە پڕێکدا لەسەرلاوە
نیشانی چاوی تۆی ئەدا.
وەختێ کەئاو ڕائەچڵەکی
خەیاڵێکی ڕوونو بێگەرد لەناو سەرتەوە هەڵئەقولاّو
لەو ساتەدا حەزت ئەکرد بۆ خۆیشت ببی بەماسیی!.
وا ڕەنگەکان ئەمجارەیان، حیلەئەکەن، لۆقەیانە
یان لەغاردان، ڕەشو سپیی، یان قاوەیی، یان سپی بۆر

**وا ڕەنگەکان پڕمەیانە.. زستان بوایە**
**لە کونە لوتی فشەوە، هالاوێکی مەیلەو شیریی**
**دەرئەپەڕی. جووتە ئەسپی هەنیسك سواری عەرەبانە.**
**ڕەنگیش تامی تامی ئەدا.**
**ڕەنگیش دەمی پڕ ئەکرد لە ئاوو**
**ڕەنگیش نەوسی ڕەنگاوڕەنگی ئەجوولانو**
**هاوین بوایە لەڕەنگە مەیلەو سەوزەکەی بەرسیلەداو،**
**یان لە ڕەنگی مەیلەو سووری ڕێژراو بەسەر قاشەکانی ترۆزیداو**
**وەختی تریش، لە شرووبی ڕیزکراوی سەر سینیداو،**
**تامەکانیان بەڕەنگینیی، لەناو ملچەی هاتوچۆیەکی نەوسنا،**
**ئەچوونە ژێر زمانەوەو خۆیان نیشانی من ئەدا.**

**ڕەنگیش هەڕەشەو گوڕەشەو ترسی هەبوو:**
**چون ڕەش لەشەوی ژێر چوخمەکانداو،**
**لەناوی خولەپیزەداو، یان ڕەنگی گڤەو لوورەلوور**
**لەشەوانی بەفرانباری قەراخ شاردا.**
**ڕەنگەکان ئەشبوون بە مردن:**
**بۆ وێنە وەك: ڕەقبوونەوە لە سپیداو**
**خنکان لە قولایی شینداو**
**سووتان لەشالاوی سووردا.**

**((بۆ ئێستەیش، کورتە چیرۆکێکی ڕەنگاڵەیی شیعری،**

**دەم بەخەندە، پێشکەش بە منداڵانی دۆڵی جافەتی ئەکەم.**
**کە نزیکەی دووساڵێ شیعری ((پ.م))م لەسەردەمی دووکەڵو ناپاڵمدا**
**لەنزیك برسێتیو نەخۆشیو ڕەنگی هەڵبزڕکاویانەوە ژیا)):**

لەو ڕۆژەدا، ڕووداوی سەیر، ڕوویاندا
گا بەردێکیان، ڕەنگ قەوزەیی، وەك باوکیان بێ
بە بەردەکانی دیکەی وت:
ئادەی کۆمەڵێکتان ڕاکەن بۆ ئەو هەردە
دوو دوو سێ سێ لە خوارەوە تا سەرەوە
خۆتان بکەن بە پێپلیکە
بۆ ئەو پیاوانەی کە هاتوون، لە شارەوە
شەقامی نانو ئاشتی و گوڵ
ڕابکێشن بۆ ئەم گوندە.

لەو ڕۆژەدا ڕووداوی سەیر ڕوویاندا..
لە بێشەدا، پیرە درەختێ، ڕەنگ خۆڵین
وەك باپیرە گەورەیان بێ..
ڕووی دەمی کردە هەرهەموو درەختەکان:
ئەبێ ئێستە کۆببینەوە.. بڕیار بدەین
خۆم لە پێشتانەوە ئەڕۆم، کێ ئەیەوێ بەدوامدا بێ،
لقو چڵی کۆکاتەوە.. بەڵام پاشگەز نەبینەوە..
خێرا ڕاکەن.. بچین خۆمان بکەین بە پرد لەسەر ئاوێ
بۆ ئەو کارژۆڵەو بەرخانەی عاسیی بوون..

**لەبەر لافاو ڕێیان نییە بپەڕنەوە!**
**لەو ڕۆژەدا ڕووداوی سەیر ڕوویاندا..**
**دەمەو عەسرێ ڕەزو باخی ((مام سلێمان)) ئاگری گرت**
**ڤیژە لە هێشووە کچەکان، هاوار لە کالیاری کوڕو،**
**لە منداڵانی شەمامەو، لە شۆڕەبی ژنان هەستا!.**
**چۆلەکە ڕەنگ گۆگردیەکان، کۆترە ڕەنگ شینکەکانو،**
**قولنگە ڕەنگ زیوینەکان، لەسەر کەژێ کۆبوونەوەو،**
**هەموو وتیان:**
**ئەوەی لەدەستی ئێمە بێ، هەرئەوەیە، لەم کۆستەدا**
**دانەنیشین وەك بەردودار، ئەبێ هەستین، هەر ئائێستا**
**هەڵفڕینو هەموو بچین، لە گۆمەکەی ئەودیوەوە پەیتا**
**پەیتا لە دەنووکدا ئاو بێنینو بیکەین بەسەر ئەم ئاگرەدا!**
**وەرنەوە ناو ڕەنگەکانم**
**دەنگ فێری یەك جۆری بیستنو ئاخاوتنو**
**بۆن فێری یەك بۆنکردنو**
**هەست فێری یەك هەستکردنو**
**ڕەنگ فێری یەك جۆر ڕوانین و یەك تەماشای،**
**دنیای کردم.**
**بەڵام ئاخر من تا ئێستا**
**ئاوەزێکم نییە فێری هەڵکۆڵینو جیاکردنەوەو،**
**لێك نەچوونو، فرە هزرو**
**فرە فڕینو خوێندنو**

**ناو جودایی فره ڕەنگەکانم بکات!**
**من یەك ڕەنگو من یەك چاوم، من دەنگدانەوەی دەنگی دیم.**
**من سواری مێژووی گلانو سواربوونەوەو دیسانەوە هەر گلانم.**
**نەئەزموونم ڕەنگێ لە دوای خۆی جێدێڵێو**
**نەهەواری ڕەنگەکانی سبەینێشم پێ ئەزانم!.**
**من بۆ خۆم خاڵی شپرزەی نێوانێکم ناوی نییەو**
**ڕەنگی نییەو نە مردنمو نە ژیانم!**

**وەرنە ناو ڕەنگی جوداوە**
**لە گفتوگۆی ڕەنگەکاندا،**
**فەزای مانا بەرینترو، باڵندەی ڕەنگ جوانتر ئەفڕێ.**
**لە گفتوگۆی ڕەنگەکاندا،**
**قۆزاخەکان ئەکرێنەوە ڕەنگی گەورەو**
**ڕەنگی بچوك لەسەریەك مێز کۆئەبنەوە**
**چاویان بە ڕەنگدانی یەكو**
**ڕەنگی گەشو ڕەنگی سیسو خەوشی یەكو**
**پەڵەی یەكو ئەودیو ڕەنگەکان ئەکەوێ.**
**لە گفتوگۆی ڕەنگەکاندا ئازادیی دێ گوێ ئەگرێتو**
**ڕەنگی دەنگیش، بێ دەمامك دەرئەکەوێ،**

**((بەشێك لە مێزگردێك لە نێوان چەند ڕەنگێکی جیاوازدا،**
**هەر ڕەنگەو قسەیەك،**

**هەر ڕەنگەو لە جوانیی و پیرۆزی خۆی ئەدوێت‌و**

**هەر ڕەنگەی چیرۆکی خۆی ئەگێڕێتەوە))**

**یەکەم ڕەنگ: دوابەدوای دووەم وێرانەو دووەم مردنی جیهانیی**

لەسەردەمی ڕەنگی نوێدا.

من کەهاتم هەر تەنها ڕەنگی شەوەزەنگ لەم ناوەبوو

ڕەنگی ئێوە لێرە نەبوو. بەشیری بەرقی مەرگی خۆم،

من جەستەی ڕەشم شەقکردوو دەیجوورم گۆڕی بە ڕەنگی

ئەرخەوانیی‌و لەڕوانینما گەراکانی تیشکم هانی و پاشەڕۆژیش

لەبەر هەتاو لێی وەرگرتم. من ئەو ڕەنگەم. لە ناو بێدەنگی

شەوێکی گرژو مۆندا، لرفەم کردوو شاخ هات بەپیر کلێپەمەوەو

لە ڕۆحی ئاودا داگیرسام. من ئەو ڕەنگەم لەگەڵ کۆچما، کۆچم

بە ڕەنگی ترس کردوو، لەگەڵ خۆمدا  زەردەخەنەی

چراکانی چوارچرام برد.

لە ترۆپکی هەلگوردەوە ڕەنگی ئەیلولم ڕژانە ناو خەمی

هەمووتانەوە. ئەوکاتەی ڕەنگی ناوی من لەسەردا ئەزرنگایەوە،

ڕەنگی ناوی تر هەرنەبوو.

گەڕامەوەو چۆکم بە بەردی تاریکیی داداو،

لەناو کرێوەدا زام‌و

لەدامێنی شەفەقێکی مێژووەوە کەوتمە خواریێ‌و

لە کێوانی ڕچ‌و ڕژدی*

---

* ڕچ‌و ڕژد: سەخت‌و عاسی

زەمانێکی بێ دڵو بێگوێو بێ چاودا حیلەم
کردوو من ڕەنگێ بووم خۆم خۆم ڕسکان.
کەمن هاتم ڕەنگ نەمابوو..
دەنگ نەمابوو. من لە ڕووشداو* لە ڕمژوەی* کارەساتداو
لە هێلکەی خڕکە بەردەوە سەرم جووقاو
هاتمەدەرێو بووم بە ڕەنگێکی شیرینو
بووم بە پەیژەکانی هەتاو
لە سەردەمی ڕەنگی نوێداو
لە چاخی ڕەنگی یاخیدا،
من یەکەم ڕەنگ بووم کە لە دوای هەرەسی هەموو ڕەنگەکان،
لە دوای گلانی ئەستێرەو لە دوای هەڵاتنی دارو
دوای ڕاکردنی دارستان
هەستامەوەو سەرکەوتمە سەر ملەی ڕەدەو*
سەری خۆمکرد بە مانگەشەو
بۆ هەمووتان.
ئاخر من بە ڕەنگی مەرگم
مۆمی سەرو ملی چیای کوژاوەم داگیرساندەوەو
دیسانەوە ڕەنگی خەوتووم لە شەقامو گۆڕەپاندا هەستانەوە!

دووەم ڕەنگ:

---

* ڕووش : بەڵاو موسیبەت
* ڕمژوە: تاڵاوی ژیانو نەهامەتیو کارەسات
* ڕەدە: دوند، لوتکە

دێرینترین ڕەنگی هەژار، لەسەر دیواری زیندانو
لە ڕەنگی زنجیردا منم، ئازایەتی ڕەنگ لە مندا
بۆ یەکەمجار لەناو گەرووی بەورێکەوە
زریکاندیو عێراقی سێدارەی تۆقان!
زۆرانبازیی نێو ڕەنگەکان
ململانێی نێو ڕەنگەکان
لەسەری مندا پژانو
لە زەنگی مندا گوێچکەیان کرایەوەو
سەرمایەی ڕەنگم دۆزیەوە یەکەم جاریش
هەرمن وتم: بەهەشتو دۆزەخ لێرەنو لەسەر زەمین
لە زۆرانبازیی ناو ڕەنگا..
لە چەوسانەوەی ناو ڕەنگا..
شووشەی مەرەکەبی من بوو
وەختێ سەری خۆی کردەوەو
ڕەنگی بەسەر ژاندا ڕژان..
وشەی هەژار چووە ناویو
برسێتی خۆی تێهەڵکێشاو
بێدەنگیی ڕەنگی هەڵگیرسان
بوومەلەرزەی کتێب بوومو، هاوارنامەی
یەکەم مانفێست، شەو لە مندا رووناکیی بوو
شەقام لە مندا یاخی بوو
پاریس لەناو ڕەنگی مندا سووری پۆشیو هەستایە پیان!

**یەکەم چەکوش سەروملی قورسی من بوو**
**کە برسێتیی دەستی دایەو مانگی خەونی بۆ داگرتمو**
**بەسەر دەرگاما دایکوتیو**
**لە دواییشدا مانگ بوو بە نان!**
**ڕۆژێکی سارد، ئۆکتۆبەر، مشتێ لە ڕەنگی هەژارانی**
**لە مەیدانی سووردا تۆو کرد**
**هێندەی نەبرد ڕەنگ بازیداو ڕەنگ لە زەریاکان پەڕیەوەو**
**هێندەی نەبرد لافاوی سوور دنیای هەلگرت**
**هەر منیش بووم بۆ یەکەم جار**
**ڕەنگی نوستووی ژنانم خەبەر کردەوە**
**مەمکم کردن بە گلۆپی ڕێگەوبان و نێو کارگەکان.**
**پرچم کردن بە ڕێزە ڕێزەی باران و بە گەنمو جۆی نێو کێلگەکان.**
**دەنگم کردن بە شەقەی باڵی چون یەکیی بۆ فڕینو**
**بۆنم کردن بە بۆننامەی نیوەی خۆمو ((ڤالێنتینا تریشکۆڤا))م**
**دا بەکوڕی ئەستێرەکان بۆ یەکەم جار.**

**سێهەم ڕەنگ:**
**گەورەیی ڕەنگ لە گەورەیی ڕەنگدانەوەی پەیامدایە**
**من ئەو ڕەنگەم.. کە ڕەنگی ڕاستیی و ڕەنگی خواو**
**ڕەنگی دواپەیامی ئەوم لە چاودایە!.**
**من سوورەتی کەڵەپشکۆی جەهەننەمم بۆ گوناه و**
**من سوورەتی شنەشنی ناو بەهەشتو قوڵپە قوڵپی**

کەوثـەرێکی ڕەنگ زیوینم.. بۆ بەهەشتیی.. لەناودایە.
وەختێ بدوێم
حەقیقەت ڕەنگەو ئەبارێ.
حەقیقەت ڕەنگەو هەڵئەکات.
ئیتر ئەوسا ڕەنگ نامێنێ لەبەر ڕەنگما مت نەبێتو
دەنگ نامێنێ لەبەر دەنگما نەمەیێتو شاخ نامێنێ
لەبەردەمما کڕنووش نەبات..
ئەشێ هەرچی ڕەنگە بمرێ
بەڵام ڕەنگی من لە ڕەنگی ئاسماندایەو
بەڵام ڕەنگی من لە ڕەنگی ئایەتەکانی موتڵەقو
لە نەهێنیی ڕەنگەکانی گەردووندایە
من ئەو ڕەنگەم گومان بەلای مندا ناڕوا،
من لەسەروو پرسیارەوەم.. من وا هاتووم،
رابوردوو بگەڕێنمەوە بۆ ناو ئێستاو داهاتوو ڕەنگ کەم،
بە ڕەنگی تەقویمەکانی هیجرەتو خەوی شمشێری
دەستی سەوز بهێنمەدیو هەموو دنیا بە ڕەنگی
پیرۆزی دەنگم ڕەنگ بکەم و ڕەنگی گومڕایش
بەمە دەست نێڵەنێڵەکەی دۆزەخی خوا!

**((دەنگی خۆتێهەڵقورتانی ڕەنگێکی دانیشتووی هۆڵەکە))**
تا ڕەنگ هەست بەنوقسانی ڕەنگی خۆی نەکات
لە ڕەنگی کامڵبوون ناگات

هەتا پرسیار وەکو هەوا ئازاد نەکەین
نە ژیان و نە داهاتوو وەڵامێکمان ناداتەوە
من ئەو پەندەم لە زێیەك بیست، وەختێ وتی:
من لە لیخنی خۆمەوە ڕوون بوونەوەی خۆم بینیوەو
لە ئازاری ڕەنگەکانما خۆم دەرداوە!.
**((سەرئەنجام ئەو مێژگردە شەڵاڵی ڕەنگی سووربوو.**
**ڕەنگی کوشتن، ڕەنگی سڕینەوەی یەکتر ڕەنگی زاڵبوو.**
**دەنگی ڕەنگێکی نادیاریش کەلەودیو پەردەی مێژگردەکەوە،**
**هۆڵی داچڵەکان بەمجۆرە دووا))**
وەك حیکایەتی ڕەنگ پەڕیوو
ڕەنگ هات.. ڕەنگ چوو
هەر ڕەنگێ هاتو گەیشتە سەرکورسیەکەی ڕەنگدانی خۆی
دەم بەخەندە ئیستێك ئەکاو،
ئینجا دەست ئەداتە فلچەی سەروملیو
لەناو خۆیمان هەڵئەکێشێو بە ڕەنگی خۆی ڕەنگمان ئەکات.
لە کەیەوە؟! تۆ خۆت ڕەنگەکان بژمێرە..
هەر ڕەنگێ هات، هەر ڕەنگێ بێ
لە ڕێوبانی ئاسمانەوە.. لەسەر پشتی ((با))دابەزێو
یاخود لە ڕەحمی ئەرزەوە بێتەدەرێ:
ئەبێ بە تاقانە ڕەنگی ڕۆژژمێرو.. بە تاقانەی ڕەنگەکانی
ئاووهەواو، بە تاقانەی دەنگو بۆنو، بە تاقانەی یاساوڵو
لەسەر سەری پرسەکانمان ڕائەوەستێو گیرفانەکانی تەماشاو

**لۆچەکانی ناو هەناسەی ڕەنگی جیاواز ئەپشکنیٚو لە خوێنماندا**
**بازگەیەك بۆ خۆی دائەنیٚ.. هەر ڕەنگیٚ هات، وەیشومەیەك،**
**لەناو ڕەنگی خۆیدا دێنیٚو ڕەنگی ناکۆك یەك لەدوای یەك**
**((با))ی ئاگرو ((با))ی ئاسنو**
**بای شمشێرو گەردەلوولی سڕینەوەو**
**کۆچ ئەیانبات..**
**هەر ڕەنگیٚ هات**
**ئەبیٚ بە ئاوێنە بۆ خوا،**
**کیٚ ئەتوانیٚ سەیری ئاوێنەی خوا بکاو**
**پرسیار بکات؟!**
**کیٚ ئەتوانیٚ خۆی بات لە بواری ترسی ڕەنگو**
**مەرگیش نەیبات؟!**
**لە بەردەمی وەڵامێکی ئەزەلیدا**
**کیٚ ئەتوانیٚ فزرە بکات؟! لە بەردەمی زل هێزە**
**ڕەنگی دنیادا ڕەنگی بچووك، بچیٚ بۆ کویٚو ئەبیٚ چیبکات؟**
**من لەبیرمە**
**سوور ئەیویست باران سوور بکات**
**زەرد ئەیویست ئاسمان زەردکاتو**
**سەوزیش ئەیویست خوێن سەوز بیٚو**
**شینیش بە شین پەلکەگیاکان هەمووی ڕەنگکات**
**ڕەنگ ئەخەسێنن نەبادا ڕەنگی جیاواز**
**لەدایك بیٚو نەلەم بچیٚو نەلەو بچیٚ.**

ڕەنگ قفڵەکەن..
نەبادا ڕەنگێکی جیاواز
لەپڕێکدا بێتە ژووریٚ!.
ڕەنگ ئەفرێنن.. نەبادا سڕی ڕەنگێکی
تازەی لابیٚو بیدرکێنیٚ.

ڕەنگ کەڕ ئەکەن.. نەبادا گوێی
لە زەنگی ڕەنگێکی تربیٚو رابپەڕیٚ!
ڕەنگ لالٚ ئەکەن.. بۆ ئەوەی ڕەنگ هەرهیچ نەڵیٚ
بەردەوامیش هەر لەشەودا ڕەنگ ئەکوژن
بۆ ئەوەی کەس ڕەنگی بکوژ و تاوانبار قەت نەبینیٚ!

**((ڕشتەیەك لەشیعری ڕەنگین، لە پەندو قسەی نەستەقو**
**نەخشی سەربەردو کاکڵەی ئەزموون و**
**هەموو ئەو ڕەنگدانەوەو هەڵچوون و داچوون و**
**شێوازانەی کە دوور یان نزیك پەیوەندییان بە گەورەو بچووکی ڕەنگ و**
**بیٚهودەیی هەندیٚ ڕەنگ و لەخۆبایی بوون و ترسنۆکی**
**هەندیٚ ڕەنگ و ڕواڵەتی درۆزنەی هەندیٚ ڕەنگ و**
**ڕەنگی زیندانی کراوو ڕەنگی ژنی شاربەدەر کراوو**
**زوڵمی ڕەنگ و هەروەها خۆشەویستی و**
**قوربانیی هەندیٚ ڕەنگی ترەوە هەیە.**
**با ئەوەیش بڵێم من لەم شیعرەدا بەتەنها داوای لێبوردن و**
**بەخشین هەر لە نابینایان ئەکەم،**

**کەڕەنگەکانم نابینن وەك ئەوەی ئێمەی چاوساغ ئەیانبینین،**
**بەلاّم خۆ ئەگەر دلّیش بنێن بە دێرەکانەوە**
**هەموو دێڕێك بۆ خۆی چرکەیەك ئەکات و**
**پێیان ئەڵێن چ ڕەنگێکن!))**

یەکەم:

لەم دیوارە درێژەدا
ڕەنگی گەورە ئەو ڕەنگەیە
ئەهێڵێ چەند ڕەنگی بچووك
لەناو ئەودا گوڵ دەرکەن و گەورەبن و
لەخۆی نەچن و
وەکوو ئەویش قسە نەکەن

دووەم:

ئەو ((مانگ))ە چەند گێژو وێژە
هەموو شەوێ ڕەنگێ دوو ڕەنگی ئەدزن و
هەموو شەوێ لە پۆپەشمینی زیوینی دائەدڕن و
هەموو شەوێ تاڵێ لە برژانگی چاوی ئەکەنەوەو
هەر بێهۆشە!
ئەترسم شەوێ بیبینین
لە بێ ڕەنگیدا بمرێت و
بە هەورێکی رەش دایپۆشن!.

سێیەم:

**لەو وەرزەدا چیا لەخۆی بایی بووبوو**

**بە فیزێکی دەستکردەوە..**

**کلاوی قوچی زێڕینی هێنابووە سەرناوچەوانیو**

**بەو دنیایەو بە ڕەنگی تر پیئەکەنی.**

**ڕەنگی زێڕین بایی بوو بوو**

**لەو وەرزەدا ((با)) نەخۆش بوو**

**لە پێخەفێکی زەردباودا درێژ بوو بوو.**

**چیا ڕقی ((با))ی هەڵئەسان**

**لە دەربەندا ڕەنگی لاوازی ڕاو ئەناو**

**لەسەر کلاوی قووچەوە هەڕەشەی سووری ئەناردو**

**دوراودوور ئەوی ئەترسان!**

**رۆژێ ((با)) هاتەوە سەرخۆی**

**هەموو هێزی ڕەنگەکانی لە گڤەیدا کۆکردەوەو**

**زللەیەکی دا لە شاخو**

**کلاوەکەی فڕێدایە دۆڵێکەوەو**

**بایی بوونی کاڵ کردەوەو لووتی شکان!**

**چوارەم:**

**نەڵێن ئەو ڕەنگە بچووکە!**

**من بۆ خۆم خولیایەکم بوو.. وەنەوشەیی**

**لە پێشدا بەقەد خاڵێك بوو.. گچکە گچکە**

**ئەچوو بە کونی دەرزیدا**

هەر ئەو خاڵە
هەر ئەو ڕەنگە، مەراقم هێندەی هەڵکۆڵی
هێند گەورە بوو
لە دواییدا بوو بە دەربەندی پەپوولە!.
پێنجەم:
من وا ڕاهاتووم بەیانیان
گەر هەتاو بوو، ڕەنگێکی نوێی چاو شەفەقیی
بکەم بە پەنجەی ئەو ڕۆژەو
هەندێ بزەی بۆ منداڵان پێ بنووسم.
من وا ڕاهاتووم نیوەڕوان
گەر هەور بوو گەواڵەیەکی ڕەش ئەسمەر
بێنمە خوارێو
بیدەم بە شانماو بیبەم بۆ
دووره عەشقێکی زۆر تینوو!.
من وا ڕاهاتووم ئێواران
ئەگەر تەمێکی برۆنزیی کەوتە دامێن
پارچەیەکی لێ دادڕمو
لەگەڵ خۆمدا بیبەم گوڵێکی بێ داڵدەی
ڕاونراوی پێ داپۆشم!.
من وا ڕاهاتووم شەوانیش
ئەگەر شەوی بەفرانباربوو
ئەو شەوانە، شەوی سپیی، نەدەم بە کەس

**بچمە بەر پەنجەرەی ژووری**

**تەنیاییم‌و**

**بە تەنها هەر، لە سپێتیی وردبمەوەو**

**بەفر شیعرم بۆ بنووسێ‌و**

**خۆم نەنووسم!**

**شەشەم:**

**لەناو شەوێکی چڕدایەو**

**لە مێژوویەکی ڕەشدایەو**

**بۆ بەرەو پیری ئەوینێ**

**لەماڵەوە دێتە دەرێ**

**لایتێکی هەڵکراوی بەدەستەوەو**

**ڕویکردۆتە ئەوپەڕی ((دێ)).**

**لە پڕێکدا شریخەیەك ڕەنگ پشکۆیی**

**لە بێدەنگیی شەو هەڵئەسێ‌و**

**ئەم ئەکەوێ‌و**

**بەڵام لایت هەر ئەسووتێ‌و**

**ڕێگای باریکی ڕووناکیی ڕائەکێشێ**

**بۆ ئەوینی ئەوپەڕی ((دێ))!.**

**حەوتەم:**

**من هەمووجار کە ڕەنگی خەونم ئەزڕێ‌و**

ئاوی شیعرم کەم ئەکاتو
پەڕەی سپیم تینوی ئەبێ
ئەچمەوە لای ڕەنگی خەونی جوانی کچێ
دیسانەوە لە ڕەنگدانی بەژنی خۆیم هەڵئەکێشێو
ئەمکاتەوە بە شاعیرێ
پڕ ئەبمەوە لە بارانو ئیتر تەماشام سەوزو سوور
ئەچێتەوە، پەڕەی سپیم گوڵی سەرتڵ* وا ئەگرێ
نە شنەباو نە هەتاوو نە سێبەرو نە بولبولو
نە شاعیرو کەس نەیدیبێ!.

هەشتەم:
خوێنی مێینەیەك نووسیی
بە گەورەیی ئاوای نووسیی:
ڕۆژەکانم هەر یەك ڕەنگەو
شەقامەکان هەر یەك ڕەنگەو
سمێڵەکان هەریەك ڕەنگەو
قانونەکان هەر یەك ڕەنگەو
ئەوەی لەوڵاتی مندا ڕەنگاو ڕەنگە
ئامێرەکانی کوشتنمەو ڕەنگی مەرگمە!.

نۆیەم:
من ئەمجارە یان ڕەنگی شیعر ئەگۆڕم

---
* سەرتڵ: گوڵی سەرلق، هەڵبژاردەی هەرەجوان.

به ڕەنگێ زمان نەیدیبێ‌و
وشە هەرگیز تیا نەفڕیبێ‌و
کاغەز خەوی پێوە نەبینیبێ
یان نانووسم‌و، ئەو ڕەنگە کۆن‌و زەقانە
هەر بۆ شاعیری خومخانە بەجێدێڵم!.
دەیەم:
وەرزی دەسەڵاتی سوور بوو
دنیا بوو بوو بە سوورستان.
شینێك ویستی بە شەقامی سووردا بڕواو
پەیڤێکی شین هەڵفڕێنێ
هەر بۆ شەوێ لە پێچێکدا شینیان گرت‌و
لەناو ئاگرێکی سووردا ئەویان سووتان!
یانزەهەم:
سنەوبەر بۆیە هەر کەسکە
چونکە ئەو لەناو ڕۆحی عەشقێکدا ئەژی
هەر ئاوی سەوزی ئەداتێ‌و
ئاوی سەوزیش
دژی مەرگە!.
دوانزەهەم:
هەرچەند ڕەنگێ
لای پەڕوباڵی کۆترە
هەر چەند ڕەنگێ.

بەڵام ئیتر هەرچی ڕەنگە
لای تێلەکانی تاوسە
هەرچی ڕەنگە.
تاوس ڕەنگ ئەکات بە چەتری ڕەنگاڵەیی
گیف بوونەوەو خۆهەڵکێشان
بایی بوون ڕەنگاو ڕەنگ ئەکاو
لەناو فیزێکی نەخشیندا چینە ئەکات.
تێلی تاوس هەر ژوورێکی دەوڵەمەندو
ناو گوڵدانێ جێگەیەتی!
بەڵام کۆتر هەر بە ڕەنگێك یان دوو ڕەنگی
سادە سادەی خۆشەویستی
باوەش ئەکا بە ڕۆحمانداو
بە دوارۆژێکی سپیداو
گشت ئاسمانیش گوڵدانێتی!

سیانزەهەم:
قامیش بۆ خۆی ڕەنگی باڵای هەریەك ڕەنگە، زەردێکی کاڵ.
کەچی وەختێ عەشق ئەژەنێ
لە کونەکانی برینو لە زاریەوەو لە چاویەوە
بە سەدان بەژنی ڕەنگاو ڕەنگ
ئەبن بە کۆلکە ڕەنگینەو
دێنە دەرێ!

**چواردەهەم:**

**ڕەنگی ئاوێك**
**كە بە بەردەمتا رەت ئەبیٚو**
**سەربەرەو خوار ئەبێتەوە..**
**تیٚئەپەڕیٚو ئەیشزانی ناگەڕێتەوە**
**ئەو ڕەنگە تەواو لە ڕەنگی**
**خۆشەویستێكی خۆت ئەچیٚ**
**كە بۆ دواجار  بەجێت دێلیٚو**
**تا هەتایشە چاوت پێی ناكەوێتەوە!**

**پانزەهەم:**

**وەك هەرشتیٚ..**
**ڕەنگی شاعیریش تێكەڵی گڵو كۆتا ئەبێتەوە**
**ئەشیٚ كە تەنها جیاوازیی ڕەنگی ئەوو**
**ڕەنگێكی دیكەی نەناسراو**
**بۆ چاوی ڕێبوار**
**ئەوەبیٚ**
**ئەویان سەرگۆڕی بیٚ ڕەنگو**
**بەڵام ئەمیان چەند شیعرێكی لەسەر بڕویٚ!.**

**شانزەهەم:**

**ڕەنگێك هەیە.. هێزی ئەفسانەی خواوەندی لە ناودایە.**
**سیحرەكانی عەسای موسای لەناو دەستاو**

دەنگی سپیی پڕ پەپوولەی
مەسیحیشی لە دەنگدایە.
سیاساڵ بێ ئەو بارانی لە چاودایە.
لە وەریندا گوڵی پێیەو
لەناو وەرزی نابینایشدا
ئەو هەناوی چرای تیایە.
بێ ئەو دوارۆژ تاقەتی ڕۆیشتنی نییە
بێ ئەو هیوا داناگیرسێ
بێ ئەو شیعریش ڕەنگی نییە
ئەو ڕەنگەیش.. ڕەنگی نەمری
هەمیشەی خۆشەویستییە!.

حەڤدەهەم:
لە مۆزەخانەی ڕەنگێکی  پاشەڕۆژدا
چەندین ڕەنگی تێکەڵاوی ئەمڕۆی ئێمە
لە شووشەبەندی مێژوودا..
بۆ چاوەکانی ئاینده
یەکەیەکە ڕیز ئەکرێن و یەکەیەکە نیشان ئەدرێن:
بەڵام لەنێو ڕەنگەکاندا
ئاپوورەی چاوی ئاینده
لە ڕەنگێکیان زۆر ئەئاڵێ و
بە ڕەنگێکیان سەرسام ئەبن و

گاڵتەیش بە ڕەنگێکیان ئەکەن:
ئەویش ڕەنگی گرژو مۆنی
تفەنگێکی درێژ ئەبێ.. کە سەردەمێ و هەموو ڕۆژێ
منداڵەکانی سبەینێو
گۆرانیەکانی سبەینێو
ئەستێرەی خۆمان پێ ئەکوشت
لێرەو لەوێ!.

هەژدەهەم:
تۆ بە تەنها ڕەنگی قژێکی خورماییو
تۆ بە تەنها ڕەنگی دووچاوی قاوەییو
تۆ بەتەنها ڕەنگی برۆنزیی لەشێکی داگیرساونیت
گەر سەرت کتێب نەبوایەو
فوارەکانی ڕووناکیی تیا هەڵنەقوڵایە
ڕەنگی قژت لە خەیاڵما زوو ئەچۆوە.
گەر ڕوانینت ڕەنگی بەرزەفڕ نەبوایەو
نەهێنی باو دڵی بارانو برووسکەی نەبینیایە
ڕەنگی چاوت لەبینینما زوو ئەچۆوە
گەر ڕۆحیشت ئاوێزانی سیحری مۆسیقا نەبوایە
هەموو ڕۆژێ گوێی لە هاژە شینەکانو
هەموو شەوێ گوێی لە سروە سپیەکانو
هەموو جارێ گوێی لە نۆتە باڵدارەکان نەگرتایە

ڕەنگی لەشت زۆر دەمێك بوو لەناو دەست و لەناو هەستما بیرچووبۆوە.
تۆ ئەو ژنەی خۆشەویستیت وام پێ ئەڵێت:
قەڵەمێکی ڕەنگ ناسکەو شەماڵێکی نەرم و نۆڵە،
بەلاَم باهۆزیش ئەنووسێت.
قومریەکە لە ئاوریشم و کەچی ڕووەو ئاگرەکانی پرسیار ئەفڕێت.
مانگەشەوی برینداری مێینەکانی ولاَتی لەباوەشیا هەڵگرتووەو
کەچی ئەڕواو بەسەر شمشێردا باز ئەداو،
لەبەردەکانی تاریکیی هەڵ ئەنوتێت
مامزێکە تاق و تەنیاو کەچی بەرەو پێدەشتەکەی
ڕاوشکاری والی و خەلیفەو مل ئەنێت.
خۆشەویستیت وام پێ ئەڵێت:
ئەو لەڕەنگی یاخیبوونەو
لەڕەنگی بێدەنگ نەبوونەو
بەلاَم لەناو ڕەنگەکانی بەردی ڕەجم و لەڕەنگەکانی جەڵدەدا
بۆ ڕەنگەکانی ئازادیی و
بۆ ڕەنگەکانی ئایندەو ژن ئەگەڕێت!

نۆزدەهەم:
ڕەنگێکی ئاڵ
سەعاتێکی ڕەنگ زیوینی خۆشەویستیی لە ماڵدا بوو
بە دیواری ژووری عەشقا هەڵواسرابوو..
ڕەنگێکی بۆر.. ڕەنگێکی دێز

ماڵی بەسەر ئاڵدا روخان
ئاڵبوو بەژێر دیوارەوە..
ئاڵ گیانیداو ئاڵ بۆ خۆی مرد
بەڵام لەژێر خۆڵو داروپەردووی ماڵدا
هێشتا هەر سەعاتی زیوین
هێشتا هەر سەعاتی ئەوین..
ئەڕۆیشتو ئیشی ئەکردوو لێی ئەدا!

بیستەم:
لەبەردەم خۆڵەمێشیدا قەت هەناسە
بۆ ڕابوردوو هەڵنەکێشی.
نەبادا گەردو غوباری وەختێ کە چوونە چاوتەوە
ئایندەیش وەك ئەو ببینی!

بیستو یەکەم:
سەرت بکە بە ڕۆشنایی ناو سپیدا
چاوت لە بنیا بکەوە
من دڵنیام ئەو وەختەی سەرت دەرهێنا
لەکام ئاسۆدا زۆر رەشە
خاڵێکی سپیی ئەبینی!.

بیستو دووەم:
لەسەر چرپایەك دوو کەسیی

خۆمو ڕەنگێکی بێدەنگی ترسنۆکم ڕاکشا بووین
کە ڕیشی باوکم بەپەلە هاتە ژووریٚ..
بۆ ماڵینی هەرچی ڕەنگە کەلەو نەچیٚ
ڕەنگی ژوورم لە جێگەمدا مردار بۆوەو
خۆیشم لەناو ڕەنگێکی تۆخی مت بووندا
بەدرۆ خۆمکرد بە خەوتوو
لەو دەمەوە
هەر ڕابوردوو بەخەبەرەو
منیش نوستوو!

بیستو سێیەم:
زێیەك وتی بە ڕەنگ نییە
ئەو وەختەی تۆ بە شینیی من سەرسامیتو
لە سەرەوە ڕوون ئەمبینی.
هەر ئەو وەختە لە بنەوە ڕەنگە هەناوم تاریك بیٚو
لە ناخەوە لیتاو بمخواو تۆ نامبینی.
بەرگی کتێبێکیش وتی: بە ڕەنگ نییە
تۆ کە ڕەنگی من ئەبینی: سوور مەچنەو
ورشەو  پرشەم دەم بەخەندەو
دەمو چاوم نوورانییەو
بەڵام لە قوڵایی مندا شیرو شمشێر ئەجوڵێتو
دۆزەخی ئەنفال نووسیومی!
پەرژینی باخێکیش وتی: بە ڕەنگ نییە

من ناوم باخی سپییه
بەڵام ئەوەی لەناو مندا ئەبێو ئەڕوێ
گوڵی بەدو گوڵی دڕو ژەهراوییەو
قوربانیی گەورەیش بەتەنها
هەر سپییە!

بیستو چوارەم:
لەناو ڕەنگدانی ئێمەدا
ڕەنگەکان حەپس کراون
ماناکانی ڕەنگ : یەك چاون!
تەنها هەر درەختی گەنجو شیعری گەنجو مۆسیقای گەنج
وەختێ ئەچن بۆ هەڵپەڕکێ
بەرگی زەرقییو سەوزو سورو زەرد ئەپۆشن.
ئیتر هەرچی پیرەدارو پیرەشاخو پیرە ڕەزە
تەڵخ ئەپۆشن.
کەچی من لەناو پاریسداو لەسەر شەقامی شانزلێزی:
لە بەری پیرەدارێکدا جلی سوورو
لە سەری پیرەڕۆژێکدا شەپقەی سەوزو
لە دەستی پیرەشەوێکدا
دەستکێشێکی زەردم بینی!

بیستو پێنجەم:
لەمڕۆی جیهانی بێ مەرزی ڕەنگەکاندا

**چەند نزیکین لە یەکەوە:**

**قوتبی ژورروو لەسەر مێزی بەرامبەرم دانیشتوەو**

**هالاوی دەمیم پیا ئەکاو عەینەکەکەم تەم ئەیگریٚ**

**چەند نزیکین لە یەکەوە..**

**چۆلەکەیەك لە کەندا ئەجریوێنیٚو درەختێکی من گوێی لێیە!**

**بە دیواری شوورەی چیندا مێرولەیەك هەڵئەگەڕیٚو**

**من لێرەوە چاوم لێیە!.**

**((دانووب)) ڕۆژنامە دەرئەکاو هەمان چرکە**

**((دیجلە))ی من ئەیخوێنێتەوە!.**

**چەند نزیکین لە یەکەوە..**

**نیوەشەویٚ ((جان جین)) یەك لە سەرماداو**

**لەسەر شەقامێکی پاریس هەڵبلەرزیٚ**

**من لێرەوە قاپوتەکەم دائەچڵەکیٚ!؟**

**لەو دوورەوە پڵنگێکی ڕەنگ تامیلیی**

**لە بێشەدا ئەزریکێنیٚو**

**من لێرەوە ئەسپەڕەشم لە دەربەندا ئەحیلێنیٚ..**

**چەند نزیکین لە یەکەوە**

**لە کەنار نیل خەنجەر لە پشتی ڕۆمانی**

**((مندالانی گەڕەك)) ئەدریٚو**

**من لێرەوە حەمە بچکۆلی بۆیاخچیم ڕائەپەڕیٚ.**

**چەند نزیکین لە یەکەوە**

**لەهەر شوێنیٚ لە ڕەنگی برسی دنیادا لەهەر شوێنیٚ**

وەختێ زارۆڵەیەك بگری
من لێرەوە خونچەیەکم دەم ئەگێڕێو ڕوومەتەکانی تەڕ ئەبن
لەهەر شوێنێ لەڕەنگی زوڵمی دنیادا لەهەرشوێنێ
ئەو وەختەی کەسکێك بکوژرێ
من لێرەوە باخی سپیم هەناسەیەك هەڵئەکێشێو
سەرتاپای بەژنی سوور ئەبێ
چەند نزیکین لەیەکەوە!.
**((سەرنجێك: من ڕەنگ کۆئەکەمەوەو ئەیانخەمە**
**ناو ئەلبوومی ڕوانینەوە. جارێك دوای شیعر خوێندنەوە**
**تکام لە گوێگران کرد بەرلەوەی بچنە دەرەوە،**
**هەریەکەو ڕەنگێ لە دوای خۆی بەجێبێڵێ،**
**ویستم ڕیفراندۆمێ بکەم و بزانم ڕێژەی**
**کامە ڕەنگ لەهەموو ڕەنگەکان زیاترە:**
**وەختێ ڕەنگم کۆکردەوەو ڕەنگم ژمارد**
**دەرکەوت کەلەم وڵاتەدا.. ڕەنگی ((رەشباوی بێزاریی))**
**لەهەموو ڕەنگێ زۆرتر بوو!))**
مەمکە بەڕەنگێ بۆت بگریم
گریان لەناو ڕەنگی مندا هەرتەواو وشکی کردووە
لەو وەختەوە کە ڕەنگی ئەنفالم بینی.
مەمکە بە ڕەنگێ بسرەوم
من سرەوتن لەوکاتەوە بەجێیهێشتووم
کە ڕەنگی کۆچ ڕەوم بینی.

مەمکە بە ڕەنگی بێدەنگیی
من بێدەنگیی لەو کاتەوە بەجێیهێشتووم
کە ڕەنگی خوێناوی ((کالێ))و
کە ((کەژاڵ))م بێ لووت بینی!

**((دواجاریش، لەدیوانی کازیوە)ەوە،**
**شیعرێکی تەمەن بیست و پێنج ساڵم**
**بەسەردیوارەکانی دیواندا هەڵگەڕاو بازیداو**
**بە ڕاکردن گەیشتەلام و پێی وتم:**
**دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵانەیش**
**من هێشتا هەر تازەم و بۆئەو ڕەنگدانەی ئیستەیشت ئەبم.**
**تکایە جارێکی تریش پێشکەشی گوێگران و خوێنەرانم بکەرەوە،**
**دەستێکم بەقژە کورتەکەیدا هێناو پێم وت:**
**فەرموو وەرە ناو ڕەنگدانیشەوە:**
گوڵاڵەیەك
بۆ توتڕکێ نوشتایەوە
دەستی ماچکرد
کە لێبۆوەو هەستایەوە
ڕەنگی سووری
ڕژابووە بەر پێی توتڕك و
هەتا مردن
بەداخی ڕەنگی زەردەوە تلایەوە.

وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە..
ڕەنگم هێشتا هەر گڤەی دێو ئێوەش دارستانی ئەون.
ڕەنگم هێشتا هەر هاژەی دێو هەر شەپۆلان ئەداتەوەو
ئێوەش هەموو چراکانی کەنار ئەون.
ڕەنگم هێشتا هەر شەقامی سەوزو سووری دڵدارانەو
ئێوەش جووت جووت عاشقانی دەس لەملی شۆسەی ئەون
ڕەنگم هێشتا بەسەرتاندا بەرزو نزم ئەفڕێو ئەفڕێ
ڕەنگم هێشتا.. هەر دائەکاو هەر دائەکا..
ئێوەش هەموو خەمی تەڕی بەر ڕێژنەی ڕەنگی ئەون.
ڕەنگم هێشتا لە ئێوارەی ئەم شیعرەداو لەم هۆڵەدا..
ئینجانەیەو، لاولاوێکە، پرچی درێژی عەشقێکەو،
لەناوتاندا، ئاگر لەڕەنگی بەربووەو سەمائەکا.
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە..
گوێ لە چیرۆکی ڕەنگ بگرن:

**((گەڕانەوەیەك بۆ ناو ئامێزی پەلکەڕەنگینەکانی** ((ئەلیزابیث))**و**
**خۆنوقمکردنەوەیەکی تر لەشاری ئاوو خۆشەویستی ڤینیسیادا))**
نەهێنی شین ئەگێڕمەوە..
ڕەنگی کچێکی بیانی ڕوونتر لەخەوی دەریاچەی
بەر ڕووناکیی شەوێکی کپ.
ئارامتریش لەهاتو چۆی لەش‌و لاری
نەرم‌و شلی نێو باوەشی دانسێکی ((ڤاڵس)).

ڕەنگی کچێکی بیانی،
ئاڵێکی تەڕو ورشەدار.
وەك بریسکەی دەنکەهەنار.
ڕەنگی ئاوازی مێیینەی خۆرئاوایی،
کە ئازادیی ئاسمانێتیو هزریش باڵی،
ڕەنگی کچێکی بیانی،
لە سەفەرێکی شین باودا بەر لە دە ساڵ،
نامۆیی منی شین کردوو
سەرتاپامی کرد بە فوارەی خۆرو سامالْ.
لەو سەفەرە شین باوەوە،
ڕەنگی کچێکی بیانی،
هاتۆتە ناو ڕەنگی ژووری شەرمنۆکی
خۆرهەڵاتی نێو چاومەوە،
خەیاڵێکە پیرۆزەیی و بەرتەماشام بەرناداتو
هەموو جارێ ئەمباتەوە:
کافێتریاکەی ژێر زەمینی ((ڤینتسیا))و
ناو فنجانێ لە قاوەی تاڵ!.
نەهێنیی شین ئەگێڕمەوە..
ئێوارەیەك شیعرم باری و گوڵە مێلاقەی ئیتاڵی چووە بەریو
بریقو باق مێلاقەبوو بە شانۆی شینی دڵداریو پێ ئەکەنی.
خۆی شیعربوو((با))ی مۆسیقایش ڕایئەژەنی. ئەمجارەیان خۆی
باران بوو دایئەکردوو هەر خۆیشی ئەبوو بەپەنجەی سەر کەمانی

بەژنی شینیو خۆی ئەژەنی.
خۆشەویستی تەڕتەڕ بووبوو
ماچو ڕەنگو شیعری لێ ئەچۆڕایەوە.
بۆنی بزەی مۆنالیزا گەڕابۆوەو
منیش بووبم بە ((دافنشی)) لەیەك وەختا ئەسووتامو
هەر هەمان سات ئەڕوامەوە.
ئاگر بووم و بەهەشت بوومو
خۆڵەمێش و گوڵی ((دانتی)).
کۆترە شینکە لەسەر غەریبیم نیشتەوە..
بە دەنووك کەوتە لێدانی شووشەی ڕەنگم
بە پەڕوباڵ تەمو خەمی سەر دوودەریی هەستو نەستی
سڕیمەوە. وەك سپێنەی کازیوەیەك روون بوومەوە
عومری سیسم، لاسکی شۆڕی، لەگەڵ وشەمدا قنج بۆوە
تا ئەو دەمە من عەشقێکی باڵدار نەبووم
من هەر ژانێکی  خشۆك بووم
هەر لەسەر سك ئەڕۆیشتمو هەر لەسەر سك
شەوی ڕەنگو کەنارەکانی بێزاریو تخووبەکانی ئازارم
یەك یەك ئەبڕی!
لەو ڕۆژەوە من بووم بە ڕەنگی باڵدارو بە پەروانە
کە نەهێنیی شینم ناسیی!.
نەهێنیی شین ئەگێڕمەوە.
ئەلیزابیث پەری ئاوی ڤینتسیاو سایەقەی لەشێك شەوانە

وا هەنووکە جریوەی سنگ ڕۆئەکاتە سەر چرپامو ژوورم پڕ ئەکا
لە نۆتەو سەرم ئەکا بە گیتارو پەنجەکانم بە باڵندەو هۆنراوەیشم بە خەرمانە
نەهێنیی شین ئەگێڕمەوە
کاتێ شین ئەبێ بە پەخشان.. لە دەشتێکداو ئەینووسمەوە
وەختێ شین ئەبێ بە ڕۆمان لە زەریاداو ئەیخوێنمەوە.
نەهێنیی شین ئەگێڕمەوە:
خۆشەویستیی، کاڕەنگی* بوو، وردە وردە لەناو زەریاوە
ئەهاتو بە کازەکازەی* ئێوارە
هەردووکمانی ئەدا بەدەم دواڕۆژێکی نادیارەوە.
ڕەزاوەکان*، ئەیانناسین، لە کەفچڕێنی خۆیاندا
بەلەمەکەیان ئەکردین بە جۆلانەو یان بەباوەش لە ڕەڤانی*
شەپۆلاندا لەسەر شان هەڵیان ئەگرتین.
خۆشەویستیی، کنووشکی* بوو، لە تیشکی خارخاری* ئاسمان
خەناوکی* ئەهۆنیەوە بۆ گەردنی پەری ئاوو منیشی ئەکرد
بە تابلۆی ئەو ڕەنگانەی لە غەریبیدا مردنو نەگەڕانەوە نیشتمان.
عەشقی ئاویی، ئەلیزابێـث، هێندە ڕوون بوو
چون ماسی شین ئەبریسکامەوە لە بنیاو

---

* کاڕەنگی : زەردێکی کاڵ.
* کازەکازە: هەوای گۆرانییو ئاواز.
* ڕەزاو: سەرەتای بەیەك گەیشتنی دووچەم.
* ڕەڤان: هەڵاتن.
* کنووشکی: پەمەیی.
* خارخار: لەت لەتو شەقار شەقار.
* خەناوك : ملوانکە.

من پوولەکەی وشەکانم لەناو لەرەی لەشی ئەودا
ئەبوون بە گوێو بۆ سەرنجدانی بێ سنوور لە جوانیدا
ئەبوون بە چاو.
سەفەرێ بوو، ڕەنگی تازەی تێدا ئەزاو، سەفەرێ بوو
پڕ بوو لە ڕەنگی گۆرانیی و بارێزەی شینی دڵداریو مورووی
هەتاو. سەفەرێ بوو، لە سەفەری شیعری شینم،
لە سەفەری هەنگەکانم. لە سەفەری ئەو پەنجانەی کە بوون
بە ماسی باڵدارو گەرای پرشنگیان تیاخستم بۆ قەسیدەی
ڕوناکترو نەرمترو جوانتر لە ئاو.
نەهێنیی شین ئەگێڕمەوە..
من ئەو  وەختە بووم بە شاعیری دەریاچەو
خولیایەکی ڕەنگاوڕەنگی ناو نامۆییو
ژانە مۆمێکی داگیرساو..
کە جوانیەکەی ئەلیزابێـث
سیحری ئەفسانەی لێکردم
لە ساپیتەی* عەشقێکەوە
فڕێی دامە ناو نێرینەی ئاوێکەوەو
لەو ڕۆژەوە هاژەم کردوو
بووم بە شەتاو..
وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە
بەڵام هەر ڕەنگی ئاوێنەی درزبردوو کە دەمو چاوی خەمێکم

---

* ساپیتە: بەرزترین نوختەی لوتکەو بەرزایی.

ئەکا بە دووان بە سیان بە چوار.. ڕەنگی زاڵە!
ڕەنگی تێکشکاوی ماڵم..
کە ڕەنگی دز بێباکانە
بەسەر هەموو ڕەنگەکانیا ئەڕوا..
ڕەنگی شەقامێکی چۆڵو ئێوارەیەکی بێ هەناو
کە بەتەنها پشیلەیەك پیا ڕەت ئەبێ!.
ڕەنگی گردو عەبای ڕەشو،.
ڕەنگی دڵنیایی قرچۆك.. کە بە پرسیارێك ئەپچڕێ..
ڕەنگی زاڵی ناو تابلۆمن.
وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە
با لە ئێستەدا نەمبینی، هەر کە ڕەنگێکی تۆزاویت،
لەو دیو پەنجەرەوە بینی، لە پەلو پۆی درەختێکی لارە ملدا،
کزەو ماندوو، رەوتین* گرتوێتیە باوەشی:
ئەوە ڕەنگی بەجێماوی ئێوارەمە
بووە بە ڕەنگی ئەو وەرزەو بۆ من ئەگری!.
نەیشمبینی، وەختێ ڕەفێ* باڵندەت دی
لە ڕەنگی خۆڵەمێشیدا ڕووەو باشوور کۆچ ئەکەنو
لە دوای دواوە، یەکێکیان هەر
ئاوڕ لە چڕە دووکەڵو خۆشەویستیی وێرانکراو
ئەداتەوە، ئەوە منم بووم بەو ژانە هەڵفڕیوەو

* رەوتین: هەڵوەرین.
* رەف: پۆلە باڵندە لە کاتی فڕیندا

بووم بەو حەسرەتە کۆچەرەو
لە شێوەی مەلدا ئەمبینی!.
نەیشمبینی، تۆ کە ڕەنگی ئەرخەوانیی پژاوی سەر
ئەم دیرۆکەو ڤیژەی مۆری جەستەی ژنو
ڕەنگدانەوەی تەنیایی ئەم قەسیدەیەو
ڕەنگی کەسیرەی منداڵ و ڕەنگی هەڵوەدای بێ پەنای تەماشامو
ڕەنگی نووزە نووزی خونچەو کانیت بینی.. من ئەبینی!

وەرە ناو ڕەنگەکانمەوە..
لەم سەفەرە لیخنەدا
ئای کە غەمگینە ڕەنگی من
ئاوەو ئەڕواو
بەڵام کەنار بە هەردوو چنگ
خۆڵی نامۆیی پیا ئەکات!
لەم سەفەرە نابینایەو لەم سەفەر ڕەشباوەدا
ئای کە دڵتەنگە ڕەنگی من
پەنجەرەیەو لە ماڵی خۆی هەڵاتووەو
کەچی جادەی یەکەم شاریش
بە سایدی هەردوو دەستی
چاوی ئەگرێو، پێوەی ئەدات!
لەم سەفەری گڕەیەدا..
ئای کە تینووە ڕەنگی من

**باڵندەی ناوەختی کۆچەو.. پشکۆیەکە بە حەواوەو**
**بەڵام زنەی ئاوێك نییە**
**پێش نیشتنەوە دەری نەکات!**
**لەم سەفەرە درێژەدا، ئای کە تەنیایە ڕەنگی من**
**لە وێستگەکانی دنیادا، هەر خۆی پێشوازی لە خۆیو**
**هەر دەستی خۆی ماڵئاوایی لە دەستەکانی خۆی ئەکات!**
**وای کە شپرزەو غەمگینە.. ئەم ڕەنگەی من..**
**وایش هەست ئەکەم.. ژانم بووە بە مێینەو**
**لەناو مندا، دایکێکە زاووزێ ئەکات!.**
**ئای کە غەمگینەو غەمگینە ڕەنگی ناخم**
**من ئێستاکە، لەوە ئەچێ بووبم بە ڕەنگی جاجمی**
**سەر دارەمەیتی ژنێکی کوژراوەو**
**ڕێزەی بارانێکی مۆریش**
**ورد ورد بەسەرما دابکات!**

**وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە..**
**من ئێستاکە  لە هەڕەتی ڕەنگی پرسیارو ڕاماندام.**
**من لە تافی دڵەڕاوکێو ناو ڕەنگەکانی گوماندام.**
**وەرنە  ناو ڕەنگەکانمەوە..**
**وەرنە ناو ئێوارەمەوە، لە نسرمی ڕەنگی ئاڵدا**
**ببنە میوانی ناو شینو خۆڵەمێشیم لە گۆشەکانی ناو ژووردا و**
**سەر لە وەنەوشەیی بدەن..**

له پژانی لاوانەوەو له خاوکەری خۆرنشینما..
هەر لەناو ژووری پەپوولەو له پاڵ شیعرو شەماڵدا بوو
ڕۆژێ من ڕەنگێ کوشتمی
به هێواشی به پەڕەی گوڵه بەیبوونێ، به ئەسپایی،
به تیلماسکێ له گزنگی خۆشەویستیی.. سەریبڕیم
ڕۆژێ من ڕەنگێ کوشتمی
له ڕەنگی پەری ئاسمانو له ڕەنگی مریەمی عەزراو..
له ڕەنگی کزەبایەکی ناو مانگەشەو ناسکتربوو،.
ئەو ڕۆژە من..
ڕەشیشەی* نەرمه دڵۆپێ.. سەری کردم به بێژنگو
شنەی پەیڤی دارچوالەیەك.. لەناوقەدا کەرتی کردمو
ئەو ڕۆژە من کلووی بەفر داخیکردم..
هەر لەناو ژووری پەپوولەو، لەپاڵ شیعرو شەماڵدا بوو
ڕۆژێ من ڕەنگێ کوشتمی..
من ئاوێکی دەم بەخەندە چەقۆی لێدام
ئاو شیعری پڕ کردم له خوێن..
ئاو سووتانمی و
ڕێحانەیەك پێوەی دامو
چڵێ زەیتون خۆی له ملمەوە ئالاندوو
خنکاندمی..
شەونم..شەونم.. شەونم.. شەونم تێزابی پیا کردم.

* ڕەشیش: نەرمەباران.

عەتر.. عەتر.. عەتر خۆی بوو.. مەرگی لەناو بۆندا هێناو
عەتر.. عەتر.. عەتر خۆی بوو.. ژەهری لەناو ڕەنگدا هێناو
من مۆمێکی ئێسك سووك‌و
من چرایەکی خاپینۆك* کوێریکردم
تار.. تار.. تاربوو.. ژێی تار خۆی بوو..
ئاوازێکی کرد بە پەت‌و لەناو ڕەنگی سەیوانیدا بۆی هەڵخستم.
ئەو ڕۆژە من
سامالٚ کرێوەی لێکردم.
چرا منی کوژاندەوەو
هەوا هەناسەی گرتم‌و
من ئەو ڕۆژە لەناو ڕەنگی فریشتەیی‌و لەناو ڕەنگی خودایدا
ڕەنگیان کوشتم!
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە
لە سپیدا پێ هەڵگرن
با نەکەونە درەنگانێ‌و ئیتر ڕەشتان بەسەردا بێ.
لە ناو ڕەشما نەکەن ئاگر بکەنەوە، یان جگەرە داگیرسێنن
نەك لە دوور ڕا، چاوی سووری چەك‌و گوللە
کەشفتان کاو بتانبینێ!.
وەرنە ناو ڕەنگەکانمەوە
((من ئێستاکە ڕەنگی وشەم
پروشەیەك ئەکات زەردە

* خاپینۆك: دەستبڕو فێڵباز.

**هاكا كردی بە كرێوەی خۆرنشینو**

**بە ڕەوتینی  گوڵە زەردو**

**سەرلەبەری ڕەنگەكانتانی داپۆشی.**

**من ئێستاكە ڕەنگی وشەم**

**تەپو نمێ ئەكات ئاڵە**

**هاكا كردی بە ڕەهێڵەی ڕەنگی سوورو ڕەنگی شینو**

**بە شەستێكی ناو ئەنفالو**

**لە قەترە قەترەی درشتو لە گۆپاڵەی ڕێژنەیدا..**

**گۆنەو كوڵمی منداڵانو قژی خەناویی ژنانو**

**بازنی دەستی كچانو خەزێمی لووتو سركەیی ناوچەوانو**

**خاڵی كوتراوی چەناگەو.. متو مووروی تێدا باری!.**

**من ئێستاكە ڕەنگی وشەم  وردە وردە. وا خەریكە**

**لە نێو شەوی ئەم دەشتەدا.. ڕەش هەڵگەڕێ.**

**لەسەر پشتی چەماوەی خۆم**

**من هۆبەیەك لەو تاوڵانەم هەڵداوە**

**كە خاڵین و لە ژێریاندا تەنها هەر ((با))،**

**هەر ((با))و هەر ((با)) دێتو ئەچێو**

**دەمێك زریكەی هەر زەردەو**

**دەمێك كڕووزەی هەر شینەو..**

**دەمێكی تر نووزەی مۆری بە ئاستەمێ ئەگاتە گوێ.**

**وەرنە ناو ڕەنگەكانمەوە.. تا ببینن**

**ئەو ڕەنگانە لە شەوانی تلانەوەی ڕەنگاڵەما**

**وەختێ دێنە باوەشمەوە، وەختێ لەگەڵ مندا ئەنوون**

**ئەو شەوانە تا بەیانی**

**من کام خەوو؟.. من کام شیعرو؟ کێ ئەبینم؟!**

**شەوێك ((زەرد)) لە باخەڵما نووست..**

**ئیتر هەتاکوو بەیانی**

**من هەر خەوم بە هیجرەتی ڕەنگی نالییەوە بینی.**

**شەوێك شین لە باخەڵما نووست، شین بردمیو دوور بردمیو**

**ئیتر من تاکوو بەیانی، خەوم بە شەپۆلی ڤۆلگاو**

**شیعری ((پوشکین))ەوە بینی**

**شەوێك مۆر لە باخەڵما نووست**

**تا بەیانی من هەر خەوم بە پەڵەپەڵەی مۆری سەرلەشی**

**ژنەکانی ڕۆژهەڵاتو بەماڵی کوردەوە بینی.**

**شەوێك خاکیی لەگەڵما نووست.. ئیتر خاکیی پێشم کەوتو**

**تا بەیانی من هەر خەوم بە ئەرزی غەمگینی دنیاو**

**بە خاكو خۆڵی کوژراوی هەموو جیهانەوە بینی.**

**شەوێك ((رەش)) لە باخەڵما نووست، ڕەش بردمیو**

**دوور بردمیو، تا بەیانی من هەر خەوم..**

**بە زیندانەکەی ((ماندێلا))و شیعری پێست ڕەشی ((هیوز))و**

**بە مۆسیقای زنجیەکانو وتارەکانی ((مارتن))و**

**پاییزی ڕەشی ((رواندا))و قیژەی ((ئەنجێلا))وە بینی**

**شەوێك سەوز لەگەڵما نووست، سەوز بردمیو**

**دوور بردمی، ئیتر من تاکوو بەیانی هەر لەناو ((مەدرید))ا بوومو**

مانگی کەسکی((گارسیالۆرکا))و
سنەوبەری شانۆکانیو کالیپتۆسی شیعریم بینی.
شەوێك ئاڵ ئاوێزانم بوو.
ئاڵ بردمی، هەر ئێجگار نزیك بردمیو
کۆڵان کۆڵان، گەڕەك گەڕەك.. شەقام شەقام
گەڕاندمیو ئیتر من تاکوو بەیانی..
بۆنی بێبەشیی گەنجێتیی کوڕوکچی شارەکەم کرد.
لە دواییشدا، شەوێك سوورێکی پشکۆیی لەگەڵما نووست
تا بەیانی سانسۆرەکان خەوی منو
دەستی منو شیعرەکانی منیان داخکرد!

**((ڕەنگی مەرگ.. دوا ڕەنگی ئەم ڕەنگدانەو**
**ڕەنگەکانی تەماشای من. هەوڵدانێك بۆ خوێندنەوەی**
**نەهێنییەکانی ئەم ڕەنگەو ئاوێتەکردنی لەگەڵ ڕەنگی**
**ماڵئاوایی ئەم ئێوارەیەو ئەم قەسیدەیەو ڕەنگەکانی خۆشەویستی ئێوەدا))**
لەو دیو تخوبی تەماشاو بینینەوە.. لە نادیاردا
ڕەنگێك چاوەڕێی من ئەکا..
ڕەنگێ تێکەڵ لە ڕەنگی گڵو سەرابو بیرچوونەوەو
نەهێنیی خوا!. ڕەنگێك چاوەڕێی من ئەکا
پڕە لە پرسی بێ وەڵام.. لە تەندوورەی سەرسامبوونو
لە متبوونی بێ کۆتاییو ئەوقبوونی ڕەنگەکانی سیمای
زەریاو، ڕوخساری ((با))

ڕەنگێك چاوەڕێی من ئەكا
ڕەنگەكانم لێ وەرگرێو دوور دوور بمبا.
بردن بۆ كۆتایی شیعر، بۆ ئەو شوێنەی لە جێی زمان
بێدەنگیی قسەی تیا ئەكاو لە جێگەی با پەنهانییەك
تیا هەڵ ئەكا. ئەی ڕەنگی مەرگ!
تۆ لەوێ بەو خۆم دێم بۆلات
تۆ دوا ڕەنگی و لە هەموو ڕەنگێ تۆخترێو
لە هەموو ڕەنگێ ڕاستترێو تەنها ڕەنگی شلوێ نابیو
چەند كۆنیش بیت هەر تازەیتو تەنها ڕەنگی
گومانێ گەرات تیا نەخات!
تاقە ڕەنگی كە هەموومان بە یەكسانی دائەپۆشیو
تاقە ڕەنگی كە چونیەكو بێ جیاوازی
تۆ لە خۆتمان هەڵئەكێشیو بەیەك ڕەنگ
ڕەنگمان ئەكەیتو زەمان زەمان لە ڕێی
كورتو درێژەوە، شینو مۆر بین، زەردو سوور بین،
ئەگەینە لات.
ئەی ڕەنگی مەرگ!
لە وێستەگەیەكی خامۆشدا چاوەڕێم بە
خۆتو پەپوولە ڕەشەكان
خۆت و كزەو ورتەورتی بێهودەیی پایزێكو
خشەخشی گەڵاڕێزان. چاوەڕێم بە
خۆتو چرایەكی كزو هەوایەكی بێ تاقەتو

بیرەوەری درەختێکی تاقو تەنیاو دنیایەکی بێ ناونیشان.
ئەگەمە لات.. من چی دێنم لەگەڵ خۆمدا
جگە لە قژە سەرێكو دوو شیعری جوان!
من چیم پێیە لەگەڵ خۆمدا بۆت بهێنم
جگە لە سووتووی نیشتمان.
لەودیو حەساری تەمەوە چاوەڕێم بە
لەناو مندا ژیان گەیشتۆتە قەترە قەترەی دوایی‌و
لەناو مندا وا ڕەنگی بێ ڕەنگی تەمەن
لە بازنەی بۆشاییدا هەر خول ئەخوات.
لەودیو پاردەی* ڕەنگەکانو دەنگەکانو لەودیو پاردەی
بینینەوە چاوەڕێمبە..
کە بردمت ((با))یەك بێنە هەڵمبگرێ
پڕ بێ لە خەونی بارانو پڕ بێ لە خەونی دارستان.
شەوێك بێنە ڕازاوە بێت بەو جریوەی برینانەی
کە کوژرانو بەڵام دەنگیان لێوە نەهات.
کە بردمت بەناو دەربەندێکدا بمبە
کاپانە* ڕێی بچیتەوە سەر وڵاتی جادووی شیعرو
ناو ئەفسانەی سپیی زستان
ئەی ڕەنگی مەرگ!
ئەی ڕەنگی ماڵئاوایی ڕەنگمو ئەی ڕەنگی دوا ڕەشنووسمو

---

* پاردە: شوورە.
* کاپان: باریکە ڕێی نێو شاخو داخ.

ڕەنگی دواجگەرەی منو ڕەنگی دوا شێوەی دووکەڵم!
لەنێو هەموو ڕەنگەکانی تردا نەهێنیەكو دووانو سیان
بەدەستمەوە هاتنە دەرێو ڕەوینەوەو لە وەڵامدانی
دەنگیشما سەری زۆریانم داگیرسان..
ئەی ڕەنگی مەرگ.. هەر بەتەنها ڕەنگی تۆبوو!
چووە ناو ڕەنگی خوداوەو بوو بە ڕەنگی تەلیسمێکی
ئەودیو ڕەنگو ئەودیو دەنگو ئەودیو بینینو تەماشاو
بۆم هەڵنەهات! بوو بەڕەنگی بزربوونو
بوو بەڕەنگی بێ کۆتایی گەردوونێكو
بۆم هەڵنەهاتو هەڵنەهات.
ئەی ڕەنگی مەرگ چاوەڕێم بە!
من لە شێوەی قەسیدەیەکی قەمووردا
یان وەرزێکی پشت کۆماوەو
یان لە شێوەی سێبەرێکی لەتو پەتو
یان لە ڕەنگی سۆراخێکی بێ ئاکامدا ئەگەمە لات،
وەك بێ ئاکامی هاواری شەوی خوێنم لە جادەکانی مێژوومدا
وەك بێ ناکامی پرسیارمو پووکانەوەی دەنگەکانم،
لە گەرووەمدا.
ئەی ڕەنگی مەرگ! ڕەنگی نەمر!
ڕەنگی سەرمەدیی ئەودیوی ئەم گەردوونەو
ڕەنگی خەوێکی ئەبەدیی.
تۆ پرسیاری هەتا هەتایت

هەموو ڕەنگەکانی ئێمە ئەگەڕێنەوەو ئەچنەوە
ناو ڕەنگدانت!
تۆ هەر خۆت ڕەنگی عەدەمو ڕەنگی بیرچوونەوەی ڕەنگو
ڕەنگی چرکەکانی کاتیت!.
بێدەنگیتو.. لەهەموو دەنگێ زولاڵتر!.
بێشوێنیتو.. لەگشت شوێنێکدا ئامادەیت!.
بێ ڕەنگیتو.. لە هەموو ڕەنگێ بە ڕەنگتر!.
تۆ ژەنگ بە ڕەنگەکانی سوڵتانو بە ڕەنگی شاو..
ڕەنگی کۆشکی بلورینو..تۆ ژەنگ بە زێڕ هەڵئەهێنی.
بەلام ئەی مەرگ، من ڕەنگێکم لایە: وشە
بیرچوونەوەت چەندە چاڵی، بۆ هەڵکەنێ
ئەو ڕەنگێکە بە نەهێنیدا ڕۆئەچێو
لە ((گلگامش)) شیرزەتر بە شوێنتەوەو
سۆراخێکەو هیلاك نابێو
تۆ لەکوێ بی ئەویش لەوێ سەر دەردێنێ
من ڕەنگێکم لایە: وشە
بە نەبوونو بە عەدەمو بۆشاییدا ئەگەڕێتو
لە موتڵەقا بینینەکانی ئەڕوێنێ!.
ئەی ڕەنگی مەرگ!
وەختێ هاتی، وەختێ ئیتر، بۆدوا سەفەر لەگەڵ خۆتا
جانتای هەڵتەقیوی لەشمو .. پڕپاسکەی گرێدراوی سەرمت برد!.
وەختێ لەناو کۆشتا وەریم

ڕەنگەکانم ئەوروژێن‌و
ڕەنگەکانم وات پێ‌ئەڵێن:
ئەو سەردەمێ.. ڕەنگی ڕۆح بوو
لەناو هۆنراوەی سپیدا!.
ئەو سەردەمێ.. ڕەنگی خاك بوو لەناو دەنگی ئازادیدا.
ئەو سەردەمێ.. ڕەنگی خوێن بوو لەناو جەستەی قوربانیدا.
ئەو سەردەمێ.. بۆنی ژن بوو لە ڕەنگی خۆشەویستیداو
ئەو سەردەمێ چەندی توانی
بوو بە خەیاڵی ئاوێنە لەبەرهەتاوی جوانیداو
چەندی توانی.. شیعری تازەو، مەلی تازەو،
خەونی تازەی بۆ ئەم زمانە غەمگینەی کوردیی هانی!.
((ئەی ڕەنگی مەرگ!
هێشتا تۆ نەچووبووی بۆلای..
شەوێك ((پوشکین)) لەناو کەژاوەی بەفرێکی ڕووسیادا
خەوی بەدوای ڕەنگی کۆچ‌و..
ڕەنگی جیهانی دوای مردنیەوە بینی، خەوی بینی،
خۆی ئەبەیت‌و بەڵام شیعریت بۆ نابرێ‌و خەوی بینی
چون سەوزایی، ڕەنگی وشەی ئەو هەر ئەژی.
منیش ئێستا، بەرلەوەی بێیت، هەرهەمان خەو،
لەکەژاوەی پایزێکی پڕ پەپوولەی ڕەنگی خۆم‌و، هەرهەمان خەو
لەناو هەورێکی سپیی سەر کوردستاندا ئەبینمەوە:
هەتا زەمانێکی درێژ، لەسەر شەقامی داهاتووی، زمانەکەم

ئەبمە هەیکەلی ڕاوەستاو، زەردەخەنەم ڕوو لەشاخو
جانتاکەم هەرلەبن باڵداو
کە سامالٚ بوو.. خۆرەتاوو
گشت شەوێکیش.. ڕیزەگلۆپی داگیرساو
یان تریفەیەك ناوبەناو..
بەیەکەوە تیشکی ڕەنگاو ڕەنگی خۆیان.. نەرمو زۆرکەم
ئەدەن لەقەدو باڵام و لە جانتامو
لە چاویلکەم!
تا زەمانێکی زۆر درێژ.. من بێچەتر،
لەبەرباراندا ئەوەستمو لەبەر بەفرو کرێوەدا
سپی ئەبمو ئەتەزمو هەڵنالەرزمو دەست ناخەمە گیرفانمەوەو
مەگەر ((با))یەکی شیعر بێو بمتەکێنێو
یان پاسەوانی شەوانی ئەو شەقامە
لەبەرقاچما، بۆ خۆی ئاگرێ بکاتەوەو
بۆ چەند ساتێ هەردووکمان گەرمکاتەوە
((من ئەوساکەیش لەو وەرزەدا
بەتەنها لە یەك شت ئەترسم
شیعری ناو جانتاکەم تەڕبێو، بچێتەوەو
شیعرەکەیشم لەبەر نەبێ!))
ئەی ڕەنگی مەرگ !
تا زەمانێکی زۆر درێژ، ئەو پەیکەرەم، هەردووقاچم
لەخوارەوە، بۆ منداڵانی شارەکەم

ئەبن بە جێی گەمەو یاریی‌و خۆیانم پیا هەڵئەواسن‌و
بە ڕەنگی جوانی پێکەنین.. ڕەنگم ئەکەن.
دڵدارانیش، لەسەرکراسی سپیم‌و لەسەر سنگم‌و،
لەسەر یەخەی چاکەتەکەم
بۆ یادگار گوڵی ئیمزا بەجێدێڵن‌و، لەسەر سەکۆیش
چەند مۆمێکم بۆ هەڵئەکەن.
لەسەرەوەیش، جووتە مەلێ، لەناو قژما هێلانەیەك
بۆ ئاوازو خۆشەویستیی ئەم دنیایە
دروست ئەکەن
ئەی ڕەنگی مەرگ!
چاوەڕێم بە!
ڕەنگە لەناو پەڵەهەورێکی سپیدا کە پەپوولەو
کە نەورەس‌و شیعری ناسك دەوریاندابێ
بگەمە لات!.
ڕەنگە لەسەر پشتی ئەسپێ کە دووکەڵ‌و
کەسەرابو، هەڵمی تەنیایی‌و نامۆیی لێ هەڵبسێ.
بگەمە لات!
ڕەنگە وەختێ بگەمە لات..
ئێوارە بێ‌و بەفر ڕێگەی لەهات‌و چۆی چراکان و
لەهات‌و چۆی شیعرەکان‌و هەرچی شەپۆلەو مامزەو
ئەویندارە بەستبێت‌و منیش ئەوسا چون قاسپەیەکی
کەسیرەو گمەگمێکی تەزیوو یان بارڕژنێکی بریندار

بگەمە لات!. وەختێ بگەم، شەکەت شەکەت..
دەستم لە دەستی ((شین)) دابێو
دەستم لە ملی ((سوور))دابێو
سەری ((زەرد)) لەسەرشانم بێو، بگەمە لات.
دڵۆپ دڵۆپ، سەوزم لێ بتکێتەوەو،
ئاخی ((پەمەیی)) هەڵکێشمو
دواییش لەگەڵ، ((با))یەکی ئەرخەوانیدا، بگەمە لات.
ئەی ڕەنگی مەرگ!
ڕەنگی ژیان منی زۆرتر ترساندووە
نەك ڕەنگی تۆ، لێت ناترسم
چەند هێمنە، چەند بێوەیە، چەند بەسزمانە ڕەنگی تۆ
تۆ کەهاتی، هەر یەك جار دێیت.
تۆ کەهاتی، ئیتر من ناگەڕێمەوە نێو مردنە کاتیەکانو
تۆ کەهاتی، بەڕێزەوە، بەڕاکشاوی ئەمبەیتو
کەچی ژیان هەر بەپێوە کەرتم ئەکاو ناشمکوژێو
لە ڕۆژێکدا ئەو مردنی ڕەنگاو ڕەنگی
هەزار جاردێ!.
ئەی ڕەنگی مەرگ!
لە نوختەیەکی سەرسامدا چاوەڕێمبە!.
کوتومت وەك سەرسامبوونی وڵاتەکەم،
لەبەردەم مێژووی چەقۆدا!.
لە نوختەیەکی سەرسامدا چاوەڕێم بە

خۆتو گۆچانە کۆنەکەت.
خۆتو نەهێنی ژێر پاڵتۆو بزەبزی چاوەکانتو

ورتەورتی پایزێكو خشەخشی گەڵارێزان.
خۆتو دەریایەکی تەڵخو چرایەکی ئێجگار کزو
کەشتییەکی بێ ئارامو بەندەرێکی بێناونیشان!
ئەی ڕەنگی مەرگ!
ئەی ڕەنگی کپیو هێوری وخوێنی ساردو بێدەربەستیو
سوڕانەوەی ئەو پرسیارەی کەبەردەوام لەتەندورەو
لە گێژاوی ئەم شیعرەدا ئەمدا بەدەم نادیارەوەو
گێژم.. گێژم.. گێژم ئەکات.
چاوەڕێم بە!
ئەی ڕەنگی مەرگ
چاوەڕێم بە!
تۆ کە ڕەنگی سەرسامبوونی!
من کەهاتم
لەگەڵ خۆمدا ڕەنگدانی بەختی شاعیرو وڵاتێکت
بۆ ئەهێنم کە نەتدیبێو من ڕەنگێکت نیشان ئەدەم
ئەو ڕەنگەی تۆیش سەرسام بکات!.

سوید/ ستۆکهۆڵم/ تێنستا
2001/3/7

**لەناکاوێ..**

**ئەو وەختەی زریانێکی شووم و چەمووش لەناکاوێ،**

**لەسەر ڕا دێت و، بەچەپۆکانی گڤەو لوورەوە،**

له لووزەوی بێ ئامانی مەرگیا، له ڕەگەوە،
سووره شاتوویەکی، پژوپۆداری، سەرچڵ بەخەندەی،
سێبەر کڕی، توێکڵ بەئەزموون، بەرەو گۆڕیچەکانی
قولآیی کەندێ، تلاوتل ڕاپێچ ئەکاو، دەراڵ دەراڵ
جەستەی بەهارێکی خوێناویی لەگەڵ خۆیدا ڕائەماڵێ..
ئیتر ئەوسا دار شاتووەکانی هاوڕێ
سوور و سپیی، هۆن هۆن له دیدەی گەلاوە
فرمێسکی سەوز ئەڕێژن و له جۆلانەی بێ ئارامی لق و چڵدا،
خەمی تازه ڕائەژەنن و، بەخوڕەمیش، هەرپێکەوە
بەسەر لاشەی هیوایەکی لەت و پەتدا هەموو ئەگرین..
بەلآم هەر بۆ مەرگی ئەو شا شاتووە، درەختیش هەیه
خەمساردەو، درەختیش هەیه هەرناگری و
درەختیش هەیه ئاخێکیش بۆ شا شاتو هەڵناکێشێ و
یەك حەسرەتی مەیلەو شینیش بەبا نادا..
لەناکاوێ
ئەو وەختەی شابازێکی بەرسنگ زیوینی،
پەڕوباڵ بەرینی، چریکەداری بەهەڵمەت،
له بەرزایی شەقژنەوە، له هەڕەتی هەڵفڕینداو،
له سامالی تەماشادا.. له ناکاوێ بروسکەیەکی تیژی
مەرگەسات، لێی ئەدات و ئەیکا بە کڵۆیەك ڕەژووی
ئاسمان و شۆڕئەبێتەوە بۆخوارێ..
ئیتر ئەوسا باز و شابازو هەڵۆکان

**لەسەر دوندو هەڵەمووت و ڕەوەزەکان..**

**بەدەوری تەواری بێوەژندا**

**باڵی ئاخ ئەدەن بەیەکداو**

**بەدەنووك پەڕ ئەڕننەوەو**

**لەهێلانەی کونەشاخدا پرسە بۆ شاباز دائەنێن،**

**هەتا سێ ڕۆژ باڵی خۆیان ئەبەستنەوەو**

**ناچنە دەرێ و هەڵناکشێن بەرەو ئاسمان..**

**بەلاّم هەر بۆ مەرگی ئەو شابازەیش**

**باڵندە هەیە خەمساردەو لەگەشتی فڕین ناکەوێ و**

**باڵی ئاخ نادا بەیەکداو سامالّی چاوی ناژاکێ و**

**شتێك بۆ ئەو کۆستە نالێ..**

**کەچی ڕۆژێ**

**لەناکاوێ..**

**بەیانییەکی بێ وڵەت، بەیانیییەکی گزنگ کوژ،**

**لە"کەڵەوانان" بەولاوە**

**بستێ هەناسە بەولاوە**

**وەختێ کەڵە(شازاد)ە کەی شارم**

**لە ناکاوێ، ڕێکەوتی کوێر**

**کوێرتر لەشەوەزەنگێك و خێراتریش**

**لە وژەی بوومەلەرزەیەك..**

**لەکەڵەوانان بەولاوە، قولانجێ هەتاو بەولاوە**

**ڕێکەوتی کوێر.. هەر لە شێوەی چەخماخەیەکی ئەجەلدا**

له ئەسپی سپیی ئەوێداو
شازادەکەم لەو دەشتەدا، لەهەڵتوتانی قەدەردا
بەختی نەیار، لەنسکۆیەکی نەهاتدا..
سەرسمی داو گلاو گلا.. مانگی سەری شازادەکەم
شکاو پڕاو کەڵەوانان ئاڵ هەڵگەڕا..
ئیتر ئەوسا نەك هەر ئاشناو ڕۆشنای سەری شازاد
نەك هەر شەقام، نەك هەر ئەسپە سپییەکان و،
نەك هەر چاوی ڕۆژنامەکان..
نەك هەر شۆڕەبی هاوسەرو جوانووی خەمی،
منداڵەکان. ئیتر هەموو ئەو درەخت و،
ئەو باخانەیش کە بۆ مەرگی شا شاتووی سوور،
نەگریابوون، هەموو ئەو پۆلە مەلانەی،
کەبۆ مەرگی شابازەکەیش نەگریابوون،
هەموو وێکڕا، لەسیمفۆنیای هەنیسك و لە کۆنسێرتی
لاواندنەوەی وەرزەکاندا.. هەڵقرچان، و
هەر هەمان سات ولأتێکیان خستە گریان..
"شازادێ، دەکەڵێ دەڵێ لێ
بۆت مردین جانانە..
شازادێ، دەرۆحێ، دەڵێ لێ
باگژەی کۆچێ بوو بێ وادەو
سەفەری هەڵوادەی مەرگێ بوو بەو وەختی بەیانە
بۆت مردین جانانە".

ڕێم بده شازادەم.. ڕێم بده..
من لەبەر ئاوێنەی ئەم خوێنه نوێیەدا
شایی مەرگ، سەرچۆپی برین و، بەژنی زام ببینم
ڕێم بده سەربکەم بەکۆشی گوڵاڵەی سەر سنگتاو
سەر بکەم بەجانتای خوێناوی ڤانوون و بەماڵی
خەماوی ئەنقەرەو بەژووره، چۆڵەکەی ئێرەتا
ڕێم بده شازادەم.. ڕێم بده..
ڕابوردوو بێنمەوه بۆ ئێستاو
لەوێوه بەکەنار مێژوودا وردورد بێم
هەتاکو ئەگەمه ئەم تەمەو دواتریش
له ڕێگەی خۆرەوه ئەتخەمه سەر باڵی ئاینده:
تۆ چرا باوکت بوو. بۆ خۆیشت پەروانه
چرای باوك، شەوانه، له(خەویا)
ڕووناکیی ئەبەخشی بەمێژووی تاریك و
ڕۆمانی ئەکرده
پێپلیکەی دواڕۆژو سەرنجی زەمانه!.
چرای باوك بلووری خەیاڵی لەخەمی ولاّتا
درزێکی بردبوو هیلالیی
هەموو شەو کەهیلال هەڵئەهات
ئەم لەبەر شەوقێکی زامدارو غەمگیندا
به باڵی پەپوولەو، به نمەی باران و،
به پەلکی گیایەکی نواڵه.. شەقامێ له مۆم و

تەلانێ لە گوڵ و
دێراوێ لە وشەی ئەنووسی و
ئەیدایە دەست هەوری ئایندەو
ئەیکردن بەڕەنگی خەرمانە)
بۆ دووەم جار کەجیهانی گڕتێبەربوو دامرکایەوە،
ساڵەوەختێ دواتر، تۆ لەناو پەڕەی گوڵێکی سپیدا،
لەدایکبوویت. تۆ ئەو ساڵە لەئەستێرە بێشکەیەکی
گڕوگاڵدا ئەتجریوان و هێشتا هەنگە زەردەیەکی بزۆزی
نێو شانەی سێ دەریی ماڵێك بووی بە دەوری کتێبدا
گیزەت ئەهات. کتێب، کتێب لەودەمەداو لەماڵانی
ئەم شارەدا کتێب و هێلانەی کتێب و باڵندەی وشە
ئەوەندە کەم و دەگمەن بوون.
لە ترسی زرگ و شمشێرەکانی تاریکیی
ناوبەناو ئەیانخوێند و دەرئەکەوتن. تۆ لەودەمەدا،
گوڵە بەیبوونێکی بەر پەنجەرەی ژوورەکەی باوکت بوویت و
خۆشترین بۆنی دواڕۆژت لێئەهات.
منداڵ بوویت و بچووك بوویت و زەینت گەورە
بۆ یەکەمجاریش لە خوێنی دوو پڵنگی کوژراوی
بنەماڵەکەتانەوە
لە دوو قوربانیی ڕووناکییەوە
لە دوو ئەستێرەی سەربڕاوەوە
لە دوو وێنەی هەڵواسراوی هەردووکیانەوە کەشەوو ڕۆژ

چاویان لە چاوتان نەئەترووکان
یەکەم پرسیاری(بۆ)ت لادروستبوو!
دوو ئاوێنەی خوێناوی، دوو شووشە مەرەکەبی تیرۆرکراو:
(عارف صائب) مۆمێکی کافووریی داگیرساوی
ژێر چوخمەکانی دێوودرنجی ئەم شارە بوو.
ڕەشەباکانی تاریکیی لەسەردەمێکدا کوژاندیانەوە
کە وشەی نەترس تاك و تەرابوون و
چوونەوە بەگژ مێژووی دەروێشەکانی خەرافاتدا
ئازایەتی کێوێکی ئەویست!
تۆ لەچاوی ئەوەوە پریشکت هێنایە نێو چاوتەوەو
تۆ لەگیانی ئەوەوە بەهارت خواست و
هێناتە ناو گیانتەوە!
(جەمال عیرفان)یش ڕەگێکی  تری بنجەکەی تۆیە
جەمال عیرفان.. یەکەمین دار ئەلەکتریکی قوربانیی
لەیەکەمین شەقامی مونەوەریی ئەم دەڤەرەدا،
یەکەمین وشەی خوێناویی لەدەفتەری مەدەنیەتی ئێمەدا
تۆ لەباڵەخانەی عەقڵی ئەوەوە
ئەو پەنجەرەی جیهان بینییەت هێنایە ناو سەرتەوە
کە قاژووەکانی نوشتەو جادوو ئەیانویست
بەقوڕی تاریکی سواغی بدەن و
خۆرەتاوی لێ قەدەغە بکەن و
سۆمای زانستی لێ زەوت بکەن و

داهاتووی لێ بسێننەوە
تۆ ئەو پەنجەرەیەت، هەڵگرت و، لەڕۆژگارێکی تردا
پەنجەرەی ترت لێ زیادکردوو، لەگەڵ ئاوەڵەکانتا،
چەندین شەقامی ترتان بۆ نەوەی نوێی
دار ئەلکتریکەکان کردەوە.
لە(پیرەمێرد)ی وشە گەنجیشەوە
لەم پیری شاعیران و لەم ڕۆحی ڕەوانی زمانەیشەوە
لەچاوگی نەورۆزو ئاگرەکەی ئەویشەوە
لرفەی کڵپەیەکت وەرگرت کەکوردایەتی ئاگردانی و
ئەوینی کوردستانیی ڕێو بانی بوو.
تۆ لەو سەرچاوە ڕۆشنانەوە قوڵپت داو
تۆ لەو مێژووە ئازایانەوە هاتوویت و
تۆ لەو خوێنانەوە شۆڕش و گۆڕانت
کرد بەقیبلەنما!.
لەبەر چاومانی..
وەك دەست و پەنجەمان لێمان ون نابی
لەبەر چاومانی.. بەرامبەر خەیاڵ و
بەرامبەر نەینووکی ڕۆحمانی:
سەروقژت: لەهیوایەکی چڕی هەمیشە
ڕوو لە ڕۆژهەلأت ئەچوو.
دەم و چاوت بەردەوام ئەو گوڵ خەندەرانە گەشەبوو
کەنەرمە پێکەنینێکی فێنك ئەیلەراندەوەو

لەنێوان لێوەکانیشدا، وەختێ بای خەندەیەك
هەڵیئەکردو زاری ئەقڵێشاندەوە.. ددانەکانت
دوو ڕیزی مرواری بوون و چوون پەڕە سپیەکانی
گوڵە هەرمێیەك ئەبریسکانەوە..
لەبەرچاومانی گڵەزەردەی ئێوارانیو نارەوێیتەوە
ساکار بووی: چوون(زەمزەمەی بولبوولی بەهاران)و
سادەبووی وەك (وردە بارانی ژێر دەواران)و
تۆ ئەم خۆشەویستییەت لەیەك ڕەنگی ژیانەوە نەهێنابوو
چاوی تاووتوێکەری تۆ بەرلەوەی
خەوشی کەسانیتر بژمێرێ
لەپێشدا هەڵەو خەوشەکانی خۆمانی لەبەردەمدا
ڕیزئەکردین.
تۆ ڕەخنەیەك بوویت ڕووناك و ئازا
لەپێشدا بەرۆکی کراسەکەی بەری خۆت ئەگرت،و
چاوت لەهەنگاوە خواروخێچەکان نەئەنووقان و
بازیشت بەسەر چاڵی ڕەشی هیچ ئاکارێکدا نەئەدا
لەسەر هەقیش پەنجەیەك بوویت لەپێشدا لەو
دەم و چاوە موزەوەرانە ڕائەپەڕیت کە ڕووبەڕوو
هەرچەند سانتیمەترێ لەدەم و چاوی خۆتەوە دووربوون!
تۆ کورسی نەیکردبووی بەدیبلۆمات و لێپرسراو
تا ئەو لەسەرت دابنیشێو بێدەنگت بکات.
تۆ ئەو ڕەخنە تیژانەیش بوویت

که هەر بەتیغی پێکەنین لەگوناهی بەرامبەرەکەت ئەداو
هەر بەپرسیار هەندێ چاوت بەرەوژێر ئەکردو
چاوی خۆیشت لەبەرزیدا پرشنگدار
تۆ کاراکتەرو کەسایەتیت
لەپاشماوەی بنەمۆمی هیچ کەسێکی تر دروست نەکرابوو!
تۆ لەناوماندا لە گوڵە دەمەشێرێکی قنج و قیت ئەچوویت
یان لەپرسیارێکی هەمیشە زیت و لەسەرپێ
یان لەتێڕامانی ئاگرێك لەڕووبارێك و
یان لەو باڵندەیەی بێ قرە و ئارام بەدەنووك
پووش لە دوای پووش هەڵگرێ بۆ دروستکردنی هێلانەکەی!.
باڵای ڕاستەقینەی مرۆڤ
بەتیرێژی هەڵوێست و
بەقامکی ئازارەکانی ڕۆژانی تەنگانە ئەپێورێ!.
من ئەگەر بەژنی قوربانییەکانی دوێنێم و
بەژنی خوێنیان و بەژنی قەڵەمیان نەبووایە
بەژنی ئازادیی ئەمرۆی خۆم نەئەدی و
یەك گوڵیشم لەیەخەی دیموکراتیی نەئەدا.
هەڵوێستی کەڵەگەت بەپەیڤی خۆشییان ناپێورێ
من ناتوانم بڕوا بەهیچ وشەیەکی شۆڕشگێڕانە بکەم
ئەگەر بەگەرووی ئەشکەنجەدا تێنەپەڕیبێ!.
تۆ لەژمارەی سێدارەکانی دوێنێمەوە
لەگەڵ ملی ئەو پیاوانە ئەگەیت

کەمردنیان لەزیندانەکاندا دەستەمۆکرد
من قەڵەمێکم یادەوەریی مەرەکەبمە
سەعات ناگێڕمەوە دواوە، بەڵام بەو یادەوەریانە
سبەینێی ڕوونتر ئەنووسمەوە
من شاعیرێکم بەردەوام وەك ئاوێنە
بە بیرەوەریتاندا ئەچمەوە..
شارە بیرەوەریتان ئەوروژێنمەوە
بۆئەوەی دۆزەخەکانمان بیرنەچێتەوە
بۆئەوەی گوڵە شەهیدەکانم لەیادنەکەن
ئەو گوڵانەی جارێکی دی بەڕەنگێکی دیو
لەباخێکی دیو لەوەرزێکی تٍرداو
ئەمجارەیان لەپارکی ئازادیدا ئەڕوێنەوە!
تۆیش شازادم! تۆ لەوەیشومەکانی دیرۆکی ئێمەدا
ئەو وەختەی هاوار ئەیبەست و زوقم و بەستەڵەك
ئاوێنەی برین و بەرایی بەرچاومان چەند هەتەری بکردایە
هەر درێژبوونەوەی تیلماسکی تراویلکە بوو.
ئەو دەمەی ڕەنگ هەمووی لەزەردداو
دەنگ هەمووی لەکڕوزەدا و تام هەمووی
لە تاڵیشکدا کۆبووبۆوە..
ئەو دەمەی کەبەتەنها بەردی قەندیل هاودەم و
بەفری قەندیل پشت و پەناو.. شەوی قەندیل براو..
تریفەی مانگەشەوێکی هەڵەرزیو خوشك و

هەندێ بنچکی بچکۆلە جگەرگۆشەکانمان بوون
بێکەسی و تەنیایی و دەستەوارەیەك نانەڕەقە
جیهان و ژیانی ئێمە بوو..
باڵندە کەسیرەکانمان خەویان بەئاگرێکەوە ئەبینی و
فڕینیان بەستبووی..
هەر دەستەیەك لە عاشقان و جاویدان و
خوا لەوێ بوون!
تۆ لەودەمەدا لەشارێکی گرمۆڵەبووی نێو دڕکەزیو تەلبەندا
ڕوانین و جووڵەو هەنگاوی قەڵەمێ بووی
کەشەقامی ترس و سێدارەت ئەبڕی و
لەجانتا ڕەشەکەی پارێزەریی بن هەنگڵتا
نهێنی یاقوتێکی سووری هیوات شاردبۆوە
لەسەریشتا هێماکانی شفرەیەك بریسکە بریسکی بوو
کەهەر خۆت و ناودەوارێکی شڕی قەندیل پێی ئەزانی!.
وەختێکیش لە ڕێگەی دووکەڵی سوورو.. ئاوی سوورو
دڕکی سوورو.. لە زەمانی پیاوکوژانەوە چوویتە ناو
زەمانی دڵدارانەوە.. گەیشتیتە(زنوێی سوور)
لەپێشوازیتا گوڵێکی سوور، لەقڵیشە بەردێکی،
تەمەن هەزاران ساڵەوە سەری بە ورشەی هێنایە دەرەوەو
بەگوێی تاشە بەردێکی پاڵکەوتوودا چرپاندی:
(وا)(شازاد)یش هات! ئەمە کوڕی چرایەو
خۆشی پەروانەی چاوەکانی ئازادیی. من پێم باشە

**تۆ ببی بەدیواری ژوورەکەی!)**

**لە زنوێی سوور.. ئیتر هەر لەپاش چەند ڕۆژێ**

**بەفر بوو بەهاوڕێت و خەونت سپیی بوو.**

**لە وەرزێکی تردا، دارمێوێك بوو بەسایەی هزرت و**

**خەیاڵت سەوز سەوز بوو.**

**کانیاوێك بوو بە ئاوێنەت و لەهەردوو دیدەتا**

**نمەنمە بارانی زیوین باری!.**

**لە زنوێی سوور لەگەڵ دەستەیەك ئازاری ڕەنگاوڕەنگی تردا..**

**لەگەڵ کۆمەڵێ قەڵەمی بەجریوەی تردا..**

**ئەوانەی بەنووکی ئاواتێکی تیژ گوڵاڵەیان لەتاریکیدا ئەنووسی و**

**ئەوانەی لەدوای هەرەسی کوتوپڕی مێژووییەکەوە**

**لەدوای ڕۆچوونی کێو خۆیەوە**

**لەدوای شین و شەپۆڕی هەموو چەکەکان و**

**لەدوای هەڵاتنی هەموو سەنگەرەکان و**

**هەموو ئایدیۆلۆجیەکان و هەموو ڕەنگەکان و**

**لەدوای ڕاکردنی هەموو فیشەك لغەکان و**

**لەدوای ئەوەی دەرزیش خۆی لەکایاندا شاردەوەو**

**قەڵەمبڕو چەقۆی ماڵیش دەمی خۆیان کولکردوو**

**جلی ژەنگیان لەبەرکردوو.. نوشتانەوە**

**ئەوان هاتن و..**

**مێژوویەکی تریان خولْقاندەوە..**

**بۆ جەژنی لە دایکبوونەوەی یەکەم چەك قەندیلیان کرد بەباوك و**

باهۆز هات و یەکەم مۆمی ئەو تەمەنەی لەلوتکەدا کوژاندەوە!
لەوێ لە زنوێی سوور، لەناو زۆنگ، لەدەشتی بەرانەتی و
قەرەچووغ.. سوورە گوڵ زاو نەوەی نوێیان لێ کەوتەوە.
لەوێ لە زنوێی سوور.. لەولایەش لە شاری حەجاج و،
لە ناو چنگی مردن خۆیدا.. مۆم، مۆم، مۆم هەڵئەکرا
مۆم هەڵکردن لە ئەشکەنجەو لە سرووود داو لەناو قوڕگی
لەناو قوڕگی نەهەنگ خۆیدا..
مۆم، مۆم، مۆم هەڵکردن لە کێڵگەکانی بریندا..
لە چاوەکانی منداڵ و لە کۆڵانی تەنگەبەری خەم قوڕاویی
بێوەژندا.. مۆم، مۆم، مۆم هەڵکردن.. لەهەر شوێنێ
کە ڕووناکیی تیا کوژرابوو.. کە گۆرانیی تیا کوژرابوو..
مۆم هەڵئەکرا..
لە زنوێی سوور.. تۆیش ئەو مۆمە سوورەت هەڵکرد..
کە لەدوور ڕاو.. لەسەربانی ماڵەکانی ڕەحیم ئاواو
شۆڕیجەوە، وەك: بالآی(ئەنوەر) ئەبینرا.
ئەی(شازاد)ی گوڵەگەنم و ئاوەدانیی
ئەی پێکەنینەکەی ئاشتی و
قسەی خۆشی ئێوارەیەکی بەهارو
ئەی شەوانە گلۆپێکی ژوورسەرمان و
ئەی ڕۆژانە نەخشەیەکی ئارەق کردووی
نوێکردنەوەی باخچەی نالی و..
ئەی نوقڵەکەی ناو دەسە بچکۆلەکانی

منداڵێکی سلەیمانی..
ئەی هاوڕێم!
کۆگای گوڵی ئیمستردام!.
یان بەلەمی دەم بەخەندەی جۆگەکانی.
ئەی کۆترەکەی نامەبەری دیبلۆماتمان بۆ دنیای دوور
ئۆکۆردیۆنەکەت داگرەو ئەمجارەیان لەباوەشتا
حەسرەتی شینم لێبدەو
هەرلێم بدەو بمکەرەوەو دامخەرەوەو.. بمکە بەتەمی ئەنقەرەو
بەزمانی لاڵم لەویّ و وەکو نیشانەی سەرسوڕمان
لەدوای ڕستەی فرمێسکی ژنە کوردێك و
لەدوای دێڕی برینداری
شەقامێکی ئامەدەوە.. دامنیّ لەویّ!
ئەی هاوڕیّ!
ئەشیّ ئێمە، من و شیعرێکی تر لەیەکتری زویر بووبین.
ئەشیّ باخ و مەلێکی تر لەیەکتری دابڕابن.
ئەشیّ ئەم ڕەنگ لەگەڵ ڕەنگێکی دیکەدا
ئەشیّ ئەم دەنگ لەگەڵ دەنگێکی دیکەدا نەگونجابن
بەلاّم تۆ ئەو خۆشەویستییە گەورەیە بوویت
هەر هەمووومان، بە ناکۆك و بە زویرو، بە دەنگی جیاو
بە گونجاوو بە ناتەباو
بە هەموو ڕەنگەکانەوە، ئەمانویستی و
سەرمان ئەکرد بەدەروونتاو لەگەڵتابووین!.

ئەی درەختی خۆشەویستیی و
ئاوی ڕوونی برایەتیی
تۆ ئاسمانی یەك لەش بوویت و بەلاّم پۆلیّ جوانی و
رەندیی و میهرەبانیت تیّدا ئەفڕی:
پەڕەسیّلکەی سادەیی.
هەلّۆی قسەی ڕووبەڕوو.
کەوی دەنووك بەخەندە
بوولبوولی ڕوناکبیریی.
پەپوسلیّمانەکەی نەفس بەرزیی.
سویّسکەی زرنگیی و
لەدواییشدا شاهۆیەکی بالّکراوەی جوامیّریت تیّدا ئەفڕی.
تۆ یەك میّرگ بوویت و
بەلاّم چەندین ڕەنگی ژیانت تیّدا ئەبریسکایەوە.
لەڕۆژگاری ڕەشدا.. پزیزکی سوورت لیّ ئەبۆوە
لەوەرزی زەردی دابڕاندا..
پیّکەنینت گولّ ئەرخەوانی ئەگرت.
لەمەوسیمی هیوا بڕاندا.. مزگیّنی سپیی و
لەڕۆژانی ئازادیو بژویّنەکانی ئاوەدانکردنەوەشدا..
تۆ گولّەهیّرۆیەکی سەرلق سپی و
گولّەگەنمیّکی پڕ لەشیرو
ئاوی شیرینی بیریّکی ئیرتیوازی و
دینەمۆی کارەبای دوورە گوندیّك بووی.

چلەتە؟! یان چلەی هەتاوێك؟!
چلەتە؟! یان چلەی تاڤگەو شەتاوێك؟!
چلەتە؟! چی بڵێ قەڵەمی چل ڕۆژەی چاو تەڕم و خەم تەڕم و
چی بڵێ پەخشانی سەروقژ ژاکاوم و
سەدای کام زایەڵەی سەفەری لێوەدێ
شمشاڵی ئەم کۆستەو وێرانەی هەناوێك؟!
چوویتە سەر گردەکەی یارەو
بووی بەگوڵە عەترێ لەوێ
وەختێ شیعرم ئەبێ بەکزەبایەك و
بەلای تۆدا تێئەپەڕێ
ئیتر وشەو ئیتر ڕستەو ئیتر خەوم و بێداریم و
تەماشایشم وەکو دەنگم بۆنی خۆشی ڕەنگت ئەگرێ!
کە ڕۆژ ئەیشگاتە ئێوارە
ڕووئەکەینە شاخی گۆیژەو ئەڕوانین و
لەناو گەواڵە هەورێکدا، دەم و لێوت و، دڵۆپ دڵۆپ
پێکەنینت ئەبینین و
یاخود لەپەلکەڕەنگینەی
کەوانەیی سەر ئەزمرِدا..
کە شانی ڕاست دائەداتە سەر هەڕووتەو
دەستی چەپی لەبەرۆکی ناو ڕەزێکدا نوقم ئەکا
دەست و پەنجەو سەرو قژت و هەردوو چاوە گەورەکانت و
باڵات لێمانەوە دیارە

چلەتەو لەسەر ڕا چل وشەم بوون بەمەل
پۆلێکن لەفرمێسك بەکاوخۆ ئەفڕن و ئەگەنە سەر کەلی خۆرنشین
لەوێڕا تێکەڵی هەناسەی بوولێڵ و
سەرابی ئەبەدیی و ڕۆحی خواو گەردوونی نەهێنیی و با ئەبن.
لەوێڕا هەر لەناو قۆزاخەی پرشنگ و
تریفەی زیوڕێژدا تۆ دێیت و
(پیرەمێرد) بەخۆی و گۆچان و شیعرەوە لەوێیەو
تۆ دێیت و..(عیرفان) و فێستەکەی، عیرفان و
زامانی بەورشەی لەوێیە.
لە هۆبەی باراندا، لەهۆدەی گوڵباخ و ئەویندا
بەپەری خەوەکەی باوکیشت ئەگەیت و
بە(ئارام) ئەگەیت و ماچێکی تەوێڵی ئەکەیت و.. لەوێدا
پێکەوە بەکۆمەڵ گۆرانیی:
(کەدەڵێن ئەمرۆ دەشت و کێوشینە) ئەڵێن و
"ئازاد"یش، بەرامبەر هەمووتان، لە شورفەی نارنجیی
هەورێکدا وەستاوەو، بەگیتار
یادێکی زنوێی سوور، ئازادیی و هەڵەبجەو
کازیوەی ڕاپەڕین لێئەدا.
چلەتەو هەنوکە من شەوم و چل پەنجەی
پەخشانم داگیرساو. لەدەشتی سوسێداو لەکەڵەوانان و
لەئاوی دوکاندا، چران و وێڵ بوون و درەختن
وێڵ بوون و، کوکوختی کەرکوکن  وێڵ بوون و بەشوێنتا ئەگەڕێن

**"شازادێ، دەکەڵێ، دەڵێ لێ، دەلۆ لۆ**
**هەر من نا، خەم گەڵێ، زنوێێ، قەندیلێ، شەمامێ،**
**تورنجێ، تابلۆیە، شەقامێ، گۆڤارێ**
**بۆت مردین جانانە!**
**شازادێ، دەڵێ لێ، دەڕۆحێ، دەلۆ لۆ)**
**من ئەمڕۆ ئاگرێك لە زمان بەرئەدەم**
**بڵێسەی بگاتە بەرزایی خەیاڵم**
**تا هەرچی هەورێکی نەباری گریانەو من ماومە**
**بباری و شەست بکاو دڵۆپێ لەچاوما نەمێنێ**
**بۆئەوەی قەرزیکات شیعرێکی داهاتووی**
**دیوانی پایزەی ئەمساڵم!.**
**من ئەمڕۆ ئاگرێك لە پووشووی**
**ئەم دەشتی هاوینەی پەخشانم بەرئەدەم**
**بسووتێ و بپڕوکێ و هەڵپژێو هەڵقرچێو**
**لەدوای خۆی فەرهەنگی زوخاڵێ بۆ ماڵێ جێبێڵێ**
**(دەلۆ لۆ، دەڵێ لێ، مەقامێ، قەتارێ**
**لاوکێ، خوێن بێنێ لەبینین، خوێن بێنێ لەدەنگێ**
**بۆت مردم شازادم**
**بۆت مردم جانانە!)...**

سلێمانی
2001/6/23

بەو سەرەوە، گەواڵە هەورەکان وتیان:
ئێستە خاك لە ئێمە شپرزەترەو
ڕەنگەکانی ناو پەلکە ڕەنگینەیش وتیان:

**ئێستە زمانی کوردیی لە ئێمە پەشۆکاوترەو**
**پەلکەگیاکانی بەر پرژەپرژی تاڤگەیەکیش ئەیانوت:**
**چاوی ڕۆژنامە لە چاوی ئێمە تەڕترەو**
**ئالأیەکی ئاوێزانی سەر تابوتێکیش پێی وتین:**
**لەم ساتەدا تەنها هەر دڵی ئازادیی**
**لە ژوورەکانی گریان و خۆرەکەی من دڵتەنگترە.**
**خاك بەسەر مەرگی ڕووبارێکی خۆیدا کەوت**
**"تۆ بڕوانە ئەو بەردانە**
**چۆن جێگۆڕکێ بە ژانەکانی یەك ئەکەن"**
**زمانی کوردیی چرایەکی دیوارکۆی،**
**ژووری میوانی خۆی لێ کوژایەوە.**
**"تۆ تەماشا نیشانەکانی سەرسوڕمان**
**چۆن دەسی ئەو حەرفانە ئەگرن تا نەکەون"**
**ڕۆژنامە گوڵدانی سەر وتارێکی**
**خۆی لە دەست بەربۆوەو شکا**
**"تۆ بڕوانە:**
**سەردێڕەکان چۆن خۆیان دانەواندوەو**
**وردە شووشەی ڕستەی شکاو**
**لە دامێندا ئەچننەوە"**
**ئازادییش زەنگێکی گەرووی**
**سروودەکانی لە زرنگانەوە کەوت**
**"تۆ تەماشا**

**چۆن بێدەنگییش**

**بووە بە کۆترێکی ڕەش و**

**لەسەر شانی هەشتی نیسان هەڵگورماوە"**

**ئێوەیش هەموو برادەرە هەورەکانم!**

**ئەی پەلکە ڕەنگینەی خوشك و**

**مناڵینە، پەلکە گیاکان**

**تۆیش ئەی ئاڵای**

**غەریبی ناو ئاڵاکان و**

**ئەی دوا نمەی شیعری تەڕی ناوچاوانم،**

**ئێمە ئیستا لەم چاڵی خۆرنشینەدا، بە زەردەپەڕ**

**باڵای قەڵەمێك دائەپۆشین**

**کە لە نووکی ئەوەوە**

**"ژێ کافێ" برووسکەی داو**

**لە سەری ئەودا ئەیلولێ کردی بە ڕەهێڵەو**

**لە دەفتەری بەردیشیا شەفەقێ ڕسکا.**

**ئێمە ئیستا ماڵئاوایی لە ژیانی چیرۆکێکی درێژی**

**هەشتاو شەش لق و پۆپ ئەکەین**

**کە لە"گەلاوێژ"ی کازیوە جوانترو**

**لە هەنگاوی"بەرەو ڕووناکیی" منداڵێکمان گەشترو**

**لە ژانی گەلی ناو تووناو تونی ئەنفالەکانمان بە گینگڵتر و**

**لە زەردەخەنەی"شیرین بەهارە"ی**

**نەورۆزی تازەمان ئازیزتر.**

ئێمه هەنوکه پەنجەرەیەك بە گڵ ئەسپێرین
کە پەنجەرەی خۆرەتاوی سەر گۆیژه خۆی بوو.
بەژنی باڵەبانێ ڕائەهێڵینە گۆڕەوە
کە باڵەبانی سەر دوو لێوی شیعر خۆی بوو
بەیانییەو کەچی ئاسمان
ئاسمانی ئێوارەیەکی خۆڵەمێشییەو
ئەوەتا: ڕۆژنامەکانمان
نزم ئەفڕن و لە پۆلێ پەڕەسێلکەی زیز ئەچن.
دوا ژمارەی گۆڤارەکانمان بۆینباخی ڕەشیان بەستووەو
لە پرسەی گۆمێکدا لەبەر تریفە غەمبارەکان هەڵئەسن.
کورتە چیرۆکەکانمان
یەکی گوڵێکی سپییان بە دەستەوەیەو
فرمێسکی ناونیشانی خۆیانی پێ ئەسڕن.
ئەمڕۆ لە دادگاکانماندا،
"قانون" پیاوێکی جانتا بە دەستی
شڵەژاوەو عەینەکەکەی تەم گرتوێتی.
لە کافتریاکەی زانکۆیشدا
"خازێ"بووە
بە کچە خوێندکارێکی ئەسمەری کەرکوکیی و
بە دەم خواردنەوەی قاوەی تاڵەوە
سەرنج لە کۆچی پەڵە هەورێکی
گۆچان بە دەستی دوور ئەدا.

ئەمڕۆ لەناو هەموو ژوورەکانداو
لەم شارەدا
هیچ ژوورێ ئەوەندەی ژووری پارێزەران
پەپوولەی بیرەوەریی تیا کۆنەبۆتەوە.
هیچ شەقامێکیش ئەوەندەی
شەقامی سابونکەران
خێرا خێرا سەرهەڵنابڕێ
بۆ نووسینگەیەکی ڤاتی دووی
ئەوڤاتییەکی زیتەڵەو ڤۆزی جاران.
ئەمڕۆ هیچ دار هەنارێکیش هێندەی
دار هەناری"ئاوە کورتێ"
نمە نمە یادگاریان ناپژێت و
دامەنی"تەیەت" ئاڵناکەن.
هیچ نامیلکەیەکی سەر ڕەفەی کتێبخانەیش
هێندەی"یادگاری لاوان"
لاپەڕەکانی پڕ نەبوون لە"با"ی نامۆو
لە تەمتوومانی لەندەن و
لە گمەی ژان.
تەمەنێك لە پلیکانەی هەتاو
تەمەنێك لە دەغڵی وشە.
تەمەنێك لە چریکەی قەڵەم و
تەمەنێك پڕ لە مانگە شەوی شیعرو

تەمەنێك پڕ لە ئاوێنەی ڕەنگاڵە

★

لەگەڵ "با"دا بگەڕێوەو
سەر بەرەوە لە وێستگەکانی ڕۆژ ژمێر
سەر بەرەوە لە چەخماخەو برووسکەی ساڵ:
هەر ئەوەندەی بگەیتە لای
جادەیەکی شەشی ئەیلول،
تۆ هیچ مەڵێ و،
ئیتر ئەو خۆی، یان درەختی، یان دووکانی،
یاخود پایەی تەلارێکی،
دێنە قسەو بۆت باس ئەکەن،

کێ بوون ئەو وشە شاریانەی بۆ یەکەم جار
لە دەربەندو ئەشکەوتەوە:
دەنگی مێژوویان گواستەوە،
خەونی وڵاتیان گواستەوەو
ڕاپەڕینیان دابە کۆڵی ئازادیداو
هێنایانە بەر دەرکی شار.
لەو ڕۆژەوە شەقامیان کرد
بە مەچەکی پاشەڕۆژو
لەو ڕۆژەوە، کتێبیان کرد
بە چاویلکەی بیری تازەو

کردیانە چاوی ڕۆژگار.
هەر ئەوەندەی بگەیتە لای
کۆنە دیوارێکی زیندان.
لای هەوای کپی قاوشێ،
لای مەرکانەی گرتووخانەی
سەحرایەکی دووره دییار: تۆ بێدەنگ بەو،
ئیتر ئەوان ئەجوولێن و دێنە قسەو،
لە برینی دیوارەوە، لەناو زاری زنجیرەوە،
لە ئاوی ژەکی مەرکانەو،
لە بنمیچی قاوشەوە، پەیڤەکانی برایمۆك،
کلوو کلوو دێنە دەرێو
بە ئازاردا شۆڕ ئەبنەوەو
دیسانەوە لە بەردەمی پەریخان و دڵداراندا
ئەبنەوە بە: ئاوێنەکانی یادگار.
تۆ بگەرە چاوی"شیرین"..
ئەیشگەیتە لای گۆمی ورمێ.
تۆ بگەرە"دیاری لاوان"..
ئەیشگەیتە لای مێرگی بەهرەو کەپری زمان.
تۆ بگەرە خەمەکانی"سۆفی هەسەن".
ئەیشگەیتە لای فرمێسکەکانی ولاتێ.
بگەرە "دوا تیری کەوان"،
من ئەزانم ئەیشگەیتە لای

ئەو ورەیەی
جارێك ئەبێ بە بای سووری ناو تۆفان و
جارێکی دی بە دەنگی بەردەقارەمان.
"تۆ ئەگەر نەژیت بۆ مردن
تۆ ئەگەر بمریت بۆ ژیان"
نە هەڵئەورێ پرشنگ و
نە ئەشمرێ خەونی ئینسان!.
محامی گوڵە گەنم بوو.
جانتای دەستی پڕبوو لە کرووزەی زەوی
ئەوقاتیی جۆگەی هەژار بوو.
چەکمەجەی مێزیشی پڕبوو،
لە گریانی وردە چەوو
لە ئاوی غەدر لێکراو.
محامی ڕەنجی قوڕاویو
محامی ئاسکی بێوەژن
محامی شیعری گیراو بوو..
ماڵەکەی پڕبوو لە بۆنی دادپەروەریو
دۆسییەی سەر ڕەفەیش سیخناخ:
لە بێ ئۆقرەیی گومان و
لە قریشکەی تەڕی ژن و
لە تارمایی چەقۆکانی دەستی تاوان.
دەعوایەك لە هەق.

تەمێك لە گومان.

عەشقێك لە دادو

هزرێك لە ڕامان.

لە ئیستەیشدا هەر ئەوەندەی بگەیتە شاری تەمتوومان

ئەودیو هاژەکانی زەریا

لە لەندەندا

وەکوو خەمت

تاکسیەکی ڕەش بگریت و

بەرەو باشوور بئاژویت و

بڕۆیت.. بڕۆیت

تا ئەگەیتە ناونیشانی

"وەلینتن، مارچ مۆنت ڕۆد،

ژمارەی خانوو "30"

کە دابەزیت

دەرگایەکی بستەبالآی تاسەر ئەژنۆت ئەکەیتەوە

بە دوو هەنگاو

وەك هەنگاوە کورتەکانی بەیتی شیعر

بە نێوانی هەندێ فاریزەی گیاو گوڵی

بێ تاقەتدا تێ ئەپەڕی

لە ناوەوە، ئەگەیتە بەر

هەورازێکی پلیکانەی تەختە بەندی

تەنگەبەر وەکوو غەریبیی

تۆ دەروونت پڕ لە لاولاوی پرسیارەو
هەڵئەگەڕێی
سەرئەکەوی. لە سەرەوە ئەگەیتە ژووریٚ ڕۆح سپیی
وەکو جاران، لەگەڵ پیاویٚ دائەنیشی
ڕووخۆش وەکوو درەختێکی بەفر بەسەر
ئەو وەختانەی لەبەر هەتاو پیٚ ئەکەنیٚ و
ڕویکردۆتە ئاوێنە گۆمێکی زنوێر
سادە سادەو ڕۆح سووك وەکوو
هەڵفڕین و گمەو چینەی،
کۆتری"ترەڤڵ گارد سکوێر"
کە دانیشتی و چاوت گێڕا
نە یەك قەنەفەی لووت بەرزو
نە یەك کورسیی لە خۆبایی و
نە وێنەیەکی بە دەعیەو
نە مافورێکی بە فیزو
تۆ هەر وەکوو گوڵەکێوی ساکاریی ژیان ئەبینی.
کە دانیشتی ئیتر کتێبی گەنج و پیر
چاوڕەش خەڵکی عەرەبستان
چاوشین خەڵکی ئینگلستان
دەورت ئەدەن
نزیك و دوور
نامەی خەم لێنیشتووی زۆرو

پارچە کاغەزی چاوەڕوان لە مابەینی لاپەڕەداو
هەندێ قەڵەمی بێ کڵاو
هەندێ ڕۆژنامەی پاڵکەوتوو لەسەر کورسی و
هەندێ جریوەی یادگار لەملاتەوەو
هەندێ چریکەی ڕۆژگار لەولاتەوە
سەیرت ئەکەن.
وەختێ ئەزانی لە چاوتا
گەلاویژێك ئەجریوێنێ و
وەختێ ئەزانی لەبەری هەردوو دەستتا
شەوبۆی پەخشان سەردەردێنێ و
باڕەکەوێ لەناو سنگتا ڤاسپەیەتی و
ژانی کردوە بە شیعرو بۆت ئەخوێنێ.
کە دانیشتی تۆ هیچ مەڵێ و ئیتر ئەوان
دێنە قسەو بۆت باس ئەکەن
باسی نامۆیی ئەو وەختەی
وەك گڵۆپی ناو تەم و مژ
چۆن شەوانە لە بەندەری
خولیاکانی ئەم پیاوەدا دائەگیرسێ
باسی جەستەی لە ژوورێکداو
بەڵام ڕۆحی دوور دوور لەوێ:
دەمێك لە دەریاچەی واندا
ئەبێ بە ماسیی کرمانجی و

دەمێکی تر لە خەرەندی ڕەواندوزدا
پەپوولەیەکە سۆرانی و
جارێکی تر لە کەرکوکدا
ئەبیتەوە بە ئاگرێ.
لە نەخۆشخانەی"سانتهێلێر"
لە ڕاڕەوێکی سپیدا
لە ڕاڕەوێکی درێژی بەنـج کراوی بێ سرکەدا
لەو ئاستەدا کە ژین و مەرگ
بەینیان لە پەردەی چرکەیەك
تەنکترەو،
هەموو ساتێ لە یەك دیارن.
لە ڕاڕەوێکی سپیدا
لەو شوێنەدا، بۆنی فۆرمالین و بۆنی
چاوەڕوانی و
بۆنی هەواڵی کوت و پڕ تێکەڵ ئەبن.
لە ڕاڕەوێکی سپیدا،
سپییەکی لە هۆش خۆچوو،
وەکوو بەفرێ

لەبەر شەوقی کەم و کزی گڵۆپێکدا
عەرەبانەی ماڵئاوایی، مەرگی مەنگەو
سووك سووك ئەڕوا

پیاوێکی نیوه داپۆشراو
له ئیستەدا
له جۆگەی بەر زەردەپەڕی ئێواران و
له خەیاڵی نووستووی گوڵ و
له ژانێکی بن گۆم ئەکا.
چون کزه با ڕاکشاوه
"بۆ یەکەمجار یەکێکی تر چاوەکانی داخستبوو
بۆ یەکەمجار یەکێکی تر لەسەر پشت ڕایکشاندبوو"
عەرەبانەی خاوی مردن
به ڕاڕەوێکی سپیدا تێ ئەپەڕێ
له پەنجەرەی بێ تاقەتی دیوارێکی سەرسامەوه
هەتاوێکی نەخۆش، باریك، دێته ژووری و
به دەم ڕێوه له قژی سپیی ئەنیشێ
هەموو شتێ سپیی.. سپیی
غوربەت سپیی
دوکتۆر سپیی و
فرمێسك سپیی و
مەرگیش سپیی!.
دوا وشەی تۆ له"سانتهێلێر" چاوی لێکنا.
گەڕایتەوەو بووی به خەوی باران و با.
گەڕایتەوه:
لەملا لقی ژاڵه بوویت و له تابووتا ڕاکشابوویت.

هەر هەمان سات، لەولاشەوە، ئەمانبینیت
لە بەفری پیرەمەگروندا
چنارێك بوویت لە گزنگ و
ڕاوەستا بوویت.
لەملا گڵ بۆ خۆی ئەیبردی و
مانگی نیسان بە هێواشی
بە شەماڵێ دایئەپۆشیت
هەر هەمان سات لەولایشەوە
ئەمانبینیت لە سەفینی و
لە نێوانی دوو کەلەوە
باڵندە چرای کۆچەری و
بریسك و هووڕ دەرئەکەویت.
لەملا زنەی چاوەکانت
لەژێر بەیداخی غەمباردا
دوو هەڵبەستی نوستوو بوون و
هەر هەمان سات لەولایشەوە
ئەمانبینیت بە خەبەری و
گوێژەت کردووە بە کورسی و
"گردی سەلیم بەگ" بە مێزو
چەخماخەیەك بە قەڵەم و
سەوزە گیامان بە کاغەزو
ڕۆمانی باران ئەنووسیت.

تابووتێ لە شەو.
ئالأیەك لە خۆر.
گۆڕێك لە پایز.
شارێك لە وەفا.

**سێ پۆستکارتی خۆشەویستیی**
**لە سێ سەرچاوەی خۆشەویستییەوە بۆ سیاپۆش**
**یەکەم پۆستکارت:**

من ئاوی زمانی کوردییم
ئەمڕۆ شلوێیە چاوانم و لەڕێو باندا
وەك تارمایی حەرفەکانی خۆم ئەبینم.
من زێیەکی کەڵەگەتم لێ ونبووە
ئاخر بۆیە من گۆڤارم لیخن بووەو
وەختێ بەناو گەلیی وتارو پەخشاندا تێئەپەڕم
لە کەناردا سەرم ئەدەم بە گابەردی ڕستەکانداو
لەناو قەڵبەزەی شیعریشدا خوڕخوڕ ئەگریم.
من ئاوی زمانی کوردییم
مەگەر هەر خۆشم بزانم
ئەم عاشقە چەند ڕووباری پاککردمەوە
لەو قەوزانەی ڕێی ڕۆشتنیان لێ ئەگرتم.
وەختێ ئەم کارتەیش ئەنووسم
حەرفی بزوێنم سست بوون و

بووم بە تانجەرۆی چاوکزو
ئەوبەر کەنارم نابینم

**دووەم پۆستکارت:**

من ئاسۆکانی ڕۆژنامەم
ڕۆژنامەیەکم مردووە
بە قەد هەتاوی سەربەفر پاك و جوان بوو
بۆیە ئیستە من ئەبینن
لە دووکەڵی مانشێتێکدا بە حاڵ دیارم و
فرمێسکی ڕەش ژووری ستوونم تەڕئەکاو
گۆشەم ئەکا بە ئەستێرکی حەپەساوو
وەختێ ئەم کارتەیش ئەنووسم
هەواڵەکان، هەموو بە جلی ڕەشەوە
دەوریانداوم!.

**سێیەم پۆستکارت:**

من مەملەکەتی سیحراویی ناو ئەدەبم
هەڵفڕینی بێ کۆتایی ناو خەیاڵم.
من خەیاڵێکم مردووە. تەلیسمێکم لێ ون بووە
درەختی مرواری شیعری تیاڕواندم و
جوانترین پارکی چیرۆکی تیا کردمەوەو
شارێکی گەورەی ڕۆمانی تیا بنیاتنام!.

**من پردێکم لێ مردووه**

**هەردووبەری: خۆشەویستیی هەژاران و**

**ئازادیمی بە یەکەوە ئەبەستەوە.**

**من ئەو پیاوەم لێ ونبووە**

**بۆیە ئیستە من ئەبینن دەم و چاوم**

**لە باڵەخانەی ڕوخاوی شارێك ئەچێ و**

**وەختێ ئەم کارتەیش ئەنووسم**

**هات و چۆی هەرچی وشەیە**

**لە شەقامما ڕاوەستاوە!**

**گلەیی نامەیەك لە زمانی پەپوولەو و گوڵەباخ ناسکتر،**

**لەم باخچەوە بۆ ئەو باخچە"**

**تاق  تافکەرەی عەشقێك ئەمرێ**

**دورونزیك باخانی تر**

**بە پیر تەرمی ئاوازەوە**

**تا سنووری سەدا ئەچن.**

**گولاو نامەی باخێك ئەمرێ**

**دورو نزیك شەپۆلەکان**

**بۆ چەند ڕۆژێ ڕەشپۆش ئەبن.**

**یەك ڕۆژنامەی شەپۆل بمرێ**

**دورونزیك هەرچی ئاوێنەی وشەیە**

**لە کەناردا کۆئەبنەوەو**

**درەختەکانیش کۆڕ ئەگرن.**

خۆ ئەم پیاوە
لە یەك وەختا تاق تاقکەرەو باخچەو
شەپۆل و ئاوێنەو درەختیش بوو.
لەودیو تخووبەکانی زمان و لەودیو
زەریای ڕۆمانەوە
پۆلە نەورەسی پەخشان و شیعر هاتن
شینە شاهۆی هەواڵنێرو
قازو قوڵنگی سیاسی و
کلاّوکوورەی ڕۆژنامەنووس زۆریان هاتن
کەچی تۆ لەناو زمانی خۆمدا بوویت و
لە باخچەکەی ئەوبەرمەوەو
سەیری ناشتنی خەرمانەی، مانگێکی منت ئەکردو
هەر نەیشهاتیت!
"دوا سکێچی ئەم بەشە بریتییە لە چەند پەندێکی
نێو ڕۆژ ژمێرەکەی"ه. ل. ب" و چەند
وێنەیەکی گەورەکراوی ناو ماڵەکانمان"
لە باگژەی ولاّتێکدا گوڵێك نییە بێتە دەرێ و
سەروقژی تۆز نەیگرێ و
لە بەردەکانی تاریکیی هەڵنەنووتێ
گوڵێك نییە.
بەفرێك نییە بەناو دووکەلاّ تێپەڕێو
وەك یەکەم بارین سپیی بێ. بەفرێك نییە

دارێك نییه له بازنەی ئاگردا بێ و
جارێك نەبێ بە داوەکانی پزیزك و پڕیشکەوە.
دارێك نییه.
تۆیش وەها بوویت و.. نەمردی
بەڵام مەرگی گوڵ وەختێکە
خۆی باگژە بێنێتە سەر باخچەی خۆی و
مەرگی بەفریش ئەو وەختەیە
ئەو خۆی دووکەڵ بێنێتەوە بۆ ئاسمانی و
مەرگی داریش ئەو کاتەیە
ئەو خۆی ئاگر بێنێتەوە سەر تەلان و دارستانی!.
ئەوەیش ئاو نەبوو تێپەڕی.
چیرۆکی کوێرەوەری بوو.
ئەوە"با" نەبوو هەڵیکرد.
گڤەی سروودێکی ئەم بوو.
ئەوە هەور نەبوو دایکرد
ڕێژنەی زمانەکەی ئەم بوو.
ئەوەیش مەشخەڵ نەبوو هەڵبوو.
سەری وتارێکی ئەم بوو.
ئەوەیش ئەستێرەی ئاسمان و سروشت نەبوو هەڵهات
گەلاوێژی گیانی ئەم بوو جریواندی.
خەیاڵێك لە باران
دەفتەرێ لە مێرگ و

شەقامێك لە تیشك و
كورسییەك لە خونچەو
خولیایەك لە ورشەو
مرۆڤێ لە زریان!
ببوورە شاخ! لەناو تەمی لەندەنەوە هاتۆتەوە
بۆیە گەردیلەی غەریبیی لە سەروقژی نیشتووەو
چون چاوەكانی كۆترێ لە بوولێڵدا
كەمێك لێڵ بووە چاوانی.
ببوورن سارای هەڵەبجەو گردی گولان
كە لانادات پەلەیەتی،
ئەم كزەیە، ئەم تاژانە
پەلەیەتی بگاتەوە سلەیمانی.
سیمای پیرۆزی مەولەوی!
تۆیش ببوورە كە ئەم پەپوولەی وشەیە
وەختی نییە، لابداتە، باخی ڕیشت و
تۆزێ لە نوورت بمژێ و
ئەوەتا وا لە كەلی گڵەزەردەوە
بانگی ئەكا، سلەیمانی!.
بەر لەوەی خۆی بگاتەوە
هەر بە بادی خۆش مروردا
پەنجەی سپارد بە ئەزمڕو
قۆخی دڵیشی دا بە"وان"

وەسێتی کرد ملی بکەن بە مۆمێك و
دایگیرسێنن لە گوێ سیروان!
گەیشتەوە!
قەسیدەیەکی ڕاکشاو لەناو"با"دا.
گەیشتەوە.
پەخشانێکی خەولێکەوتوو لەناو تەمدا.
گەیشتەوە.
ڕۆژنامەیەکی لوول کراو لەناو شەودا.
گەیشتەوە.
گەلاوێژێك بە نوستویی گەیشتەجێ و
کەچی دنیایشی ڕاچڵەکاند
سومبولێ لە ئاو تیشکێ لە"ژێ کاف"
عەشقێ لە بەفرو
کۆشکێ لە هەتاو.

گەیشتەوە
وشە لەناو"دڕك و گوڵ"و
وشە لە دەربەندی"ژانی گەل"و
لە"یادگارو هیوا"وە
هاتنەدەرێ و
وەك یەکەم جار
دیسانەوە هەڵفڕین و

له فەزای زیویندا بوونەوە بە خەیاڵ،
خەیاڵیش بوو بە مەلێکی ئەفسانەیی
بەر پەنجەرەی
ژووری تەنیایی نووسەرێ.
پۆل پۆل وێنە هاتنە دەرێ
دیسانەوە وەك یەکەم جار
وێنە بوونەوە بە ڕەنگی
بەفرو ئێوارەو مەراق و
چوونەوە لای
شەوقدانەوەی ناو سروشت و
بیرەوەری بەرئاگرێ.
چیرۆك نووسیش چاوەکانی
له سەریەوە هاتنە دەرێو
وەك یەکەم جار
باڵیان لێکداو گەڕانەوە
بۆ لای یەکەم
چیرۆك نووسی گەردوون
بۆ لای پەنجەکانی خوداو
بۆ ئاسمانی نەهێنییەك
کە نابینرێ!.
کاسکێتێ لە هەور
گۆچانێك لە شەو

جانتایەك لە یاد

عەینەکێ لە گۆم

هۆدەیەك لە خەون

مێزێك لە شەوبۆ

پیاڵەیەك چای سارد

زەینێك لە پشکۆ.

لێرە لەناو سەدەیەکدا

هەرچەند شاخێ لە ئاوێنەی بەهرەوەریی

چەند شەماڵێکی ڕەنگاوڕەنگ

چەند فڕینێکی ئاسمانی و

چەند باڵقۆنێکی ئەستێرە دروست ئەبن..

لێرە لەناو سەدەیەکدا

هەر هەندێ خەو

ئەبن بە مامزی سپی و دەرئەکەون.

هەندێ شابازی پێشەنگ و

هەندێ پەپوسلێمانکەی شیعرو

هەندێ لە چەخماخەی بیری

قەدەغەشکێن.. دەرئەکەون

کە سەری تۆ یەکێکیان بوو.

"بە یادی تۆو بە نەهێنیی

گەڕامەوە بۆ لای دیجلەو

خۆمکرد بە قولاّیی ئاودا

له بنەوە وتەکانتم بینیەوە
هەندێکیان بووبوون بە ماسیی و
ئەوانی تر بە گژوگیا"
بە سواری ئەسپی باهۆزێ
گەڕامەوە بۆ سەر شاخ و
لە لووتکەدا
خەیاڵەکانتم بینییەوە
"هەندێکیان بووبوون بە هەورو
ئەوانی تر بە گڤەی با"
لەگەڵ شەودا، دەمامکدار،
خۆمکردەوە بە کەرکوکداو
لە شەقام و لە گەڕەکدا
خۆشەویستیتم بینیەوە
"هەندێکی بووبوو
بە گوڵی پرتەقاڵی
چاو نارنجیی و
ئەوانی دی بە کوکوختی
ناو ماڵەکانی سەر قەلا".
لە دواییشدا بە یادی تۆ.
لەگەڵ"با"یەکی زەریادا
دیسانەوە گەڕامەوە بۆ لەندەن و
نامەکانی ئاوارەیی و چاوەڕوانیتم بینییەوە:

"هەندێکیان بووبوون بە گەلای هەڵوەریوی
"مارچ مۆنت ڕۆد"و
ئەوانی دی بە دەنگدانەوەی سەعاتی
لە یاد نەچوون لە بیگبندا".
دەنگێ لە برۆنز
ڕەنگێ لە سروود.
بۆنێ لە ڕستەو.
ڕوانینێ لە دوند.

لە یادداشتنامەی بەفردا
جێ پێی چیرۆکێ لە جێ پێی
هەرچی قەیسەرە دیارترە.
لە بیرەوەری نزاردا
سەری پەنجەی پەلکە شیعرێ
لە هەرچی خشڵی شاژنە
پیرۆزترە.
لە ڕۆژژمێری پەپولەو
لە یادداشتنامەی ئاونگدا
یەك دێڕی جوان
لە فەرمانی شاهەنشاهی گەورەترە.
لە یادنامەی دارستان و
لە بیرەوەری گوڵیشدا

دەنگی بولبولێکی پچووك
لە کەڕەنای کۆشکی سوڵتان
نەمرترە.
لە بیرەوەری ئەوینی ئەم خاکەیشدا
تەمەنی تاڵێك لە ڕیشی شیعری خانیی
عومری یەك قۆپچەی کراسی
چیرۆکێکی کوێرەوەری
تەمەنی یەك زەردەخەنەی مانگە شەوێ
لە کانییەکی"گۆران"دا
لە تەمەنی هەرچی شازادەی زێڕینی
ناو سۆران و بادینانە.. درێژترە!.
برژانگێ لە کولوو.
گەڵایەك لە گزنگ.
دڵۆپێ لە هیواو
ژانێ لە سووتوو

ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ..
تۆ پەیژەی میراتت نەبوو
کە چوویتە ناو هەورەبانی مێژووەوە.
کوڕی گەنم و جۆی ساکارو
کوڕی باوکێکی هەتاوی کاسبکار بووی.
تۆ کوڕی کتێبخانە بووی

سەرت هەنگ و
خانەخانەی کتێبخانەیش شانەی وشە.
تۆ کوڕی نۆتەی سرودوو مۆسیقا بووی
گوێچکەت سمۆرەی بیستن و
ئاوازەکان پلەی پەیژە.
ئەو وەختەی تۆ
لەناو دەربەندی زستانا
لەبەر ڕووناکیی خەیاڵی بەفرانبارا
لەو کێوانە شەوان درەنگ
میوانداریی
جریوەی عەقڵی هیگڵ و
خولیاکانی دستوفسکی و
پاڵتۆ بۆرینەی گۆگۆل و
فاوستەکەی"گوتە"ت ئەکرد
شەوێك لەگەڵ"ژان ژاك ڕۆسۆ"
دائەنیشتی و
شەوێك لەگەڵ دەنگی"ڤولتەر"
پیاسەت ئەکرد
دیسانەوە شەوێکی تر
لە دادگاکەی گالیلۆدا
ئەبوویتەوە بە پارێزەر
لەو وەرزەدا، ئێمە زۆرمان،

**لە دەرگای داخراو ئەچووین**

**ئێمە زۆرمان،**

**لە نسیەکانی مێژوودا**

**بووبووین بە شەختەی ساڵان و**

**ئێمە زۆرمان، توتیەکانی خورافات و کوێخاکانی**

**ژن بە ژنی نێوانی خەنجەرو تۆڵە**

**دەوریان دابووین.**

**تۆ کوڕی کتێبخانە بووی**

**باوکت نە وەسێتنامەی زێڕینی دیوەخان و**

**نە یەك بەڕەی سیاسەت و**

**نە پۆستاڵێکی عەسکەری و**

**نەیەك گوللەی دەسەڵات و**

**نە یەك چۆلەکەی جاسوس و**

**هیچی نەبوو.. لە گردی مامەیارە ڕووتتر بوو**

**ئەو بە تەنها هەر مۆمدانی**

**زەینی ڕوونی بۆ جێهێشتی.**

**هۆزەکەی تۆ**

**بە تەنها هۆزی کتێب و**

**عەشیرەتی مەرەکەب و**

**خێڵی چراو پەروانە بوو**

**شێخی تەریقەتی ئێوە لەسەر مێزیش**

**جارێ "بولبول"ی گۆران و**

جارێکی تر"داری ئازادی" بێکەس و
پەرداخێکی دەس خەیامی شەوانە بوو.
لەو دەوری مێژەوە هاتی..
لەناو ڕیشی"داروێن" و
لە گلۆپی"ئەدیسۆن" و
لە قۆڵی پاڵتۆی گۆگۆل و
بەر لەوانیش لەناو ڕۆحی"حاجی"یەوە هاتی.
تۆ"چیخۆف" میراتی پەیڤی بلوورین و
"لامارتین" گۆمی خەیاڵ و
"بایرۆن" هەندێ لە جریوەی
دەشت و دەری بۆ جێهێشتی.
کە سەرکەوتی بە فوارەیەکدا سەرکەوتی
هەر لەشی خۆت هەڵیقولاَن.
کە سەرکەوتی لە ئاگرێکدا سەرکەوتی
هەر سەری خۆت هەڵیگیرسان.
تۆ سەرت گوڵە بەڕۆژەی ئازادیی بوو
ڕوناکیی و عەشق لە کوێ بوایە
رووت لەوێ بوو.
هەر وەکوو خۆت وەکوو بەژنت
گۆچانیشت لە دارێ بوو هەتا مردن
بە پێوە بوو..
لە هەستانەوەی درەختا.. دوای بڕینەوەی

ڕەگێ بووی.
لە دەنگدانەوەی سووردا.. دوای بێدەنگ بونی
دەنگێ بووی.
شەپۆل هاژەی خۆی ئەدایتێ و
تۆیش هاژەت ئەکرد بە ڕۆمان
شەقام باسکی خۆی ئەدایتێ و
تۆیش باسکت ئەکرد بە چامە
ولأت دەشتی خۆی ئەدایتێ و
تۆیش دەشتت ئەکرد بە پەخشان.
خەڵکیش گەرووی خۆیان دایتێ و
تۆیش گەرووت کرد بە ڕۆژنامە.
تۆ بەیانیان پەنجەی خەمێکی دەرسیمیی
"چا"کەی بەردەمتی تێك ئەداو
تۆ نیوەڕوان ئەڵوەندێکی خانەقینیی
پەرداخەکەی پڕ ئەکردی لە فرمێسك و
تۆ ئێواران دار گێلاسێکی سەقزیی
کتێبێکی ئەدایتە دەس بۆ خوێندنەوەو
شەویش درەنگ.. درەنگ.. درەنگ
لەناو قژی بێوەژنێکی ئەنفالدا پاڵ ئەکەوتی و
لە دواییشدا
لە ناوچاوی منداڵێکی هەڵەبجەدا بوو.. ئەنووستی.
میراتێ لە نێرگز

میراتێ لە ڕۆمان
میراتێ لە کانیی و
میراتێ لە ئەوین بۆ هەموو نیشتمان
گەڕایتەوە ناو ژانی عەرد
ئەمجارەیان گڵ ئەداتە دەست پەلکە گیا.
ئیتر ئەبی بە قەڵەمی
پەنجەکانی سروشت خۆی و
بە چیرۆك نووسی بەفرو با
گەڕایتەوە هەناوی ئاو
لە منداڵدانی ئاوەوە دێیتە دەرێو
ئەمجارەیان ئیتر ئەبیت
بە قەڵبەزەی قەدپاڵێك و
بە سوولی ماهیی سەرچیا.
گەڕایتەوە ناو ژانی عەرد
بۆ لەمەودوا، لەناو ڕۆحی هەر وەرزێکدا
سەیرت ئەکەین.
ڕەنگە جارێك کلووی بەفری دەم با بیت و
جارێکی دی
دەنکە تەرزەی سەر تاشەبەرد
ئەشێ وەرزێ
گوڵە لیمۆی چڵێك بیت و
کچێکی عاشق بە شەوی مانگە شەوێ،

بۆنت بکاو ماچت بکاو
بتگرێته ناو ئامێزیً
ڕەنگە بشبی بە پەپوولە پایزەیەك
لەو پێدەشتەو
منداڵێکی پێخاوسی گەرمییانی
بە خلەخل شوێنت کەویً تا بتگریً
گەڕایتەوە بۆ ناو سروشت
بۆ لە مەودوا،
ئیتر ئەبیت بە خەونەکانی ئەفسانە.
ئەشیً ببیً بە سوێسکەی ڕۆژنامە نووس،
بە تیتروا‌سکی ئەو ڤاتیی.
بە هەڵۆیەکی سیاسی لەو کێوانەو
یاخود ببی بە پرشنگی
سەر پەنجەرەی چاپخانەیەك لەم شارانەو
لەوانەیشە، تۆ هەر ببی بە کڵۆیەك تەباشیرو
یان تەختەی ڕەش لە پۆلێکداو
یاخود ببی بە ڕۆژنامەی ئەستێرکێك و
یاخود ببی بە گۆڤاری گوڵ ئەستێرەی،
مەملەکەتی ڕاستی و جوانیی.

★

ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ کە ئەمبینیت
لە بەفری سەر بانیژەیەکی لادێمان سادەتر بووی.

له گوڵی دار چوالەی بەر نمەی باران و
له دەواری ڕەوەندێکی
بەر مانگەشەو ساکارتر بووی.
وەك تاوسە سیاسیەکان،
وەك تاوسە شاعیرەکان
نەئەڕۆیشتی و نەئەدوایت و
لەسەر سەکۆی ڕۆژنامەکان
جارێك خۆت گیف نەکردەوە
پەڕو باڵت نەکرد بە چەتری غوروورو
نەتوت منم دوا باڵندەی بەرزە فڕی
مەملەکەتی شیعرو پەخشان.
لەبەر هەتاوی ئارامدا
تۆ هەر گۆماوی بێدەنگ بووی
بەڵام وەختێ بەرد هاوێژان
بەردەکانیان تێئەگرتی
هەر بە شڵپەی بەرد لە ئاودا
هەر بە دەنگی نوقم بوونی بەرد لە ئاودا
ئەیانزانی و تێ ئەگەیشتن
تۆ چەند قووڵی و
تۆ چەند قووڵی!.
ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ.
ئێوارەیەکی غەریبیی، ئێوارەیەکی "برۆکسل"

**هەردووکمانی لەسەر مێزی قاوەخانەیەك دانابوو**

**خۆرئاوابوون دڵۆپ دڵۆپ دائەچۆڕێ و**

**قاوەخانەو خەمی ئێمە،**

**قاوەخانە لە گوڵدانی کریستاڵ و**

**خەمی ئێمەیش**

**لە دوو نێرگزی زیز ئەچوون.**

**لەو بەرەوە، زەردە ئەیدا،**

**لە جامخانەو،**

**لەویشەوە،**

**بۆ قژی تۆو**

**سەری منیش لەمبەرەوە**

**لە سەبەتەی سێبەرێکدا بەجێمابوو.**

**هەردوو دەستت خستبووە سەر کەمەی گۆچان**

**چاوەکانت بە پڕیشك و، هێشتا پشکۆی**

**نیوەڕۆی عومریان تیا مابوو.**

**لەگەڵ دەنگتا،**

**دەستەکانیشت هەر ئەدوان**

**مەراقی شاخ،**

**لەناو لۆچی پێستی ملت و دەم و چاوتا**

**ڕەشماڵێکی کۆچەر نەبوو**

**بووبوو بە کۆشکی تەمەن و بە ئێجگاری هەڵێدابوو.**

**کورسیی من کورسیی پرسیاری بە بزۆز بوو.**

**کورسیی تۆ کورسیی وەڵامی بە ئارام بوو.**
**برۆکسل بوو، ئەویش نەبوو.**
**پەیڤی سیحراویی دەم و دووت**
**لەناو هەورێکی سپیدا،**
**ئەیبردەمەوە بۆ دالآن و**
**بۆ قەیسەری و**
**بۆ ژێر چوخمی سیەکان و چلەکان و،**
**ئەیبردمەوە**
**بۆ ناو چەخماخەو برووسکەی**
**شەشی ئەیلولی بەرسەرا**
**لەودیو تەم و تراویلکەی عەدەمەوە،**
**سیماکان دەرئەکەوتنەوە:**
**بێکەس و نوکتەی سەرخۆشی**
**بێکەس و زڕەی زنجیری.**
**مەحمود جەودەت و**
**سێدارەی دەم بە خەندەی**
**بەناو قۆڵی کوڵەباڵدا**
**ئەچوومەوە بۆ هەورامان**
**بە سواری"کەرە لۆتی مەنووچەر"**
**ئەچوومەوە بۆ خاك و خۆڵ بۆ لای نالیی. لە گەڵتاندا**
**بە عەرەبانەی دوو ئەسپی سوار ئەبووم و**
**ئەچووینەوە بۆ گردەکەی مامەیارە**

**تۆ لە تەنیشت بێکەسەوەو**

**"ئەدمۆنز" لەوێ و**

**هەورێ بارانی ئەهێناو**

**شیعرێکیش بیست و حەوت ساڵە**

**گەڕانەوەی سووری قودسی بۆ شارەکەی.**

**سوجادی و جبەی درێژی و**

**فێستی سووری نیوە سپیی،**

**پڕ لە جووکەی وشەی کوردیی.**

**گۆران و بولبولی تازەی**

**گۆران و جوانی بێناوی و**

**هەڵۆبەگی بەر سەراکەی.**

**گەلاوێژو ورشەو پرشەی**

**ژێ کاف و یەکەم پڕیشکی دەم کوورەکەی.**

**چیرۆك و یەکەم پلیکەی..**

**هەر ئەدوایت و لە دووانتا هەموو دیاربوون.**

**بە تەنها هەر خۆت دیارنەبووی**

**تاوس نەبووی**

**تۆ ئەو کۆترە شینکەیە بووی**

**لە هەوای فیزدا نەئەفڕیت**

**تاوس نەبووی**

**ئێوارانیش لە بەردەمی کونە شاخدا،**

**ئەوەستایت و**

**تا دوا کۆتر نەچووبایە ناو کونەوە**

**تۆ نەئەچوویت.**

**تۆ تاوسی بایی نەبووی، ئەوەی نەتوت**

**باسکردنی هێلانەکەی سەری خۆت بوو.**

**باست نەکرد.**

**وەختێ هەستاین.**

**شەقامی شۆخی برۆکسل،**

**لەبەر بارانی ڕەنگاڵەی**

**هەزار تیشکا خۆی ئەگۆڕیو**

**لەو ساتەدا کراسی بێ قۆڵی شەوی**

**سنگ بەرەڵاڵی لەبەر ئەکرد.**

**وەختێ هەستاین.**

**بە پوولەکەی بیرەوەریو**

**فسفۆڕی یاد**

**من قژم ئەبریسکایەوەو**

**ئەتوت پلوسکی زەمانم و**

**مێژووم لێ ئەچۆڕایەوە.**

**تۆیش بە گۆچان**

**هەر بۆ ئەوەی دەست نەگرن**

**شوێن پیرێتی کەوتبوویت و**

**لاوازیت بەرگۆچان ئەداو**

**لەسەر ڕێتا دەرت ئەکرد.**

پیرێ لە بەهار.
کۆترێ لە گوڵ
قژێ لە زەردەو
پەیڤێ لە شیلەو
دووچاو لە پرشنگ.

دوای فڕینی ئەم مەراقەو
باڵگرتنی پەنجەکانم لەم ئاسمانە مسینەدا
وەختێتی هێواش ببمەوە.
وەك هێواش بوونەوەی ڕووبار
لە بەرایی پێدەشتێکدا
چون هێواش بوونەوەی باڵی
پەپوولەیەك
بەر لەوەی لەسەر نیگای گوڵ
باڵ جووت بکات.
وەختێتی هێواش ببمەوە
وەك هێواش بوونەوەی فرمێسك
لە چاوانی ئەم خاکەدا
کە ئەنفال هیچی تیا نەهێشت.
پێویستە هێواش ببمەوە
لە بەردەمی بێ بواری
دەریاچەکەی ئەم تەرمەدا.

له بەردەمی بە هەیبەتی
ئەم شاخە ڕاکشاوەدا
پێویستە هێواش ببمەوە
بەر لە گێرسانەوەی دواجار
لەسەر شەوگاری تابووتێ
کە ڕۆحم وا لە باوەشیا
وەنەوز ئەدا
وەختێتی ئیتر بێدەنگییم
ببێ بە جوانترین شیعرم.
وەختێتی ئیتر سپیاتی
پەڕە کاغەزی بەردەمم
ببن بە جوانترین نووسین.
وەختێتی تەپڵی بارانم
جێگە چۆڵکا بۆ کپ بوون و
بۆ خەوتنی هاژەکانم.
بەبێ خشپەی پێی قەڵەم و
جووڵەی دەستی بای خەیاڵم
هەڵئەسم و خەرمانەیەك
لە وێنە زۆر هێمنەکان
بۆ نموونە وەك:
"تریفە بە خەوتوویی.
بەفری گوندێکی پرسەدار.

تەنیایی ژووری عاشقێ
لە دوای کۆچڕەو
گیتارێکی بێ مۆسیقار.
ئێوارەی ڕۆژی شانزەی سێ"
هەموویان کۆئەکەمەوەو
ئەم پیاوەیان پێ ئەسپێرم
پیاوێ لە هەڵۆێست
"وەختێ هەڵۆێست ئەبێ بە شاخ"

پیاوێ لە شەپۆل
"وەختێ شەپۆل ئەبێ بە پەڕەی ڕۆژنامە"
پیاوێ لە وشە
"وەختێ وشە ئەبێ بە گوڵی گەنم و جۆ"
پیاوێ لە ڕەنگی سادەیی
"وەختێ سادەیی ئەبێ بە ئاوی کانیی"
لە دواییشدا پیاوێ لە دارسێو
وەختێ کە سێو،
ئەبێ بە ئەوینە لاسوورەی گشت وڵات و
هەموو ساڵێ بەشی هەمووومان ئەگرێت و
خۆشمان ئەوێ!.

سلێمانی
2000/5/6

## پێشەکەشە بە:

**شەفیقە سەعیدی وەستا حەسەنی وەستا محەمـەدی فاتمـە غـەزایی.. دایکـم ئـەو ژنـە پـیرۆزەی کـە بـۆ یەکـەمین جـار لـە شـەوە تاریـك و نووتەکەکانی ژیانی منداڵیـدا، جریوەکـانی خۆشەویـستی ژن و ئـازادی و پرشنگەکانی زمانی کوردیی و تۆوی ورەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی هـەموو زوڵم و دژوارییەك لە ڕۆحما چاند..**

**شێرکۆ بێکەس**

## وتەیەك

ئەم کۆمەڵە شیعرو پەخشانەی لە بەردەستاندایە، بەشی هەرە زۆریان دوابەدوای قەسیدەی "ڕەنگدان" نووسراون و هەندێکیشیان لە کاتی خۆیدا بڵاوکراونەتەوە. ناونیشانی دیوانەکە "خۆم.. ئەو وەختەی باڵندەم!" ناونیشانی کورتە شیعرێکە کە ئەبێتە تازەترین شیعری ئەم بەرهەمەیش. ئەوەی ڕاستیش بێ لەم کارە نوێیەمدا خوێنەر بە ئاسانی هەست بەوە ئەکات کە لە ئاوێنەکانی ئەمجارەدا هەست و نەست و مەراقە تایبەتیەکانی خۆم، بە کورتی دنیای ناوەوەو هەموو خەیاڵ و ڕوانینەکانم ڕوونترو ئاشکراتر دەرئەکەون. ئەشێ لەم ڕووەوە ئەمە دیارترین جیاوازی ئەم دیوانەو هەندێ لە دیوانەکانی ترم بێت.

لە ڕیزبەندی ناوەڕۆکی ئەم کتێبەشدا، وام بە چاك زانی دەقەکان بکەم بە سێ بەشەوە یان بیانخەمە سێ تەلانی جیاجیاوەو بەڵام بە هەموویان هەریەك باخ و هەواریان هەبێت:

یەکەم: کەژی شیعر: تایبەت بە شیعرە درێژەکان.

دووەم: باڵندە بچکۆلەکان: تایبەت بە کورتە شیعرەکان.

سێیەم: پێدەشتی پەخشان: تایبەت بە پەخشان و پەخشانە شیعرو پەیڤە شیعریەکان، کە من بۆ خۆم بۆ هەریەکێك لەم ژانرانە لێکدانەوەی تایبەتم هەیەو بەشێوەیەکی گشتیش ئەوەی شیعر لە پەخشانە شیعر جیائەکاتەوە. ئەو مۆسیقاو ئاهەنگەیە کە لە زمانی ئەویاندا هەیەو لەمیاندا کەمترە یان نییە. دڵنیایشم کە خوێنەر ئەگەر بە سەلیقەی خۆیشی بێت لەوەختی خوێندنەوەدا هەست بەم جیاوازیانە ئەکات. ئەمە لەکاتێکدا، مانای ئەوە نییە لە نرخی ئەفراندنی پەخشانە شیعر کەم بکەینەوە. چونکە هەرگیز ئیبداع و داهێنان تاقەماڵێکیان نەبووە.

**شێرکۆ بێکەس**
**سلێمانی** 2002/2/27

# له ڕاڕەوە نسرمەکانی لەشدا

له ناكاوێ"با"يەك به غار
هات و بەلامدا تێپەڕی و.. له ناكاوێ
هەر دوو زنەی خوار تەوێڵمی
پڕكرد له گەردی تەپ و تۆز..
لێلاّييەك له بنەوە..
شلوێ بوونێك له ڕۆشنايی سەرچاوەوە
هەورێ له خۆڵ
دەشتێ غوبار
لێلاّييەك بەرە بەرە هات و كشاو
هات و خزاو، خۆی لێدام و
پەرت پەرتی كرد تەماشام و
سێبەری خستە سەرچاوم!
لاسكی سەرنجدانی بڕيم
تەماشامی كورت كردەوە
وەك ڕوانينی كورتەبالاّی
ئێوارانی پشت له زەردەی

بەر کەوێڵێك!

لێلاٌییەك

وەك سەرەتای ئەنگۆرەیەك

بەر لە باوێشکدانی شەو و.

یان تەم و مژی کەناری

زیندە خەوێك.تارماییەك

وەك دەرکەوتنی کلۆیەك

لە خەڵووزی تاریکایی

یان تیلماسکێ لە ڕەشایی شیوەنی چەم

یان خاوبوونەوەی توێژاڵێ لە مەراقی قەلەڕەشکە و،

پەڵەیەك خەم

کەوتە بەرایی ئاسۆم و

ناو سپێنەی دیدەکانم!.

شلوێ بوونێ

هەڵمێکی تەنك لە زاری بوولێڵەوە

وەك تەیرێکی ئەفسانەیی هاتەدەرێ و

باڵندەی شووم لەپڕ باڵی

خۆڵەمێشاویی جولاٌن و حەوز لیخن بوو

خۆی دیار نەماو تراویلکە

لە هەتەرێکی دوورەوە

هەنگاو هەنگاو نزیك بۆوە

بە ئەسپایی هەر لەناو تەپ و تۆزەوە

بە ئەژنۆکانما هەڵگەڕاو
تا نێوچاوم هاتە سەریێ!.

★

تۆیش هەر ئەوکاتە پەیدا بوویت
تۆیش ئەو ساتە لەگەڵ گەردوو
لەگەڵ هەڵم و لەگەڵ تەمدا
هاتیتە نێو چاوانمەوە! بۆ پەیدابوویت؟!
وەختێ هاتیت
کە من چاوم لە وردەکاری جوانیت و
لە تاڵەمووی ناو خەیاڵت و
لە پیتە زۆر وردەکانی
عەشقت نەبێ..
وەختێ هاتیت
کە من چاوم لە تان و پۆی ڕەنگەکانی
پێکەنین و لە دەزوولەی زۆر باریکی
ئاماژەکانی نیگات و کە من چاوم
لە هات و چۆی وردە شەپۆلی ناولەشت و
لە تاڵەمووی بەجێماوی قژت نەبێ!.

★

ئەمێستا دێیت؟!
ئەمێستا تۆ ئەگەیت گوڵێ؟!
درەنگانە

**درەنگانی تەنیاییمە**

**درەنگانی چاوم.. گوڵێ!**

**درەنگانی ڕووناکیمە**

**لەم ڕاڕەوە نسرمانەی لەشدا.. گوڵێ!**

**پرتەپرتی چرایەکە**

**لە شەوێکی بێوەژندا و**

**لەبەر هەیوانێکی چۆڵدا و**

**لەبەر هەوایەکی ساردا.. گوڵێ!**

**من ئاوی چاومت ئەدەمێ!**

**بەڵام گوڵێ! ئەم سەفەرە خۆڵاوییەی**

**ناو گەردەلوول، ئەم تەماشا خۆڵاوییە و**

**ئەم لیخن بوونی سەرنجەو ئەم پرتەپرتی**

**چرایە لەبەر باگژەی عومردا، قەدەرێکەو**

**سەفەرێکە و سەرابێکە و ئەبێ هەربێ.. ئاخر**

**گوڵێ ئەبێ هەر بێ!**

**من ئاوی چاومت ئەدەمێ!**

**بەڵام گوڵێ!. ئەم چوونە ناو تراویلکە و غوبارەوە،**

**ئەم کۆچە خۆڵەمێشییەی قاقری لەش، خۆ هەڵکێشان**

**لە تەمتوومان، وەرینی پەڕ، وەرینی ڕۆژ، وەرینی**

**چاو، کزەکزی باپووسکەکەی ناو ڕاڕەوی بیرەوەریی،**

**کاڵبوونەوەی ڕەنگی خوێن و زەرد هەڵگەڕانی**

**ئاوێنە و فەسڵی خەزانی دەم و چاو،**

چاڵ و چۆڵی هەناسەکان،ماندووبوونی
خولیاکان و مۆسیقایەکی هێواش و هەناسەبڕکێی گەلاکان،
ئەبێ هەر بێت، ئاخر گوڵێ ئەبێ هەر بێت!
ئاخر گوڵێ ئەم سەفەرە ئەبێ بکرێت!
ئەبێ خاوبێتەوە تیشك و ساردبێتەوە ئاگردان و
ورە وری خۆڵەمێشیش دەست پێبکاو لەرزە لەرزی
دەست و پەنجەیش ژوورکاو خوارکاو تەم و مژیش سەر
داگرێ، کورسی ببێتە هاوسەرو، چەند تابلۆیەك
بە منداڵ و بە فەرزەندو، باران بڕان.. ئاخرین جار
باران بڕان لە ئاسمانێکی تەڵخدا هەر ئەبێ بێت!
دیسانەوە لە دوا وەرزەکانی لەشدا، لە کەلێکی
وەڕسەوە، لە دەلاقەی تەمەنێکی قرچۆکەوە، دوا
پایزیش ئەبێ سەر بێنێتە دەرێ و دوا ڕۆژباش و
دوا شەوباشمان لێبکات و بەلام بەجێشمان نەهێڵێ،
تا لەگەڵ خۆیدا ئەمانبات بۆ ئەودیوی شاری خەون و
بۆناو ئەفسانەو نەهێنی مەملەکەتێ. ئاخر گوڵێ ئەو
نادیارە هەر ئەبێ بێ. لە دوا زستانی لەشیشدا،
خامۆش بوون و کزبوون بەدیار سووتانێکی هێواشەوە،
بە دەم توانەوەی جەستەوە وردە وردە تا ئەگاتە سەر
بنە مۆم. هەر ئەبێ بێت. چاوبڕینە نوختەی نادیار،
خۆهەڵواسینی خەیاڵە سیسەکانمان بە تەنافی ڕابوردوودا،
هێدی هێدی، ڕۆچوون ڕۆچوون و نوقمبوون

بەناو شەوگاری لیخندا هەر ئەبێ بێت.
ئەم سەفەرە ئەبێ بکرێت!
تا هەڵسانی میوانەکان، چۆڵبوونی ماڵ،
زرنگانەوەی بێدەنگیی، مانەوەی تاق و تەنیای خۆم
هەر ئەبێ بێت!. هەر دانیشتن و دانیشتن بە یەکەوە خۆم و
ئەندێشە چڕەکان. بیرچوونەوەی زۆر لق و پۆپ. هەر
دانیشتن و دانیشتن لە پەنایەکی نسرماو ناو بەناوێ
میاواندنی پشیلەیەك لەژێر مێزداو یان هەڵچوونی
کتلیەك و یاخود خشەی ڕۆژنامەیەك،
کە گلەیی نەخوێندنەوەم لێبکات و،
گڤەگڤی ڕەشەبایەکی ترسناك لە دەرەوە،
وەك پێم بڵێ: تۆ دانیشەو سەفەر خۆی دێ!. لەودیو
شووشەی چلکنەوە سەرلەقاندنی درەختێ، هەرئەبێ
بێ هەر خۆم و خۆم. خۆم و خەیاڵە ساردەکان.
خۆم و بازنەی دووکەڵ و خۆم و مەراقی لاکێشی
ژوورەکەم و پەنجەرەیەکی چوارگۆشەی سەر حەوشەی
چۆڵ و.. لە دوور قیڕەی قەلەڕەشێ
هەر ئەبێ بێ..
ئاخر گوڵێ
خۆت سیس مەکە
ئاخر چاوم..

گومان لەم قەدەرە ناکرێو

هەر ئەبێ بێ!

سلێمانی
2002/2/25

# دایكم.. لەوێ
# لە پشت ئۆقیانووسەكانەوە!

لەم مێژووە ساردەدا.. دایە!
لەم زەمانە بەفرینەدا
كۆچی دوور بۆ؟!
سەفەری ون و نادیارتر لە چارەنووسی پووشێكی
دەم گژە باو.. سەفەری وێڵتر لە تۆوی
پەراگەندەو لە كشانی ئەستێرەكان.. بۆ؟!
لەم زەمانە خەم ساردەدا.. لەم
زەمهەریری كۆچەدا.. جێهێشتنی خۆرەتاوە
هەژارەكەی گردی یارە و ئاسكەكانی كانێسكان و
بزربوونی دەنگی گۆیژە و.. تەماوی بوونی نەینۆكی
چاوەكانت و ئینجا گریانی خەیاڵت لەودیو ئۆقیانووسەوە بۆ؟!
ئا لەم مێژووە خەم ساردەدا..
كە تەنیایی و سەری لەرزۆك و وڕێنەت
لە سوچێكی یادگاردا كزكز بەدیار

مۆمێكی سپیی بێكەس و
شەوق لەرزیوەوە بگری..
بۆ؟ دایە بۆ؟!
بەفرەو كلوو لە گینگڵی سەمادایەو
كات تەزیوەو ژوورم لە تەختەی سەر ئاو و
چاوم لە بڵقی كەفێكی لێڵ و پێڵ و
هەستم لە شەختەی شكاوی زەریاكان و،
عومرم لە نزیكبوونەوەی پەپولەیەك
لە بڵێسەو لەشم لە پەیكەری لم و
خەونەكانیش لە دەزوولەی پچڕاو ئەچن..
ئەم كۆچە بۆ؟
خەوێكی كورت كورتمان هەیەو بەندەری دنیایش
درێژو هاژەهاژی ملیۆن ساڵەی هێشتا
گەنج و هێشتا ڤیت و گوڕی داوێن دێت و ئەچێ..
جەستەی ئێمەیش ئاگردانێكی كوژاوە و چاومان
ئاسۆی هەڵماوییە خەیاڵ بەلەمی شكاو و
ڕەنگ گەڵا گەڵا ئەوەرێ.. ڕووكردنە ئەودیو
ئۆقیانوس، ئەودیو نادیار، ئەودیو
ونبوون.. بۆ دایە! بۆ؟!
لەبەر پەنجەرەیەكی دڵتەنگ و ڕوو لە
هەندێ داری پەست و وەڕس،
لە موبەقێكی باریكدا وەك تیتڕواسكێ

**باڵ زامدار دێیت و ئەچی و ئەوەستیت و**

**شووشە بەندی سەر باڵقۆنی**

**بە حاڵ زەردەخەنە گرتوو.. ئەکەیتەوەو..**

**ئەڕوانیتە هەندێ سمۆرەی بزێوی خوارەوەی**

**ناو کلۆری پیرە درەخت و گوێ لە زیقەی**

**هەندێ تەیری تیژ تێپەڕی ئاسمانێکی مسین**

**ئەگری و سەری سەتڵی ترشیاتەکەت**

**ئەکەیتەوە و بە حاڵ تامێکی ئەکەیت و**

**سەرمای دەم تیژ ڕاوت ئەنێ و ئەبیت بە مەراقێك کوڕو**

**دێیتەوە ناو موبەقەکە... فەقیانەکانت هەڵئەکەی**

**ئەمجارەیان ئەچیتە بەر بۆری ئاوێکی زۆرهارو**

**حاجەت ئەشۆی، خەیاڵ ئەشۆی، خەم ئەشۆیت و**

**ساڵ ئەشۆیت و نابڕێتەوە. دێیتەوە بەر سەلاجەکە،**

**ئەیکەیتەوە و دایئەخەیت و مەراقی بەستوو وەك گۆشتی**

**ناو فرێزەر دەرئەهێنی و ئەیکەیتەوە و دیسانەوە**

**خەمی تازە زەرف زەرف ئەخەیتەوە ناو فرێزەر!**

**کۆچی دوور بۆ؟!**

**بازنەیەکەو هەموو ڕۆژ تیا خول ئەخۆی.**

**بازنەیەکە لە سەهۆڵ، بازنەیەکە لە دووکەڵ،**

**بازنەیەکە لە ژانی پلاستیکی و تیا خول ئەخۆی!**

**کۆچی دوور بۆ؟! سەفەری ناو زەریای درۆ**

**سواربوونی مەوجی لاسارو تووناو توونی تەمتومانی**

ناو قاڵبی کۆنکرێت و هەناسەدان لەناو هەوایەکی
ڕەشداو، ڕۆژ ژمێری چۆڵ و هۆڵی، ئەو
عومرە بۆ؟! کۆچی دوور بۆ؟! ئاخاوتن هەر
لەگەڵ خۆتدا، لەگەڵ لکی فەقیانەداو،
لەگەڵ ترشیاتی باڵقۆنداو لەگەڵ چزە چزی تاوەو،
لەگەڵ قرچە قرچی ناو هەناودا بۆ؟! بۆ؟!
لەم جیهانە خەم ساردەدا
لەم زەمانە پەرت پەرتەدا
ئەم کۆچە بۆ؟
لە پشت ئۆقیانووسەوە تۆ
لە داربییەکی بزری ناو تەم و مژ ئەچیت.. دایە!
لە مەلێکی کز هەڵنیشتووی پایزانەی وەختی مەغریب!
لە گوڵدانێکی بێ تاقەت.. لە چیرۆکێکی بێگوێگر..
ئەم کۆچە خۆڵەمێشیەو
ئەم سەفەری فرمێسکانەو
خەوزڕانی ئەستێرە بۆ؟
تۆ لەودیو ئۆقیانووسەوە
لە شەپۆلێکی زۆر ماندووی بەستێن ئەچی
وەختی داچوون!
هاوڕێی تۆ! ئێستا لەوێ
هەندێ درەختی بێزارو
هەندێ سمۆرەی کلك زەردی فرجینیاو

**هەندێ تەیری لانەوازو..**

**هەندێ ڕێبواری سەرجادەی چۆڵ و هۆڵ و**

**هەندێ پەنجەرە ماڵانن**

**ئەم سەفەرە لەگەڵ کرێوەی تەمەندا..**

**ئەم کۆچی سەر بەستەڵەکەو**

**لە ناو ئەم خەوە کورتەدا**

**ئەم سەفەرە درێژە بۆ؟!**

**دێیتەوە بەر پەنجەرەکە.. ئەچیتەوە سەر باڵقۆنە**

**پچوکەکەو تەماشات ئاوی شلوێیەو چاوت لێیە**

**ڕەشەبایەك هەورێکی دوور چنگ لەسەرشان**

**ڕاوئەنێت و وژەوژێك لە دەروونی دارەکان و**

**لە دەروونی خۆیشتەوە دێت. تاوێك باران**

**لەدەرەوە لەگەڵ تاوێ فرمێسك لە ناوەوە لەناو**

**سەرتا بەیەکەوە دائەکەن و ئەو پووشی**

**زەرد تەڕ ئەکات و ئەمیش گوڵی**

**لارە ملی سەر کراسە کوردیەکەت و.. لە سەرەوە**

**بۆ خوارەوە شەپقەو پێڵاوی**

**دوو ڕێبوار ئەبینیت و گوێت لێیانەو تێ ناگەیت و**

**دیسانەوە لە کلۆری پیرەداردا سمۆرەکان**

**بەدی ئەکەیت، چەند گوێزێکیان بۆ هەڵئەدەیت**

**گوێزەکان خلۆر ئەبنەوەو هەرهەمان سات**

**تۆیش بەلکی فەقیانەکەت چەند دڵۆپێکی خلۆری**

سەر ڕوومەتە قوپاوەکەت ئەسڕێت و دێیتەوە بەر
سەلاجەکەو ئەیکەتەوەو دایئەخەیت و،
وەك پیرە دارەکەی خوارێ لەبەردەمی گژەبادا
ماندوو ئەبی و، ئەوسا لەسەر کورسیەکەی خۆت
دائەنیشی و زەڕەبینێکی چاو گەورەی کلك درێژ
بەدەستەوە و... دیسانەوە لە نووکەوە.. یەکە
یەکە سەیری هەموو وێنەکانی ناو پیرە ئەلبوومت
ئەکەیتەوە، سەیری کوڕو کچی دوورو، سەیری شاری
گەلێ دوورو، سەیری کچەزاو کوڕەزاو، بووکەکان و،
سەیری بەختی لەئاوێنەی شکاو چووت و.. دڵۆپ
دڵۆپ سەیری ڕەوتینی باڵات و ڕووتانەوەی پەڕو باڵت و
هەڵوەرینی سەعاتەکانی ڕۆژانت و وردو خاش بوونی
خەرمانەی بەر پێت ئەکەیت.. ئەلبوومەکە فڕێ ئەدەی.
ئەمجارەیان نەخۆشیەکانت بە پەنجە ئەژمێریت و بەیەکەوە
ئازار و حەب و یادگار ئەبەیتە ناو پێخەفەوە..
لە پڕێکدا ئیتر پێڵووت
وەك باڵی شلی پەپوولە ئەنیشێت و
ئازار بۆ ماوەیەك ئەنوێ‌و
ئینجا خۆیشت وەنەوزێك و خەوێك دێت و
زەردەخەنەیەك ئەچێتە ناو سپێنەی ئەو خەوەو
لەگەڵ هەورێکی هێمنی سەر زەریادا
ئەگەڕێیتەوە بۆ لامان!

لەم زەمانە خەم ساردەدا

لەم زەمانە بەفرینەدا دایە!

کۆچی دوور بۆ؟! سەفەری ئاوی ئاموون و

سواربوونی مەوجی دڕندەو دەمکردنەوەی قرشەکان و

باهۆزێکی شێت و وێت و، بەلەمێکی بێ چارۆگەی

ئەم سەفەرەو قسەکردنی خۆت و خۆت،

خۆت و موبەق، خۆ تو سمۆرەو پەنجەرەو

خەوبینین لەناو ئەلبوومداو خەوبینین لەناو

سەهۆڵداو چاوەڕوانیی لەناو جانتایەکی قوڵداو،

هەناسەدان لەناو لوولەی کۆنکرێتدا..

تاکوو کەی بۆ؟!

لەم مێژووە ساردەدا دایە!

لەم زەمانە بەفرینەدا دایە!

کۆچی دوور بۆ؟!

سلێمانی
2002/2/15

# چاو لە ڕێی ڕۆژهەڵات

**لە زمان ژوورەکەی تەنیایی و**

**قەسیدەی وەسواسی شەوەوە**

**باڵندەی خەو ئەڵێ..**

**لە زمان زەمانی سەراب و**

**سەعاتی نادیاری کۆچەوە**

**پۆستەچی شپرزەی"با" ئەڵێ..**

**لە زمان شەبەنگی ڕەنگەوە.. ئەنگۆرەی بێوازی خۆرنشین،**

**هات و چۆی گومان و.. هێڵ هێڵی وەرزەکەی لەیەکتر دابڕان،**

**سێبەرو بۆشایی و خاڵ خاڵی زەرد ئەڵێن..**

**لە  زمان تارمایی شوێنەوە..**

**درەختی شەکەتی چاو لەڕێی و تەماشا تەماویی و،**

**گردۆڵکەی چوار مشقی دانیشتوو لە دەشتدا و**

**بەرد ئەڵێن:**

**ئەڵێن دێت**

**بە خۆی و باوەشێ پەپوولەو خەمەوە ئەڵێن دێت..**

چون داری بەلاڵوك خۆی ئاڵ ئاڵ
پەپوولە قەترانیی و
خەم سپیی و
ئەو جەستەی یەك فەسڵە و
هەمان كات چەند فەسڵ ئەنوێنێ!..
لە پڕێك هەلاڵە بارانە لە مێرگی  ناو قژیا و
لەپڕێك كانییەك پەپوولە پاییزە
لە سنگیا هەڵئەقوڵێ و
لە پڕیش پەیكەرە زوقمێكی كەژانە و
تەنیایە و بێكەسە و ئەیبەستێ!
ئەڵێن دێت
وەك كلووی ئەو بەفرەی
كزەبا بۆ سەمای توانەوەی
بەر شەوقی پەنجەرەی دڵدارێ ئەیهێنێ.
ئەیبینم: چەند لێی دێ بە شەوی مانگە شەو
گوڵاڵ و خەزان و بەفرانبار پێكەوە ئەپۆشێ.
ئەڵێن دێت..
وەك ئەوین لەپڕدا ئەگات و
پێش ئێرەیش، بگاتە هەر شوێنێ
ئەو وەختەی كە هەستا
لە دوای خۆی زنەیەك لە ئاوی پەمەیی
ڕووناك و دوو تەڵیش لە گوڵی ڕەشپۆشی

بەهارە بۆ عەشقی غەریبان جێدێڵێ.
ئەڵێن دێت..
بە دزیی سەعات و وەختەوە
خۆی ئەکات  بەشوێندا و بەماڵدا و
بەدزیی ڕۆژەوە
خۆی ئەکات بە شەودا و
بەدزیی ڕەقیب و مەرزەوە
هەڵئەفڕێو ناهێڵێ چاوی پیس
لەسیلەی جوانیدا بەدییکاو ناهێڵێ
ئاوی ڕەش بیبینێ!
ئەڵێن دێت..
گەر ڕێگەی ڕۆژهەلأت ئاقاری
سەفەری پاییزەی عەشقی بێ و
بەتەنیشت کڵووکۆی وەفایی و
کڵپەکەی حەزرەتی"حەریق"دا تێپەڕێ..
ئەزانم بۆ ساتێ لائەداو ئەوەستێ و
لە پەلکی گوڵ هێرۆی بالأکەی شیرینی تەشی ڕێس
تاجیکێ لەپەڕەی حەسرەتی گەشاوەو،
لە لرفەی سووتانی حەریقیش،
ڕووناکیی قەسیدەی زامدارم بۆ دێنێ!.
گەر ڕێگەی ڕۆژهەلأت
ئاقاری سەفەری شینی بێ
دڵنیام لە بنار"زاوا- بووك" لائەداو لەوێدا،

ئەو چەتری وەنەوشەی بووکێکی ناکام و یان چۆغەی
خوێناویی زاوایەك هەڵئەداو، بۆ تاوێك سەر خەوێك
لەشیعری فێنکی کەپرەکەی"هێمن"دا ئەشکێنێ و
لە خەوی شینیشدا"سوارە"یەك، ئێلخانی،
بەجلی عەشقەوە، سوورمەچن، ڕاکشاو، لەکەنار
ئاوێکی سەوزەڵەی غەمگیندا ئەبینێ!.
گەر ئاقار شارەکەی
مەستوورە و ژیللابێ و
لەوێوە سەری خۆ هەڵگرن شەمان و
مامزو.. لەوێوە زریکەی مەعشوقان
لە شوورەی شمشێری میرانی ئەردەڵان هەڵبێن و
چرای مەم هەڵکەن و
ئەو ناوە بکەنە چراخان..
دڵنیام لەپێشدا ئەچێتە سەرسەری"ئاویەر"
ئەوساکە لە تەختی ترۆپکدا
دەس لەمل هەورێکی نزمدا..
ڕامووسان لە سەمای ئەبەدیی
ئەوین و سروشتدا.. ڕامووسان
لەنێوان بەیانی و ئێوارە و.. گوناه و پاکژی و
دۆزەخ و بەهەشتدا.. ڕووئەدا
بەڕووتیی ئاوێنەی لەشی خۆی
بەرامبەر خۆرئاوام ڕائەگرێ و
ئەمبینێ و ئەیبینم..
تا ئەبێ بە کلووی ناو شیعر و

**یان تەرزەی پەخشان و**
**یان گوڵی بەر باران!**
**ئەڵێن دێت.. من ئێستا بەردەمی پەنجەرەم گرتووە**
**نەباران قسەیەك ئەكات و نەكلو وشەیەك**
**ئەنووسێ و نەهەوا چرپەیەك بەگوێم دا ئەكات و**
**نە ڕێگەی ڕۆژهەڵات لەبەر تەم ئەبینم!**
**تەنیاییم وەك شووشەی چاویلكەم هەڵماوی و**
**ژوورەكەم وا ئەنوێ و.. خودایە! ئەو كەی دێت؟!**

سلێمانی
2002/2/4

# دوورپیانەکان

(1)

له سەرڕا گڤەیەك هات و بە زۆر گوڵە باخێكی
ڕووت و فووت كردەوە. لە ژێڵلاّوە تەم مژێك گەیشت و
بە زۆر چارشێوێكی بە جۆگەیەك پۆشی. لەلای
ڕاستەوە مقەستێك هات و بە زۆر سەری
قەسیدەیەكی گرت و پرچەكانی بڕیی. لەلای چەپیشەوە
دووكەڵێك گەیشت و بە زۆر نامەیەكی پەشیمانیی بە
سامالّێ نووسیی!، بەلاّم ئەوەی نە بە زۆری گڤە و
نە بە زۆری تەم و مژو نە بە زۆری مقەست و دووكەڵیش
دروست نەكرا، خۆشەویستیی بوو!.

(2)

تۆ لەو سەرەوە بە تەنیا ئەڕوانیت و لە مانگە شەوێكی
زیوین ئەچیت و منیش لەم خوارەوە بە تەنیاو لە
گۆمێكی خۆڵەمێشیی غەمگین. تۆ لەو سەرەوە
لە هەورێكی نزمی پێش بارین ئەچیت و منیش لەم

خوارەوە لە دار لیمۆیەکی بێ ئارامی چاوەڕێی بارین.
مانگ لە سەفەردایە و هەور کۆچ ئەکاو لێرە نامێنێ و
دار لیمۆ لە خاکداو.. دار لیمۆ منم و ناگەمە مانگ و
ناگەمە هەوری چاوشین!.

(3)

هەر بە نامەکەی دوێنێتا، چرایەکت بۆ ناردبووم بچکۆلانە.
منی تاریك کە هەڵمکرد، لە ئاوێنەی بەرامبەرما،
خۆم بینیەوە مێژوویەکم لە تارمایی ئەو پیاوانەی
چرایان گوشت لەناو ژندا. هەر بۆ ئەوەی: نە پەپوولەو
نە پەروانەیەك نەمێنێ بە دەوری عەشقا خول بخوا و،
لە دواییشدا ڕیشەکان و چەقۆکان و پەڵە خوێنی سەر دەستی
پیاو لە ئاوێنەی بەرامبەردا بزربکا!.

(4)

تاقە شەوێك بوو، کەچی بوو بە کۆی هەموو شەوەکانم
(ئەو زەمان و من عاشقێ). تاقە خەمێك بوو کەچی
بوو بە کۆی هەموو خەمەکانم. (ئەو ئیشراق و من
خەڵوەتێ)، یەك وشە بوو لە پڕدا بوو بە فەرهەنگێ.
(ئەو دەریاچەو من بەلەمێ). یەك پزیزك بوو،
لە پرێکدا بوو بە گڕێ. (ئەو چاوگ و من پەنگرێ).
یەك بنچك بو، لە پرێکدا بوو بە کەژێ.
(ئەو شیعرستان و من مەلێ)

(5)

تاقە بولبولێك ئەتوانێ، دارستانێ چەند گەورەیش بێ،
وایلێبکا گوێی بۆ بگرێ. تاقە قەڵەمێك ئەتوانێ
لە کاغەزی  سەر مێزێکدا، چیرۆکێ بکا بە زەریاو،
ئیتر زەریایش لەگەڵ خۆیدا، چاوی جیهان و خوێنەرو
باڵندەکان هەمووی بەرێ. برووسکەیەکیش ئەتوانێ،
بەیەك چرکە، پەردە لەسەر تاریکایی، هەزاران ساڵە
لابەرێ. تەنها ژنێکیش ئەتوانێ، وەك ئەو ژنەی
خۆشم ئەوێ، واملێبکا وەکو ئێستا، وشەم بکا
بە بولبول و، ناخم زەریا و خولیاکانم بە برووسکە و،
تا هەتایە ئەوینیشم تێدا نەمرێ!

(6)

تۆ لەگەڵ شەودا هاتبوویت. بە کلیلێك، دەرگاکەمت،
کردبۆوە. بە چرایەك، ژوورت ڕووناك کردبۆوە.
بە گوڵاوێك، جێگەمت بۆنخۆش کردبوو. بەڵام
ئاخر، ئەو کلیلە، دەرگای هەستی نەکردمەوە.
ئەو چرایە، خەمی ڕووناك نەکردمەوە. ئەو گوڵاوە،
بێزاریی بۆنخۆش نەکردم. هێشتا هەر لە ڕۆحما
شەوەو، هێشتا هەر ڕۆژ نەبۆتەوە!.

(7)

بەیانیت باش! بارانەکەم! ئەمڕۆ وشك و لارەمل و
دارسێوێکی بێ تاقەتم، ئەرێ نایەیت تۆزێ بەسەرما
بباری و ئەم وەڕسبوونەم ئاوبدەی؟! بەیانیت باش
هەتاوەکەم!. ئەمڕۆ ڕۆحم سەرمایەتی و داربییەکی
کزۆڵەم و هەڵئەلەرزم، ئەرێ نایەیت، لەو بەرەوە
هەر بۆ ساتێ چاوەکانتم نیشانبدەی؟!. بەیانیت باش
فەرهەنگەکەم!. ئەمڕۆ زمانم بەستراوە و خەیاڵ دەرگای
پێوەداوە و شیعریشم لە بیرچۆتەوە!. ئەرێ نایەیت،
توخوا نایەیت، بۆ تەنیاییم تۆزێ بدوێی، دەنگ و
ڕەنگم بوروژێنی و، بەشکو منیش لای خۆمەوە،
وەك جوانیت و دەم و لێوو پێکەنینت، جارێکی دی،
بە قوڵەقوڵ هەڵقوڵێم و بۆ ساڵی نوێ و بۆ شیعری نوێ
وەك ساماڵی دەم و چاوت بکرێمەوە!.

سلێمانی

کۆتایی ساڵی 2001

# بۆ یانزە تابلۆی
# هونەرمەند نامیق عەلی قادر

(1)

شەپۆلانی ئەفسانەیە؟
یا ڕێگەیەك
لە جەستەی زریان و کافوور!
مەرگە ئەڕوا؟
یان ژیانە دائەگیرسێ و
بووە بە خەونێکی دەیجوور؟!

(2)

باڵندەیەك لە شەوگارو
مرۆڤ لە بەردی سەرسامیی و
تەماشام پرسیارو
وەڵامیش بزرە!

(3)

شیعرم لە خەویا تۆ وا ئەبینێ:
بێداربوونەوەم بێ ڕەنگم ئەکاو
من ئەوەرێنێ!

(4)

لە تەنیاییدا
سەرنج نادیارێ ئەخوێنێتەوە
پڕە لە جادوو
بورجی عەشق مانگەو
ستارە وشەو
نامۆییش ئێمە ئەنووسێتەوە!

(5)

کە پوورە وشە بوروژێ
شەوی مانا بێ کەنارەو
وێنە ئەفڕێو
لێکدانەوەیش بێ سنوورە!

(6)

چەند سەدە لە پەڕۆ.
چەند سەدە لە کوێریی
چەند سەدە لە سەری بێ باران

ئایا تۆیش هەر منی؟!
ئەمبینی؟!

(7)
ئەگەر بدوێم
ئەم دەم و چاوە کۆچ ئەکا و
ئەمجارەیان ئەبمە بەفر و
سپیی ئەدوێم!

(8)
لەبەر پەنجەرەی خەمێکدا لە خوارەوە
هەر نەورەسە و شیعر ئەنووسێ و تۆ نایبینی.
لەبەر ڕێژنەی بارانی ڕووناکیدا لە سەرەوە
هەر ئازارە و باڵ ئەگرێت و تۆ نایبینی.

(9)
خۆر لە جۆلانەی مانگدایە و
"با"یەکی ڕەش ڕایئەژەنێ.
چرپەی ئەوین لە دەنووکی دوو مەلدایە و
گوێ مەمکێکیش لەسەر دارێ پێ ئەکەنێ.
نیوەم تەیری داستانێکە و
نیوەم عەشتار
من هەندێ جار

ئەبم بە گوڵی باڵدارو
جاری تریش بە زێ و ڕووبار!

(10)

کە عەشق شمشاڵ مەست ئەکا
ئیتر پەپوولە بارانێ دەست پێ ئەکا و
کەس نازانێ چ وەختێ خۆش ئەکاتەوە؟!.

(11)

مانگی مارت ئەکوژرێ و
درەختێ نامێنێ شایەتیم بۆ بدات!
پەل و پۆی ئەم خوێن و تاوانە
هێند درێژ.. هێند چڕە
سەرێکی ئەوەتا لە قوببەی خواوەنداو
ئەویتر لە شاری بزردا
دەریاچەی ئاگرە!

2002/1/15

# مەحاڵ

"بۆ هەموو ئەو کەڵە پیاوانەی کە لە شەڕی
دژی شەوەزەنگ و تیرۆریستاندا بوونە چرای قوربانیی!"

پێیان بڵێن:
ڕووناکییەك لێرە ئەژی
ژوورەکانی لە"چاو" دایە و
پەنجەرەکانی لە"سەر"دا و
باخچەکانی لە ڕۆحماندا و
شەقامەکانی لە دەستی هەمووماندا!
پێیان بڵێن:
ئازادییەك لێرە ئەژی
شەلاڵی گوڵ و منداڵە و
ڕەنگاڵەی ژن و ڕووبارە و
پڕە لە نمەی زیوین و
گمەی سپی!
پێیان بڵێن:
بۆ سبەینێش کەژاوەیەك بەڕێوەیە:
پڕە لە شیعری نارنجیی و

پڕە لە نۆتەو لە تەرزە و
بەژنی لە بەژنی کەژانەو
قژی لە ئاوی پەمەیی!
پێیان بڵێن:
تا گەیشتووینە ئەم مێرگە و
لای پرچی کاڵی"حەبیبە"و
بەردەم نارەوەنی"نالیی"
بە ڕێگەوە
هەزار هەزار کانیمان لێکوژرا و
بە ڕێگەوە
هەزار هەزار گۆرانیمان ڕەقبوونەوەو
هەزار هەزار ئەستێرەمان وردوخاش بوون!
پێیان بڵێن:
تا گەیشتووینە ئەم شارە و
بەردەم شەقامەکەی"قودسی"و
لای چراکەی"ئەمین زەکی"
مەنزڵ.. مەنزڵ
ساڵانمان کردۆتە کۆڵ و
مەنزڵ.. مەنزڵ
مانگەشەومان لە بریندا هەڵکردوە و
مەنزڵ.. مەنزڵ.. ئەشکەنجەمان ڕاژەندوە و
لەمسەرەوە

قۆناغ.. قۆناغ، بووین بە هەڵم و
لەوسەرەوە
پەڕە.. پەڕە، گوڵاڵەمان باراندوە!.
پێیان بڵێن:
بە شەمشەمەی"زوڵومات" و
بە کوندە پەپووی ڕیشن و
بە داڵەکانی"بن لادن".. پێیان بڵێن:
وەك مەحاڵی گەڕانەوەی
دەم و چاوی ڕۆژژمێری
ئەمساڵ بۆ پار..
چون مەحاڵی گەڕانەوەی
زرنگەی زەنگ بۆ ناو"زەنگ" و
گەڵای وەریو بۆ لقی دار
یان مەحاڵی گەڕانەوەی
گڵۆپی سەری ئەدیسۆن،
بۆ ناو ئەقڵێکی تارو مار
ئەم ڕووباری بەر هەتاوەی دەنگی ئێمە و
ڕەنگی ئێمەیش
حیلەی ئاوی ئەم چرکەیەیش
جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ گەرووی
زەمانێکی لەوەوبەری ڕۆخ و کەنار
دەنگ هەڵئەبڕم:

**هەمووتان وەرنە دەرەوە و**

**ماڵ جێبێڵن و ڕوویشبکەنە**

**گوڵ پەمووی ڕیشی مەولەوی و**

**سیاچەمانەی غەمگینی هەورامان و**

**بەفری ڕەشپۆشی ژنان و**

**پێیان بڵێن:**

**بە جوندەکانی مردن و**

**پاسەوانانی حەشیشە و**

**بکوژانی باڵندەکانی مۆسیقا و**

**گوڵەکانی کاکۆڵی ژن،**

**پێیان بڵێن:**

**هەرچی شمشێری تاریکیی کەمەرتانە، هەڵیکێشن**

**پاشەکشە بە تیشکێکی گزنگ ناکەن!.**

**پێیان بڵێن:**

**ئەم دنیایە**

**ئێستە تابووتێ چێ ئەکا بۆ تیرۆرو بۆ شەوەزەنگ**

**ئەفغانستان چەند درێژە ئەویش هێندە و**

**بەقەد"عێراق"یش پان و پۆڕ!**

**پێیان بڵێن:**

**خۆری ئێمە**

**چون چاوی خوا و**

**ئاوی ڕوون و**

پیرۆزیی ژن

دڵنیایە و

پێیان بڵێن:

جێگەی ئێوەیش لە سوچێکی

ئەو تابووتەی جیهاندایە!

سلێمانی
2001/11/26

# پییا

لەش با هەردەی بەهاریش بێ ئارایشتی
ئاسمانێکی ئەوێ فەڕ با بە گشتی!.

**گۆران**

(1)

**ئەو شەوە، لە دەرێ، شەوێکی سپیی بوو.**
**شاقولێیش: بۆ سەرێ، هالأوێ**
**لە سنگی خشت ڕێژی شەقام و**
**لە زاری پەیکەری شاعیرێ.. هەڵئەسا**
**هالأوێ، هەڵچوونی خەماوی و**
**هەناوی تەنك و**
**ڕەنگەکەی: شیریی بوو.**
**ئەو شەوە، لەدەرێ، ڕووناکیی سەرمای بوو.**
**شاعیری سەر سەکۆیش، تەنیای ناو، گۆڕەپان**
**دەستێکی وا لەبەر پشتێندا و**
**سەر شەپقە و، ناوشان و، تۆزێکی بەر سمێڵ**

بەفراوی و.. چاوەڕوان:
وەك ئەوەی چاو لە ڕێی هاتنی
دولبەری خەونی بێ و یان پەری ناو شیعری
شپرزە، بەرە و خوار، تا بەری ئەوبەری
پردەکە ئەیڕوانی..
بەلاَم کوا؟! ئەوەتا دوا دانەی گلۆپی
ژوور سەری داگیرساو..
وا ئێستەیش، بە پەلە، بەر لە خۆی، سێبەری
گەیشتە پردەکە و..
بەلاَم کوا؟! بە پردا نە پەری و نە دولبەر
نە خەون و کەس نایە!.
ئەو شەوە، لە دەرێ، تەنیایی سەرمای بوو!.
بەرامبەر پردەکەیش: دارێکی پیرەمێرد
یەك قاچ و شانی کووڕ
بێ وەی و بە تەنها لە قەراغ جادەکە  وەستابوو
کراسی لق و پۆپ دڕاوو، کلاَوی کون کون و
چاویشی لە ئێمەو لە ژووری ئاپووره بڕیبوو!.
ئەمبینی، لە دەرێ، ئەمبینی..
"با"یەکی بێ ئیشی شەڕانی
دەم و چاو خۆلاَویی
ناو بەناو لە ناکاو ئەهات و بە ئەنقەست
شانێکی ڕقاویی لێ ئەداو

پیرەمێرد لە قژی ڕووتاوەی ئەوەری و
لەسەرلا ڕەتێکی ئەبردو.. نەیشئەکەوت
پیرەمێرد، قاچەکەی، بە قوڵیی
بە جەستەی زستان و بەشەوی سپیدا ڕۆچوو بوو.

(2)

ئەو شەوە، لە ژووری
شەوێکی شەرابیی ئاڵ ئاڵ بوو
ئەو شەوە، لە ژووری
ئارەزوویش وەك فۆدگا گەرمای بوو.
لە چوارلاو، بۆ سەر ڕاو، ئەڵقاو ئەڵق
پرتە پرت، قەتارەی، گڵۆپی داگیرساو
بریسکەی ڕەنگاوڕەنگ
جار بەجار وەك بنوون زۆر کزو خامۆش و
لە پڕیش هاتنەوەی شەوقی تیژ
تەماشای ئەشڵەژان!
ئەو شەوە لە ژووری
شەوێکی پشکۆیی ئاڵ ئاڵ بوو
جەستەمان پەنگرو
هۆڵەکە مقەڵی و..
بە سروەی موزیکی ڕۆمانسیش، باوەشێن،
سەرەتای لەسەرخۆی هەڵبوونی شەماڵ بوو

ئەو شەوە لە ژوورێ..
شەوێکی شەرابیی ئاڵ ئاڵ بوو
لە پڕدا
مقەڵی تاوی سەند
مۆسیقای بە کڵپەی ڕەشتاڵەی زنجیەکان
جۆشیخوارد..
مۆسیقار: پایەیەك لە خەڵووز..
لە وەختی ژەنیندا..
دوو چاوی کراوە سێ بەشی سپێنە
دوو گوپی هەڵاوساو تابن گوێ پڕ لە فوو
"سەکسیفۆن" "ترامپێت":
هەندێ جار بە زیکەی درێژی  وەکوو موو باریك و
چون ئەڵماس تیژەوە..
تیسکەبوون، دەرئەچوون..
هەندێ جار
دەنگەکان تەمەڵ و پان و پۆڕ
یان قەبە و، قەڵەو و، گڕ ئەبوون
ئەمبینی: لە وەختی ژەنیندا
زەنگیانەی ورد وردی ئارەقیان
بە تەختی تەوێڵ و، سەرکەپوو،
لاجانگی مۆسیقار دەرئەدا و
باند دوور و، لەو سەرە و

سی ئەوان بۆ نیوگوپ هەوای زیاد
ئەگەڕا و، کەچی من
لە جێگەی خۆمەوە هەناسەم سوار ئەبوو!
لە ژووری ئەوینیش وەك موزیك گەرمای بوو!
یەك مێز و
چوار دەست و
دوو شووشە شەراب و
دوو کاسی مل درێژ لە شێوەی زەڕافە
"مێزەکە پەمەیی و خاڵ خاڵی سپیی تیشك
کەرویشکەی تیا ئەکرد!"
دوو دەستی توکن و
دوو دەستی ناسکۆڵەو
دوای دوو"نۆش"
پێنج پەنجەم، پێنج پەنجەی..
ئەچوونە مابێنی یەکەوە..
هەمان سات
دە پەنجەیش، تا لای چاو
دوو پەرداخ هەڵئەبڕن پێکەوە!
(3)
ئەو ناوی"پییا" یە
باڵندە ژنێکی پەڕ زەردی سویدە و
هێلانەی سپیشی ڕۆژنامەی ڕۆژانە و

بەرایی فڕینی ئاسمانی سەر هەموو دنیایە..
ژنێکە، یان بڵێم، ئاوێکە بێ شڵپەو بێ خوڕە و
سووک ئەدوێ وەک شنەو
کەم ئەدوێ چون نمە و
کە ئەیشدوێ لە بنی ئەم ئاوە ڕوونەدا:
لە مانای داگیرسا و پەڕەکەی ماسییەک
ئەبینی سەرسامکەر خوێن شیرین لە دڵا.
یان گەرای وردیلەی بن بەردی
قوڵایی ئەبینی، ئەو دەمەی کە شانەی
پاشەڕۆژ دائەنێن لە عەقڵا
یان گزنگ ئەبینی ئەو ساتەی ئەنووسێ.
یان خەندە ئەو کاتەی وەک گوڵێک
لە ئاودا ئەبزوێو لەرەی دێ!.
خوێندنەوە، سەفەری هەمیشەی"پییا"یە
خوێندنەوە، نوقمبوون، لە ئاوی کتێبدا
"پییا"یە..
بە پێ بێ و
بە وشەی ئوتومبیل
بە ڕستەی قیتار بێ و
بە گەمیەی کەوانە و
بە سواری فڕۆکەی ناونیشان..
ئەو ئەڕواو ناوەستێ..

"خوێندنەوەی زامی ڕەش
لە قارەی ئازاردا.
شەوێکیان ئەو لەگەڵ
شیعرێکی پێست ڕەشا
دەستیانکرد بەسەما
زەرد و ڕەش تێکەڵ بوون
لە ڕەنگی موتوربەی ئەو دوانە
ڕەنگێك زا
وەکو خۆر بێ سنوور
گشت جیهان ئەگەڕا!"
خوێندنەوەی برسێتی
لە گوڵی گەنم و جۆی کوژراودا
"ئەو ڕۆژە"پیپا"م دی
دوو مەمکی ژنێکی سوماڵی
لەگەڵ خۆی ئەگێڕا
مەمکێکیان دەغیلە و
ئەوی تر کۆترێکی مردوو بوو
بە یەکەم یەك بە یەك
لە دەرگای بەفرینی پایتەختی خۆی ئەداو
بە دووەم.. باڵندەی
جیهانی ئەوروژان".

(4)

ئەو شەوەی، پییا بوو، بە مۆمم
من هێشتا قەسیدەی تاریك و نووتەکی
باخچەکەی دایکم و دوو چاوی کوژاوەی
"مەولەوی"م لەگەڵ بوو!
ئەو شەوەی، پییا بوو، بە ئاوم
من هێشتا تینویەتی دوا ساتی هەناسەی
کڕووزەی سەمەلی گەنم و جۆم لەگەڵ بوو.
ئەو شەوەی پییابوو بە بۆنی ئالودەی غەریبیم
من هێشتا هەر بۆنی، دووکەڵی، کەزیەکەی"مەنیج"و
من هێشتا هەر بۆنی مسکەکەی ئاسکێکی کوژراوی شێروانە و
من هێشتا هەر بۆنی خەنەکەی دەست و پێی
بووکێکی یەك شەوەی"گولان"م پێوە بوو..
ئەو ڕۆژە پییا هات
لە مشکیی کەزیەکەی مەنیج و
لە مسکی مامزو
لە خەنەو دووکەڵ و خۆڵەمێش
مۆمێکی دروستکرد کەڵەگەت
هەڵیگرت بردیە ناو کاولاشی یادمەوە و
لەوێدا هەڵیکرد!.

(5)

**ئەو ئەیوت:**

**لە هەر جێ  و هەر ئاسۆ و هەر گەلێ**

**تا هەوای ژەهراویی بۆسەی خۆی**

**بۆ ڕەنگ و بۆ تیشك و بۆ فڕین دابنێ**

**قەڵەمم مەلێکە و**

**نەفەسی تەنگ ئەبێ و**

**ڕۆژنامەم باخێکە و**

**هەناسەی ئەگیرێ!**

**"بڕوانە ئەو هەموو**

**خەزانی مرۆڤ و خەزانی باڵدار و**

**وەرینی ئەو هەموو چاوانە**

**بڕوانە پێدەشتی ئەو هەموو**

**ئەستێرە مردووانە!"**

**ئەو ئەیوت:**

**ئاوێنەو نیشتمان لە کۆڵمان**

**شێوەی عەشق لە کوێ بێ ئاوێنەم لەوێیە!**

**ڕووبەری یەك وڵات..**

**بۆ سەمای، گەردونیم، زۆر تەنگە**

**من جیهان جەستەمە و**

**پێناسەم تەیرێکە هەڵ ئەفڕێ و**

**هەر ڕۆژەی ئەچێتە سەر لقی وڵاتێ و**

ڕەگەزم شەبەنگی سەد ڕەنگە.
هەفتەیەك من بەفری سویدم و
هەفتەیەك درەختی كوبیم و
هەفتەیەك من خەڵكی ڕواندام
هەفتەیەك گۆرانیی هیندیم و
هەفتەیەك كەوێكی كوردستان!

(6)

پییا بوو
ژنێك و دوو باڵ
"باڵێیەك بۆ گەرمیی ئەو لەشەی
لە زوقم و شەختەدا ئارەزووی جووتبوونی
گڕ ئەدا و
باڵێیەك بۆ جوانیی ئەو هزرەی
بەرەو ژوور، بە پەیژەی ئەستێرەو پرشنگا،
هەڵئەكشا!"
ژنێك و دوو دڵیش
دڵێكیان هەر بۆ خۆم لێی ئەداو
دڵێكیان بۆ زەریا.
ژنێك و سەد سەما:
سەمایەك بە ڕووتی بۆ عەشقم و سەمای تر:
بۆ خەمی باڵندە و بۆ ژانی درەخت و بۆ كۆستی
ئاوێك و بۆ نووزەی نانێك و بۆ جەژنی پەپوولە و

چۆلەکە و بۆ جەژنی منداڵ و کەروێشك و بۆ شانۆی
پێست ڕەش و بۆ یادی دوو ئاسکی دڵدار و بۆ
دەغڵی بەر باران!.. سەمای تر.. بۆ کۆتری بێوەژن
بۆ کانیی و بۆ کچ و بۆ گوڵی بۆن خۆش و هوزاران
بەردەوام سەمای تر بەردەوام..
"پییا" بوو، مۆمە ژن!
ئەو بە ڕۆژ ستوونی ڕۆژنامە بەژنی بوو
شەوانیش ئەگەڕاو
لە هەر شوێن تاریکیی بدیایە
ئەو لەوێ ئەسووتاو
ئەسووتاو
ئەسووتا!

سلێمانی
ئەیلولی 2001

# لە شەممەیەکدا

تەمەن ڕوو بۆ خەزان ئەڕوا کەچی گەردوون ئەوا تازە
لە وێرانەی دلاٚ تۆوی گوڵی دڵداریی ئەڕوێنێ!.
**ئەخۆڵ**

**شەممە بوو. درەختی شەممە بوو. سێبەری شەممە.**
**چڵێکم یادی جەژنی لە دایکبوونی**
**گوڵێکی خۆی ئەکردەوە:**
**"مۆمێك.. دیلانێی ئەکرد و**
**پەپوولەیەك.. ماچی ئەهێنا و ئەبرد و**
**گەلاٚیەك.. نوقڵی ئەگێڕاو**
**ئاوازێ.. پرچی پەلکێکی ئەهۆنیەوە و**
**سەرلقێ.. وێنەی ئەگرت و**
**سەرتڵێ.. کارتی ئەنووسی و**
**سروەیەك.. نمەی گولاٚوی ئەپرژان و**
**پژوپۆیەك.. بە دەنگی بەرز پێئەکەنی و**
**لە سەرەوەیش:**

پەنجەرەیەکی پەمەیی
لە هەورێکدا ئەکرایەوە!"
شەممە بوو. ئاوێنەی شەممە بوو. هەتاوی شەممە
مەلێکم یادی فڕینی یەکەم جارو
یەکەم باڵگرتنی حەزو
یەکەم ژوانی نێو هەواو
یادی یەکەم ساتەوەختی
نامۆبوونی بە ئاسمان و
دوورکەوتنەوەی لەسەر زەمین، ئەکردەوە!.
کە هات شەممە بوو. هاوینی شەممە بوو. لە پڕێکدا
سەرم پڕبوو لە چرپەکانی کزەباو
نیگام شەوقێکی زیوینی تێزاو
بارانێکیش لەسەر شانم بەڕێوە بوو
قسەیەکی پاراو بکاو
دەفتەرێکیش لەبەر دەمما چاوەڕێ بوو
"با"ی وشە بێ و لە شەقام و کوچەی دێڕدا
بە وژە وژی"مانا"وە
"وێنە" هەڵکات!"
"ئەو" لەودیوی تەمومژی ئەفسانەوە
لە هەناوە نسێیەکی قاجارەوە
لە حەرەمی ژنەکانی بابەگەورەی"ئەردەڵان"و
لە قەفەزی کەنارییەکانی"مەستوورە"و

له پاشکۆی ئەسپێکی شینی"زرێبار"دا بوو، هاتبوو.
"ئەو" ژنێکی ئاوێتەیە
له دار بەفرو له وەنەوشە.
"ئەو" ژنێکی موتوربەیە
له سامالْ و له پرووشە.
له قەراغ شار
رەشەبایەك مانتۆكەی لەبەر داكەند و
له قەراغ شار
"بێكەس" بینی و
سەرپۆشی لەسەر كردەوە و
سنەوبەرێ پارچە پارچە جلەكانی بەری گۆڕیو
له دواییشدا لەبەر باخچەكەی"چێوار"داو لەبەر سەرا
دەنگی"دیلان"..
باوەشیكرد بە فرمێسكیا و بە خۆزگەیدا و
تەڵی شیعری سەوزی من و
قومێ له ئاوی حەیاتی شاری دایە!.
شەممە بوو كە هات
"چركە بووبوو بە شەماڵ و
دەقیقە بووبوو بە كلووی چاوەڕوانی و
سەعات بە پێدەشتی شیعر"
كە لە ئەسپی شین دابەزی و گەیشتە لام
هێشتا هەر"هەینی" لێ ئەچۆڕایەوە.

هێشتا هەر"هەینی" هەناسەبڕکێی بوو لەودا و

بەلاّم شەوقی شەممەیەکی پیرۆز

چون سەرەتاتکێی مۆمیٚ

لەگەلٚ ئێوارەیەکی درەنگدا

لەمندا ئەبریسکایەوە!.

کە هات شەممە بوو. ڕووناکییەکی تەڕ، یاقوتێکی تەڕ

خۆی کرد بە ژووردا..

ئاودامان خەیالٚی من و

سترانی"ئەسغەر"و

ئاودامان مۆسیقای ڕەنگالٚە و

شەپۆلی دەریاچەی لەبەردا!.

"بێحەد" جوانە تەنیاییت و جوانە خەمت!.

"بێحەد" "ئەوجی" شۆخێتیتە

لە بەرزایی غەریبیدا!.

بێحەد.. بێحەد.. ژنایەتی

لە قولٚپە قولٚپی جەستەدا

فوارەیەکە و

تۆپی بچکۆلانەی چاوم بە سەریەوە و

بەرزو نزم سەر ئەکات و خوار ئەکات و

لە پڕێکدا

سیحری ئاو و دەستی فوارە

تا خۆرنەوەزی ناو قژت هەلٚمئەدا!.

من ئێستاکە لە بێدەنگی ژیلەمۆدام
کە ئەمبینی، بە ڕواڵەت وا ئەزانی
من هەوارێکی خامۆشم و من مەوسیمێکی ئارامم و
ساردوسڕە وەرزی ڕەنگ و
خۆڵەمێشی سەروسیمام!.
تۆ چووزانی لە ژێرەوەو لە بن شەممەی ئەم ڕۆژەدا
چ دۆزەخی مانگ و ساڵێ تیامدا ئەزێ و
تۆ چووزانی کام ڕەشەبا لە ناخەوە
لەسەر شەختەی ڕۆح هەڵئەکات!
من ئێستاکە لە بێدەنگیی دارستانێکی کپدام و
کە ئەمبینی، وا ئەزانی،
گڤە لە مندا مردوە و
تۆ نازانی ئەم شەممەیە لە ڕەگەوە
کام بوولەرە لە هەناویا دێت و ئەچێ و
تۆ چووزانی ئەم شەممەیە کە تەقیەوە
چ سالاّوێ و چ سێلاّوێ
لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێت و
ڕۆژەکانی تری هەفتە چۆن ڕائەدا و
ڕۆژ ژمێرم و زەمانی من
هەمووی هەر ئەبێ بە شەممە!.

★

بێدەنگیی ئەدوێ بێدەنگیی

پەیڤی متم وەکو ئەستێرك
لە بنەوە هێدی هێدی زیاد ئەکات و
پەنگ ئەخواتەوە نەهێنیی!.
نایدرکێنم!
هاژە سرِرِی شەپۆلەکان سرِرِی بەحر
بەتاڵ ئەکاتەوە وەختێ بزریکێنێ و
وەختێ بە دەنگی بەرز بدوێ.
چەخماخە سرِی باران و
باهۆز سرِی گەوەکان و
من ئەوینم بۆ خەڵوەتی تێرِامانێ
رِائەکێشم...
جگە لە تەنیایی خۆم و
خۆ خواردنەوەی وشەکانم و
خودای شەممەیەکی پیرۆز
ئیتر هیچ کەس لەوێ نەبێ!
چ هاوارێ لەناو بێدەنگیی مندایە
چ سووتانێ لە بەهەشتما و
چ زریانێ لە ساماڵما و
من ئێستاکە، چەند سەدەیەك چاوەرِوانیی
لە سەعاتی شەممەمایە!

★

بێدەنگیی ئەدوێ بێدەنگیی

گوێ قوڵاغە تەنیاییم و
زایەڵەیەك لەم خامۆشیەم هەڵئەستێ
پڕە لە لرفەی ئاگرو
لە مەوجدانەوەی گەرداو و
لە شڵپەکانی کەنارو
لە سامی شەو
وەختێ تۆفان لە باوەش و ئامێز ئەگرێ!.
بێدەنگیی ئەدوێ بێدەنگیی
لە ناوەوە من کوورەم و
لە سەرەوە.. بەفر بەسەرما ئەبارێ
لە ناوەوە.. من تەمموزم و
لە سەرەوە.. من بەهارم بۆ عەشتارێ.
لە ناوەوە.. نێڵەنێڵ و
لە سەرەوە.. لەرزە لەرز و
لە بێدەنگیدا دەنگ ئەڕوێ و
بە پلیکانەی شەممەدا
نووری خودا و
نووری دیدە و
نووری عەشق دێتە خوارێ!.
"ئەو وەختەی شیعرێکی حەزرەتی"مەحوی"
لەو شەممە پیرۆزەدا بە هانای
عەشقی بێدەنگمەوە هات"

به شەمعی شەممەیەك، یەڵدای، شەوی عومرم چراخانە.
بە قەترەی خەندەیەك، وەجدم، پڕاوپڕ گۆمی عیرفانە.
لە بێ نوتقییا من نوتقم، ئەپشکوێت و، دییاریشم
لە نادیارییا ئەنوێنێ و، لە سووتندا خەمم جوانە.
بەژنی شەممە
بە کەلێنی خۆرئاوادا ئەچێتە خوار
ئێستا هەر تۆزێ لە قژی و
هەر تۆزقاڵێ خەندەی دیارە
شەممەی شەوە!
لەسەر ئەم مێزە دڵشادە
کە تریفە پەرداخێتی و شیعریش بادە.
لەسەر ئەم مێزە دڵشادە
کە گلۆپی، مل چەماوەی، گۆشەی باخچە
لە ژێرەوە، بەلا چاوێ، شەرمنانە ئەڕوانێت و
لە پرێکدا(با)یەك دێت و هێشووی تیشکێ
ئەدزێت و بە لەرەلەر لەناو دەستێکی لەرزۆکا
ئەیهێنێت و وەختێ هێشوو بەر چڵ و لقی
درەخت و لەشی ئێمە و مێز ئەکەوێ لە جێی خۆیدا
پەرت پەرت ئەبێ و ترێی تیشك هەڵئەوەرێ و
دەنکە دەنکەی بۆ ژێر مێزو کۆش ئەپەڕێ و
دیارو نادیار، تاریك  و ڕوون، نیوەی کورسی و
نیوەی لەشمان، ڕەش و سپیی هەڵئەگەڕێ

**خۆمان لە یەکتری دوور و**

**بەڵام هەر تۆزێ بەولاوە**

**بە گەورەیی، لەناو چیمەندا، سێبەرمان**

**بێ دەربەست و، سەریان بە یەکەوە ناوە!**

**بێحەد جوانە پرچی تازە هەڵفڕیوی سەری ئازاد**

**بێحەد جوانە تەنیاییت و گەردنی نیوە ڕووناکت و**

**گڕی نارنجیی فەندەکی**

**نێوان لێو و جگەرەت و**

**خەنینەوەی سەفەرێ شاد.**

**لەسەر ئەو مێزە دڵشادە**

**من ئەو شەوە، بووبووم، بە قەڵبەزەی قسە**

**گەلاوگوڵێ، لاسکە گیایە، بن دەوەنێ و،**

**جێ ژوانێ و بەردێ نەما**

**بە چواردەوری جوانیی و ژندا**

**بە پرژەی ڕۆح تەڕی نەکەم!**

**لەسەر ئەو مێزە ئازادە**

**من ئەو شەوە بووبووم بە ژێی کەمانچەیەك**

**یادگار و خەوم لێدا و**

**گۆرانیم کردە بەر بەرد و**

**دارم ژەنی و**

**لەناو گوندی پەپوولەوە**

**گوڵ ئەستێرەی نۆتەم هانی!**

من ئەو شەوە لەسەر ئەو مێزە ئازادە
ئەدوام، ئەدوام، هەورم هێنایە سەر کورسی و
وشەم ئەکرد بە مێخەك و
ڕستەم ئەکرد بە شەقام و
دەستەواژە بە کۆڵاَن و
وێنەیش بە نەخشی دەروازە!
ئەدوام، ئەدوام، گێڕانەوەم لە ڕۆشتنندا لە بەردەباز
هەڵ ئەنووتاو، لەبەر شەوارەی بینینی هەزار ڕەنگدا
چاو ئەشڵەژا و، گێڕانەوەم دائەنیشت و گێڕانەوەم
بازی ئەدا و، من هەر ئەدوام:
باسی دیرۆکی دووکەڵ و خۆڵەمێشی جەستەی شیعرو
قەفنەسەکەی خۆمم بۆ کرد. باسی جۆگەم کە لە
تینووێتیدا ئەمرێ و. ئینجا باسی تەڵەکانی سیاسەتی
نێو دەوڵەتی ئەو  وەختەی شاخ و کێو ئەگرێ و"وچانێك و
باس ئەگۆڕم"باسی بزەی مۆنالیزاو گوێی ڤان کوخ و
شۆرتە کورتەکەی بیکاسۆ و شێت بوونەکەی"خالید سەعی"و
"بازێکی تر" ئەچوومە بەحری ئیجەوە و ئەتاسام و من
هەر ئەدوام، باسی.. باسی.. هەڵاَتنی
درەختەکانی کوردستان
بۆ هەندەران، باسی شیعری بێ باوك و"ئەگەڕامەوە
بۆ دواوە" باسی ئەو غەدرەی کە نالیی لە مەستوورەی
ژن شیعری کرد!. باسی ئێستا و پلەی گەرما و

**جبەی بەری"ئەحمەد ئاوا"و!**

**دوا هەواڵی کۆبوونەوەی حەفتامینی لیژنەی ئاشتی و**

**باسی دیواری پیرەری نموونەیی و!**

**باسی کچی لووت بڕراو و! باسی باسی باسی..**

**بەڵام ئەوەی کە نەهاتە سەر ئەم مێزە**

**وشەیەك بوو" بە هەڵکورماوی مایەوە لەناو ناخما"**

**پەپوولەیەك"باڵی جووت و نەکرایەوە"**

**پەڵە هەورێ"کە ئێستاو ئەوسایش نەباری"**

**من ئەمشەو لەسەر ئەم مێزە ڕووبارێ وشەم ڕشتووە**

**بەڵام کانیەکی عاسیی لەناو قوڵایی مندایە و**

**هەر هەڵنەقوڵی!.**

**پۆلێ باڵندەم هێنایە سەر ئەم مێزە**

**تاقە باڵندەیەك نەبێ کە هەر نەهات و**

**هەر نەهات!.**

**"ئەوە تەیری ئەو خەونە بوو**

**کە هەڵنەفڕی و هەر هەڵنەفڕی"**

**نایدرکێنم**

**خۆشەویستیی گەورە وایە**

**زەریایەکە و نەهێنیی ئەو لە بێدەنگیی و**

**لە تەنیایی و لەناو قوڵایی ناخدایە!**

سلێمانی

ئابی/2001

# محێدین زەنگەنە

ژوورەکەم پڕە لە دیاریی،
لە گۆمێکی"زوریخ"ەوە
چاکەتێکی شینی کاڵم بۆ هاتووەو..!
لەتەمێکی لەندەنەوە
کراسێکی خۆڵەمێشیی و
لە شەقامێکی زەیتوونیی پاریسەوە
پانتۆڵێك و
لە باخچەیەکی ئۆسلۆوە
بۆینباخێکی گوڵ گوڵیی..
ژوورەکەم پڕە لە دیاریی..
خۆرنشینێکی هاوڕێم، ڤیەننایی.
قاپێ شەرابی بۆ ناردووم.
لە مۆسکۆوە کرێوە بەفرێکی دۆستم،
جووتێ گۆرەوی ئەستوورو و..
زریانێکی قوتبی ژوورو و
جووتێ دەستکێش و کلێتە و..

**شەپۆلێکی دەریای سپیش**

**پەرداخێکی کریستاڵیی.**

**ژوورەکەم پڕبوو لە دیاریی**

**بەڵام ئەمڕۆ زۆریم بەخشین**

**وەختێ لەناو باخی لیمۆ و پرتەقاڵی باقووبەوە**

**"با"یەکی نارنجیی هات و**

**دەست بە خەنە، لەگەڵ خۆیدا**

**پڕ بە هۆڵەکانی شانۆ**

**بۆن و بەرامەی"پرسیار"ی بۆ هێنام و**

**عەتری ڤژی چیرۆکێکی کورتەباڵا و**

**عەتری گەردنی ڕۆمان و**

**عەتری قەڵەمی زەنگەنە!**

سلێمانی
2000/4/19

# کەمال مەزهەر

هەموو هەموو بەیانیانێ
کە هێشتا هەتاو نووستووە و
هێشتا دیجلە خەواڵووە و، دار خورماکان
لەناو تەمدا باوێشك ئەدەن
ئەو هەڵئەسێ.. لەگەڵ نەورەسدا هەڵئەسێ و
لە ژووری وشەی بێداردا
بەرامبەر ئاوێنەی عەشقێ ڕائەوەستێ
پەنجەرەیەك لەناو سەریا ئەکاتەوە و
بە ئەسپایی دەست ئەبات و
پرشنگی مێژوویەك ئەگرێ و
پێی ئەنووسێ!.
هەموو هەموو بەیانیانێ
ئەو خەمێکی ڕووناکمانە و
لە باخی فرمێسك و شیعر و لەناو دەنگماندا ئەڕسکێ.
کزەبایە و هاژە هاژە و نمەی بارانە و ئەپرسێ.
گومانێکە و لە سۆراخی یاقووتەکانی ڕاستیدا

له سیلەی هەموو دێڕێکدا دائەگیرسێ.
هەموو هەموو بەیانیانێ
ئەبێ بە باڵندەی مێژووی نێو زەمانێ
ئەبێ بە کارێزکەنی کتێب و بە درەختی جێ ژوانێ.
لەهەر کوێ بێ
وەك مێزەری"شەرەفخان"و
هەوری سەر پیرەمەگرون و سدارەکەی"ئەمین زەکی"
ئەیبینین و وەکوو"لاوك" ئەیبیسین و
ئەویش ئێستا لە تەنیایی ژوورەکەیدا
کوردستانی بە دەرزیەك داوە لەسەر دڵی خۆی و
کە چاو ئەنێ بە برینی کێوانەوە
هەڵەبجەین و کۆچڕەوین و
لەهەر کوێ بین ئەمانبینێ!.
هەموو هەموو بەیانیانێ
ئەم قەڵەمی کازیوەیە
بەڵگەنامەی ئازارێکمان ماچ ئەکات و
گوڵە مێخەکی ژێر بەردە قارەمانێ
لە دیرۆکمان ئەکاتەوە و
بە ڕۆحیەوە ئەینووسێنێ.
هەموو هەموو بەیانیانێ!.

1999/6/26

# له ناو سەبەتەكەیدا..

وەك كەروێشكێ لەناو سەبەتەیەكی پچووكدا..
لەوێ ئەچمە سەر باڵقۆنێكی تەنگەبەر
دائەنیشم و لەناو كورسیەكی قوڵدا نوقم ئەبم
بە دەم بیرێكی پەرتەوە
پەرت پەرت وەكوو
ئەڵقەی دووكەڵی جگەرەم
ئەڕوانمە دوور:
قوببەی گەورەی كلێسەیەك
بووە بە شەپقەی دارستان
پۆلە تەیرێ ئەچنە سەر قەراغی شەپقە ئەنیشنەوە
لە پڕێكدا لەگەڵ وژەی دارستاندا
هەڵئەفڕنەوە.. جیائەبنەوە و
لە دوای خولێك.. لە قولایی سامالێكدا
جووت جووت یەكتر ئەگرنەوە!
لەناو كورسیەكی قوڵدام
لەناو ولاتێكی قوڵدام

لەناو خەیاڵێکی قوڵدام

هەموو ڕۆژێ

بەو سەرەوە

وەڕس  وەڕس لەناو سەبەتەیەکی پچوکدام

وەك کەروێشکێ تەنها سەرم بە دەرەوە

لەم ساتەدا من بە تەنها هەر سێبەری

ئاوێنەکانی ڕابوردووم

ملم نیشتۆتە سەر سنگم و .. نیوەناچڵ

شیعرێکم بەجێهێشتوە و.. خەولێکەوتووم!

سلێمانی
2002/3/3

# خۆم.. ئەو وەختەی باڵندەم

ئەو شمشاڵەی بە لێوی"با"وە ئەیبینن
ئەوە ئەندێشەی لوول خواردووی عەشقی منە
ژانێك كون كونی كردووە و
لە جیاتی من
"چونكە بۆ خۆم نازانم شمشاڵ لێبدەم"
"با" ئەیزانێ و ئەو ئەیژەنێ!.
ئەو باڵندە نارنجیەیش كە ئێواران دەرئەكەوێ و
لە خۆرنشیندا ئەیبینن، تاق و تەنیا دێت و ئەچێ و
بە باڵەكانی ئەنووسێ
ئەوە باڵندەی تر نییە
"چونكە باڵندە ئەخوێنێ و هیچ نانووسێ"
ئەوە منم.. ئەوە خۆمم، لە وەختێكدا
یان"چیرۆك" ئەكەم بە باران
یان"پەخشان" ئەكەم بە زەردە
یاخود"شیعر" بە ئەستێرە و
كە شەو داهات
لە سەرتاندا دابگیرسێ!.

سلێمانی
2002/2/2

# تاشەبەردێ

تاشە بەردێ
لە گوندێکی بێوەژندا
یەکەمجار بوو لە ژیانیا
وەك ئەو ڕۆژە بە کوڵ بگری
وەختێ ئەغیار بە زۆری زۆر
هەڵیانکەندو هەڵیانگرت و
بردیان سەری
کانییەکیان
پێ داپۆشی!

2002/2/22

# داوا

ژوورێك داوای چرایەك و..
چراكە داوای مێزێك و..
مێزەكە داوای دەفتەرێ و..
دەفتەر داوای قەڵەمێك و..
قەڵەم داوای دەست و پەنجەو
پەنجەیش داوای
ئازادیی كرد!

2002/2/22

# بـــاوەش

ئەو باخچەیە
هەموو ڕەنگێکیان بۆ هێنا
هەموو بۆنێکیان بۆ هێنا
هەموو تیشکێکیان بۆ هێناو
هەر دڵتەنگ بوو!
کەناریی و بولبولیان دایە و
کەروێشك و مامزیان دایە و
خۆرەتاویان لەبەرکردوو
مانگەشەویان پێشکەش کردوو
هەر دڵتەنگ بوو!..
ئەو باخچەیە
وەختێ دڵی کرایەوە و
تەنها ئەوکاتە پێکەنی
بەیانییەك
دوو منداڵی کوڕو کچی
ئێسك سووکی
لە باوەشی خۆیدا بینی!

2002/2/22

# هەڵكەندن

لێرەولەوێ خاكمان هەڵكەند
بۆ ئاو گەڕاین..
لەو دەشتانەو لە بناری شاخەكاندا
بۆ نەختینەو ئاسەواری
كۆنمان گەڕاین..
لە قەراغ شار خاكمان هەڵكەند
بۆ بناغەی ماڵێكی نوێ..
لەناو شاردا ئەرزمان هەڵكەند
بۆ كێبڵ و بۆ خەتەكانی تەلەفۆن..
بەر لە ئاو و
بەر لە ئاسەواری كۆن و
بەر لە ماڵ و پێش تەلەفۆن..
لە ژێر خاكدا
كاسە سەرو
ئێسك و پروسكی تێكەڵ و
جلی بێ ڕەنگ و ڕزیوی
ئازیزەكانمان دۆزیەوە!

2002/2/22

# گێلاس

وەختێ کوشتیان
دەنکە گێلاسێکی پێ بوو..
کەوت و دەنکە گێلاسەکەیش پەڕیی..
ڕاکشابوو.. ڕوو لە ئەستێران خەوتبوو!
"چیرۆك نووسەکەیان وا کوشت"
وەرز تێپەڕی و زەمان ڕۆیشت و
دەنکە گێلاس لەو شوێنەدا
چەقی و ڕواو بوو بە درەخت
ئەمجارەیان
لە جێی گەڵاو لە جێی گۆپکە و
لە جێی گێلاس
حەرفی گرت و
وشەی گرت و
ڕستەی گرت و
بوو بە دار گێلاسی چیرۆك!

2002/2/22

# ئاهەنگێك

ڕۆژی مەرگ و بێدەنگیی بوو
ئەو درەختە
لە کلۆری قوڵی خۆیدا
کەڵەشێرێکی شاردەوە!.
کە بێدەنگیی درزی بردوو
کەڵەشێر هاتە دەرەوە.
کرمی ئاوریشمی ئەو کەژە
بە کراسێکی ئاوریشمین
درەختەکەیان خەڵات کرد!
ئەو ڕۆژەی خۆر ئامادە بوو.
لە بەردەم  چەپڵەڕێزانی گەڵاو چڵداو
لەناو فیکەفیکی"با"داو
لەگەڵ تەعلیقی مریشك و گارەگاریو،
لەگەڵ سەمای ڕووت و قووتی بەفراواندا..
وەختی زەردە

باڵندەکان هەر بە دەنووک
کراسەکەیان هەڵگرت و
لە سەرەوە
کردیانە بەر درەختەکە!

2002/2/20

# بازنەی عەشق

چاوەڕوانیم بوو بە گۆم و
ڕۆژێ چوومە سەر کەناری و
یەك مەراقی خڕکە بەردیم
تێهاویشت و
ڕۆحم لەرزی و
لەشم لەرزی و
وردە  وردە بازنەی عەشق
گەورە بوون و هاتنە پێشێ و
دەورەیاندام
بازنی دەستی و ملوانکە و چاوەکانی  و
لێوەکانی و
ئەمێستاکە من بۆ خۆیشم
بوومە خەرمانەی گرێکی ئەڵقەبەندیی و
دەورانکەری کۆچەری سەر
شارەکەی یار!

2002/2/20

# دوا دیــــدار

بۆردوومان بوو
له سێبەری گابەردێکدا
وەنەوشەیەك چاوەڕێ بوو
پەپوولەکەی بگاتە لای!
سەرێکی بردە دەرەوە
تا تەماشای گوڵە سەعاتێ بکات و
دڵنیابێ سەعات چەندە!
پەپوولەی یار
لە وەختی خۆیدا گەیشت و
بەڵام سەد داخ
وەنەوشە بۆ خۆی کوژرا بوو!

2002/2/17

# تـــــاوان

دەنگی بولبولێکیان کپ کرد.

بەلاّم باخێك زریکانی!.

لەو باخەدا درەختێکیان گڕ تێبەردا

بەلاّم شارێ خۆڵەمێشیی

تێدا باریی!.

لەو شارەیشدا کچێکیان کوشت

ئاخ، ئاخ، ئاخ، ئاخ

ئەوسا ئیتر نیشتمانێ

لەمپەڕ هەتاکوو ئەوپەڕی

بە بولبول و بە باخچەوە

بە درەخت و خۆڵە مێش و

پرسەو شارو.. ئاسمانەوە

تا عەرشی خوا

سوور

سوور

سوور هەلگەڕا!

2002/2/15

# تاقە ڕەنگ

ڕەنگی شەوم لە قژم دا
ڕۆژ سڕیەوە!
ڕەنگی بەهارم لە خۆم دا
وەختێ پایز هات سڕیەوە!
خۆشیی ڕەنگی خۆی پیاکردم و
نائومێدیی هات سڕیەوە.
دڵنیایی لە ڕەنگی خۆی هەڵکێشام و
کەچی ترس هات سڕیەوە!
تەنها ڕەنگێ
کاڵ نەبۆوەو
قەت نەچۆوە
هەر ڕەنگی خۆشەویستیت بوو!

2002/2/15

# دنیـــا

پایتەختێ گوێیەكی كەڕ بوو
ئەگەر مەبەستی نەبوایە هیچ ببیسێ
ئەو گوێیەی ئەكردە دنیا!.
مێژوویەك چاوێكی كوێر بوو
ئەگەر مەبەستی نەبوایە هیچ ببینێ
دنیای بەو چاوە سەیر ئەكرد!
ڕۆژێ دنیا
زۆری بۆ هات
لەناو گوێچكە ساغەكەیدا
چاڵە نەوتی تەقاندەوە و
لەناو چاوە ساغەكەشیا
ئاگرەكانی كوژاندەوە!

2002/2/15

# قــژ

له ڕۆژێکی هاویندا بوو
تاڵەکانی قژی کچێ
بەستیانمەوە بەو دارەوە
کە هەردووکمان لە سێبەریا دانیشتبووین!
بەستیانمەوە و گرێیاندام بە چڵەوەو
بە لقەوە..
ویستم هەستم... گرتبوومیان
ویستم تاڵەموو بپسێنم
ئەو پسانمی و داینامەوە!
وەختێ سێبەر بە جێیهێشتین
وەختێ هەتاو هاتە سەرمان
کە ئەو هەستاو وردە وردە دوورکەوتەوە
من ئەوکاتە کرامەوە
بەڵام هەر زوو
زانیم دیلیم لەو قژەدا

ئازادییەو
"کرانەوە" چۆڵم ئەکاو دام ئەخات و پێوەم ئەدات
زانیم وەختێ قژ ئەمگرێ و بەرم نادات
من ئەو  وەختە ئیتر فڕین و هەڵکشان
بەرەو بەرزاییەکانی ناو عەشق و
شیعر ئەمبات!

2002/2/14

# چیرۆکی گورگێ

گورگە کە سواری کەشتی بوو
کەشتی کەوتە بەر زریانی تووڕەی ئاوو
خۆیدا لە شاخی سەهۆڵ و
قلپ بۆوە.
دوو سێ بەچکەو
دوو پاسەوانی خنکان و
بەڵام بۆ خۆی لەو سەرەوە هاتە دەرێ.
گورگەکە سواری ماشێن بوو
لە پێچپێکی هەڵەمووتدا..
گابەردێ قۆچێکی لێدا و
خلۆر بۆوە و.. دوو یاوەری و
شۆفێرەکەی مەرگ بردنی و
بەڵام بۆ خۆی تەنها پەنجەیەکی شکاو
لە بنەوە هاتە دەرێ!
گورگەکە سواری قیتار بوو

شەوێك ڤیتار لە تەمێكدا لە ڕێ لایداو
خۆی بە تونێلێكدا كێشاو
نیوەی سەرنشین كوژران و بەلاّم بۆ خۆی
تەنها هەر قاچێكی شكاو
لە بنەوە هاتەدەرێ!.
ئەمجارەیان
گورگەكەمان سواری فڕۆكەیەك بووەو
لەسەرو هەورەوە ئەفڕێ..
ئەی فڕۆكە وەختێ بكەوێتە خوارێ؟!!

2002/2/14

# ئاوێنەو پاییز

ئاوێنەیەکی دوور دوورە لە من، باڵآت،
شۆڕە ژنم!.
وەلێ شەوقدانەوەی جوانیت، منی پاییز،
لەهەر کوێ بم
بە دەم ڕێوە ئەگەر پەرتیش بووە شەوقی و
ئەگەر خۆیداوە لە شاخ و
وردیش بووە تیشکی و
زامدار بووە ڕەنگی!
لە ئاکامدا
ئەبێ هەر ئەو
بە ئێواران
لەگەڵ تیلماسکێ خوناودا
بگاتە پەنجەرەی سەرم و
بە هێواشیش لەگەڵ تەمدا
بچێتە سەر وشەی زەردم
شۆڕە ژنم!

سلێمانی
2002/2/13

# له یەك نەچوون!

گوڵجاڕێ گوڵ بە سەدان بوون
بەڵام هەموو لە یەك ڕەنگ بوون
یەك چرکە چاویان ڕاگرتم!.
پۆلە مەلێ سەدان بوون و
هەر لەیەك ئاوازیان ئەخوێند
یەك چرکە سات گوێم لێگرتن!.
پۆلێ کچ بوون..
من یەك چەشن جوانیم بینی
یەك دەقیقە سەیرم کردن و
بەجێمهێشتن!.
ڕەفەیەکی کتێبخانە:
دە کتێب بوون
دە خەو بینین
دە جیهان و
دە ڕوانین و

دە لێك نەچوون
چەند مانگێکە لە گەشتێکی ڕەنگاو ڕەنگدا
بردوویانم و فێریان کردووم
ئێمە ئەو وەختە جوانترین
لەڕوانین و لە فڕین و لە ڕەنگ و بۆی
وشەکاندا، لە یەك نەچین!

2002/2/11

# وێنەکێش

ئێوارەیەکی درەنگ وەخت.
خۆرنشین خۆی وێنەکێش بوو..
باریکەلەو ڤژی تەنك!.
لەسەر کورسیی هەورێك سپیی
پشت کۆماوە... دانیشتبوو
کەمە.. کەمە
ڕەنگی سورو ڕەنگی زەردی
لەناو دەفرێکی ئاسۆدا
تێکەڵ کردوو
تابلۆیەکی پرتەقاڵیی سریالیانەی
لێ دروستکرد:
"فریشتەیەك لەناو گڕێکدا ئەسووتێ و
مارێك لە مەمکی ئاڵاوە و
دۆزەخەوان ڕاوەستاوە و
کۆڵەوژی لۆلاقێکی بە دەستەوە و

پێ ئەکەنێ!"

خۆرنشینی وێنەکێشی شپرزەی ناو

ڕەنگی جیاجیا

تابلۆی هەڵگرت دای بە شانیا

تا وەك دیاریی

بیبا بۆ کچە ئەستێرەی گەردوونی دوور!

هێشتا ئەو هەر بەڕێوە بوو

لە دەشتی هەور ئەپەڕیەوە

لەپڕ تاریکیی ڕێژنەی بارانێکی داڕژان و

تابلۆ خوسایەوە ڕەنگی و

وێنەکێشیش لە مەراقدا..

لەودیو شاخەکان ئاوابوو!

2002/2/10

# نەورەس

**گوارەکانی**

**لە شێوەی دوو نەورەسدا بوون!**

**چرپەیەکم بە گوێدا کرد!**

**نوکتەیەك بوو**

**ڕووت و قووت و**

**پڕ لە هاژەو**

**پڕ لە شەپۆلی پێکەنین،.**

**لەگەڵ قەڵبەزەی قاقایدا**

**نەورەسەکان کەوتنە جووڵە و**

**باڵیانگرت و کەنار گەردنیان جێهێشت و**

**بەسەرماندا**

**کەوتنە فڕین!**

2002/2/10

# لەو دەشتەدا

من کچێکی کراس سپیم
لەبەر مانگە شەودا بینی
بینیم خەریکە بە دەستێك
گوڵە مێلاقە ئەچنێ و
بە دەستێکیش.. لەو دەشتەدا
چەتری ئەستێران هەڵئەدا!.
ئاوم بینی
لە دۆڵێکدا تاق و تەنیا ڕاوەستاوە و
لەبەردەمی تریفەدا حەپەساوە!.
دارم بینی سەرکەوتۆتە سەر گردێك و
لەوێوە ڕا
لە دوورە ئاگرێ ڕاماوە!.
ئاسکم بینی
سڵ لە سێبەری هەورەکان ئەکاتەوە و
بەفرم بینی
لەتاو عەشقەکەی هەڵەکۆك

تنۆك تنۆك تواوەتەوە.

مانگ جوان و دەشت جوان و گوڵەمێلاقە و ئەستێران،

ئاو و ئاسك، درەخت جوان و

بەلاّم لە هەموویان جوانتر

كچەكە بوو!

2002/2/10

## بیرنەچوونەوە

**زەمانێ، وشە کوشتن بوو**
**بەڵام هەموو وشەیەك نا!**
**زەمانێ، عەشق کوشتن بوو**
**بەڵام هەمووعەشقێکیش نا!**
**سەربازەکان**
**سەگێکی پۆلیسی ڕەشیان لەگەڵدابوو**
**لە سیلەی یەکەم شەقامدا**
**کە ئەویان دی**
**بانگیان کردوو**
**سەگەکەیان بەرەڵڵا کرد!**
**ئەویش لە جێی خۆیدا چەقیی!**
**سەربازەکان**
**وەك بازنێ دەورەیاندا**
**سەگەکەیش پیایدا هەڵگەڕا و**
**قولانج.. قولانج**
**کەوتە بۆنکردنی لەشی.**

سەربازەکان
زۆر دەمێك بوو
سەگەکەیان لەسەر بۆنکردنی شیعری یاخیی و
لەسەر بۆنکردنی عەشقی خاك و
نەهێنیەکانی ئازادیی و
بۆنکردنی ڕەنگی هەڵوێست.. مەشق دا بوو!
چەند دەقیقە
سەگەکە هەر بۆنی کردو و
لە پڕێکدا قورسکەیەکی بۆ کردو و
وازیهێناو گەڕایەوە
بۆ بەردەمی سەربازەکان.
شاعیرەکەیش، دیسانەوە
بە هەردوو دەست کڵاوەکەی
توند گرتەوە و
بە ڕێگەی بێوەیی خۆیدا
ڕۆی تێپەڕی!.
شاعیرەکە هیچی لەوانە پێ نەبوو
کە لە ڕۆژگاری کوشتنی پەپولەکان و ماناکاندا
بۆ سەربازو سەگی پۆلیسی بەلاّبن!
کە لە ڕۆژگاری کوشتنی عەشقەکان و خاك و خۆڵدا
بۆ دیرۆکی شەوەزەنگ و ژووری ئازار چل چرابن!.

ئەوەی کە ئەو لە گیرفان و با خەڵیا بوو
قەسیدەیەکی سەرکزو پەناگییر و
ژاوەژاوی زمانێکی ناو کوولەکە و
فۆرمی عەشقێکی بەتاڵ بوو!

سلێمانی
2002/2/10

# هەشتەم ڕۆژ

له هەشتەم ڕۆژی مانگێکدا..
هەشتێکی سارد، ڕۆژێکی سارد. ئەو مانگەمرد!
له هەشتەم ڕۆژی مانگێکدا..
له ڕۆژێکی ساردو سووردا
ڕۆژیش وەکوو کوڕەکان و کچەکان و
نەورەسەکان ئەویش کوژرا!
له هەشتەم ڕۆژی مانگێکدا
قاژوویەکی باڵ بەرینی ڕەش و گەورە
کەوتە ئاسمانی ئەو شارە. قیڕەی سارد و،
سێبەری سارد. نسێی مێژوو، چۆکیان دادا و
شار پێچرایە ناو ترسێکی تەنگەبەر و
شار خزایە دووکەڵەوە و
هەناسەکان کلۆم کران!
له هەشتەم ڕۆژی مانگێکدا
هەشتێکی سارد. هەشتێکی شووم
ڕۆژەکان وەك كفنی زەردو

شەقامەکان بوون بە تابووت!.
لە هەشتەم ڕۆژی مانگێکدا..
هەشتی شوبات!، هەشتێکی دڕ، جارێکی شووم..
دیرۆکێ بووە قوربانیی و
زستانێکیش بە بێوەژن!

هەشتی شوباتی 2002

## بەهانە!

گەر بیانوویەك نەدۆزمەوە
من ناتوانم بچمە لایان!
ئاخر من چۆن لە خۆمەوە و هەروا بێ پرس
ئەتوانم دەستکەم بە سینەی ئەو"مانگ"ەدا
گەر پێی نەڵێم: لێم ببوورە
من دوێنێ شەو ئا لێرەدا
شیعرێکم لێ بەجێماوە و بۆی ئەگەڕێم!.
من ناتوانم هەروا بێ پرس لە خۆمەوە
بە پلیکانەی ناو(با)دا سەربکەوم و
بچمە ناو ماڵی"زوهرە"وە
ئەگەر نەڵێم: لێم ببوورە
هەفتەی ڕۆیشتوو
لەم ماڵەدا، من گلۆڵەیەك خەیاڵ و
هەندێ تیشکم لێ جێماوە و بۆی ئەگەڕێم!
ئاخر من چۆن لە خۆمەوە
بچمە ناو ژووری نوستنی"خەزاڵ"ەوە

ئەگەر نەڵێم: لێم ببوورە
لەم ژوورەدا و
لێرەدا من خەوێکی چاوشینی جوانم
لێکەوتووە و بۆی ئەگەڕێم!
من نایشتوانم لە خۆمەوەو هەروا بێ پرس
ماچم بە لەشتا هەڵزنێ و
بێمە ناو قژی پڕتەوە
ئەگەر نەڵێم.. لێم ببوورە
بەر لە تۆزێك هەر کە دیمیت
سوێسکەی دڵم
لە سنگمەوە فرتەی کردوو
چووە دەرێ و چاوم لێبوو
خۆی کرد بە باخەکەی تۆدا
لێم ببوورە من ناچارم بۆی بگەڕێم
من ئەزانم لە هیچ شوێنێکی تر نییە و
لەلای تۆیە و
لە قژتەوە تا قولەپێ
بۆی ئەگەڕێم

2002/1/16

# هەمیشە عەشق!

تۆ مەلێکی لە پەڕەی گوڵ
جوانیی ئاسۆت و
فڕینت پڕە لە عەترو
گمەت پڕە لە شەونم و
من درەختێکم لە خەیاڵ
پەل و پۆم لە تریفەیە و
گەڵاکانم لە سەرنج و
ئامێزم پڕە لە شیعر!
ئەی گوڵ کۆتر!
وەرە لەسەر چاوەڕوانیم بنیشەوە
با جوانیی و خەیاڵ لێك بدەین
وشە چەخماخە باتەوە و
بۆن بباریٚ و ڕەنگ بباریٚ و
هەموو دنیایش بمانبینن
لەم شارەدا
چۆن تێکەڵی یەکتر ئەبن
دوو ئاوانی بەخوڕڕەمی
عەشق و شیعر

سلێمانی
2002/1/5

# نامەی ڕووبارێ

لەگەڵ خۆشەویستیما بۆ سەعدی یوسف

**ئاوی دیجلە**
**با تارییکیش بە هەردوو مشت**
**بیخواتەوە و**
**با ئابلۆقەیش سەتڵ سەتڵ**
**هەڵیهێنجێ و با دەشتی خوێش**
**هەڵیمژێ..**
**ئاوی دیجلە**
**با کەمیشکا وەك دڵۆپی پێکەنینی**
**سەر ڕوومەتی لیمۆی بەسرە و**
**غەمگینیش بێ چۆن دەم و چاوی**
**"جواد" و**
**نانی برسیی و**
**مەقامەکانی"گوبانچی" و**
**چیرۆکەکانی"تکرلی"..**
**ئاوی دیجلە**

با کەفی خۆی سیخوڕی بێ و
خەبەر بدا لە نەوڕەس و
قولاپ هەڵدا
بۆ گرتنی سوورەماسیی دڵی بەغدا و
شیعری"سەعدی"..
ئاوی دیجلە
با شپرزە و با ماندویش بێ
چون نامەکانی"سەیاب" و
"شناشیل"ی چاوەڕوان و
گیرفانەکانی"مەردان" و
کڵاوەکەی جەواهیری..
بەڵام ئەوسایش.. ئاوی دیجلە
هێشتا بەشی
ئەو تفانەی پێ ئەمێنێ
لەناو دەمیا کۆیکاتەوە و
لە کەمەری برینداری"کەرخ"ەوە بێ
یان"رەسافە"
سەری قوڕاوی دەربێنێ و
چاو هەڵبڕێ و
هەموو ڕۆژێ
بۆ شاعیرێکی پۆلیس و
بۆ پۆلیسێکی شاعیری بهاوێژێ!.

**ئاوی دیجلە هەر ئەوەندەی پێ ئەمێنێ**

**ئاوی دیجلە!.**

سلێمانی
2001/11/11

# دوو ڕازی ڕۆمانسیانه

(1)

ئەم ڕۆژانە..
من ڕۆمانێك ئەخوێنمەوە
ڕستە.. ڕستە
وردە ئەستێرە لە"سەرما" تۆو ئەكات و
لە خەیاڵما.. ئاسۆ.. ئاسۆ
"با" ڕەنگ ئەكاو
تەلیسمێكە
منی كردووە بە حەوزی حەپەساوی
بەردەم مانگ و
بە درەختی سەرسوڕماوی
ڕۆخی زێیەكی زستانە!
ئەم ڕۆمانە..
تەنها ڕۆمانە حەزناكەم
بیدەم بە كەس!.
تەنها ڕۆمانە حەزئەكەم
كە خوێندنەوەی دوایی نەیە!
ئەم ڕۆمانە

**تیراژەکەی دوو دانەیە و**

**کەچی هەزاران ئەیبینێ و**

**کەچی شارێ پێی سەرسامە!**

**نووسەری ڕۆمان خودایە و**

**ناوەکەیشی:**

**"سیحری دووچاوی لەیلایە!"**

(2)

**من دوورگەم و ئەویش زەریا**

**مەرجی ئەو عەشقە وەهابوو**

**هەموو شەوێ**

**لە کەناردا**

**هۆنراوەی بۆ بخوێنمەوە**

**هەتا ئەنوێ!**

**مەرجی ئەو عەشقە وەهابوو**

**ئەگینا غەرقم ئەکات و**

**بە شەپۆلان دامئەپۆشێ!**

**دوێ شەو من ئەو مەرجەم شکان**

**چونکە زانیم خەم بۆ عەشقێ**

**لە نوقمبوونی تەواودا**

**جوانترین شیعر ئەنووسێ!**

سلێمانی
2001/8/19

# هاوسەر!

ئێستە زۆرجار.. نیوەشەوێ
شیعر ڕقی تەنیاییم و ژوورەکەم و
قەڵەمەکەم.. هەڵئەسێنێ و
خەیاڵم تووڕە ئەکات و
لە من ئەبێ بە ڕەشەبا و
بەر لە گەیین.. ئەموەرێنێ!
ئەم هاوسەرە حول حولییە..
لە پرێکدا شەوێك"جێ" جیائەکاتەوە و
بەجێمدێڵێ و لە ژوورێکی تردا ئەنوێ!
"وەختێ کە من دەربەندێکی پڕ لە گڕم!"
هەر ئەم هاوسەرە ڕاڕایە..
شەوێکی دی، ئەو لرفەیەو، خۆی باوەشم پیائەکات و
دێتەوە لام
"ئەو  وەختەی من پەڕەی سپی و
شمشاڵێکی ساردو سڕم!"
ئەم هاوسەرە حول حولییە لە من ناگات!

گەر وا بڕوا من ناچارم

ئەم زستانە

ژنە چیرۆکێکی جوانی.. کەڵەگەتی

لە وێنەی"ئاناکارنینا"ی

بەسەر بێنم!!.

2001/8/22

# عەشقی تۆ هەتاوە!

چاوانت هەمیشە دوو کانین
لە خەوما.
هەر بۆیە بەیانیان
ئەو وەختەی کە شیعرم هەڵئەسێ
سەیر ئەکەم:
جێگەکەم پڕبووە
لە گوڵی
ئەوینت و
لە نمەی گڕوگیا!
عەشقی تۆ هەتاوە
ئەو وەختەی لە ڕۆحما هەڵدێت و
ئەتبینم.
وەختێکیش کە ئەڕۆی ناتبینم
ئەبیتە سێبەری جەستەم و
هەورێکی خەیاڵم و
پێ بە پێ
ڕێ ئەکەی لەگەڵما!

سلێمانی
2000/6/15

# ڕامووســـــــان

**شەوی مانگەشەوە لەشت**
**تەنیایی منیش ڕێبواری.**
**چ ئەوینێکی زیوینە**
**لەم سەفەری گوڵ و وشە و بارانەدا**
**هەڵکردنی بارێزەکەی ئارەزووت و**
**دارژانی ماچەکانت!.**

★ ★

**خەمت گەرمە و**
**تەنیاییم سارد**
**لە ڕامووسانی ئەبەدیی ئەم عەشقەدا**
**کە لێك ئەدەین**
**هەوار.. هەوار**
**دائەگیرسێ ئازارمان و**
**هەردوو ئەبین**
**بە یەك شیعری بڵێسەدار!.**

سلێمانی
2000/6/10

# ڕەشەبایەکی چەمووش و
# بەیانییەکی تازە

بەیانییەکی تازە بوو
بۆ یەکەمجار بەو جۆرە بیرم نەکردەوە
وەك ڕەشەبا ئەیویست:
"خۆڵکردنە چاوی ئاو: تا کوێرکردنی.
ئەستۆ وردکردنی داروبار، هێلانە ڕوخان،
وردوخاشکردنی ئاوێنەکان و فەرامۆشکردنی
بێشکە و گزنگ و بە ئاشکرایش کوشتنی
هەورو کێڵگەکان!"
بەوجۆرە بیرم نەکردەوە
وەك ڕەشەبا ئەیویست.
لە نێوان من و ئەودا:
بێدەنگییەك دروست بوو
بێدەنگییەك لە بەرد.
بێدەنگییەك لە تەختەی تابووت.
ئەوە عومرێکی درێژە، ئەوەتەی شاخ لە بیرێتی،

ڕەشەبایەکی کۆرەو چەمووش و ڕیشن. لەم شارەدا
پادشایە. پادشایەك پڕە لە زەمهەریرو پڕە
لە مارو لە شەهوەت و پڕیشە لە ویقارو وەعزو
تەگبیر. پادشایەك ڕۆژی چەند جار لە بلێسەی
دۆزەخمان هەڵئەکێشێ و یەك حیکایەتمان بۆ ئەکاو
یەك سەوڵەجانمان نیشان ئەداو یەك ڕووگەی پەرستن و
یەك تەختی شانشین!
عومرێکی درێژە ڕەنگە جوداکان مردوون.
عومرێکی درێژە ئاو هەریەك دەفری هەیە و
عومرێکە باڵندەکان هەریەك جۆر فڕین و
یەك جۆر ئاسمان و
یەك جۆر خوێندن.
عومرێکە.. عومرێکی درێژ درێژ
شمشێری وشەی غەزا لەسەر گەردن
سەما ئەکاو هەڵئەپەڕێ پەنجەی قرتاو
لەناوماندا نیشتەجێیە و
لەگەڵماندا ئەنوێ مردن!
ئەم بەیانیە بەو جۆرە نەمرڕوانیە خۆم
وەك ڕەشەبا ئەیویست.
ئەو خۆمی لەناو خۆمدا خانەوێران و سەرگەردان کرد.
بەلآم من بۆ خۆیشم تەیرێ بووم گول.
من خۆم ئەسپ بووم و بەلآم حیلەم خەسیو.

**من خۆم درەخت بووم و بەلاّم ڕیشەم ڕزیو.**
**عومرێکە ڕەنگە جوداکان مردوون.**
**عومرێکە من بەردی بن گۆم و**
**عومرێکە من خەو نابینم و**
**برینێکم زەبوون!**
**من ئەم بەیانییە جیابوونەوەی دەنگی خۆم**
**لە گڤەگڤی ئەو، ڕەنگی خۆم لە شێوەی ئەو**
**سەری خۆم لەسەری ئەو جیاکردەوە.**
**ئەزانم من ئیتر لەم بەیانییەوە**
**ڕێبواری ناو مەملەکەتی قەدەر ئەبم**
**ئەزانم من ئیتر بە شوێنمەوە ئەبێ ئاگر**
**دوام ئەکەوێ سەعیرو زەمهەریرو**
**ڕێم پێئەگرێ باهۆزی لم و**
**لەسەر لەوحەی وجودم ئەنوسرێ**
**"بئس المصير"**
**ئەزانم و ئەزانم لە شوێنە بەرزەکانی شارەوە**
**ڕۆژی چەند جار بە پشکۆکان ڕەجم ئەکرێم و**
**ڕۆژی چەند جار سەگە ڕەشەکانی"حجاج"م**
**تێبەر ئەدەن و ڕەنگە بمخەنە گونیەیەکی**
**سەر داخراوەو ڕەوانەی نەجدم بکەن و**
**ئاوارەی تەکفیر. چونکە وتم:**
**چەند ڕەنگێ بۆ ئەم دنیایە**

چونکە وتم چەند خۆری بۆ ئەم زەریایە
چونکە جارڕ لە سپییەك دا کە هەر
ڕواڵەت بوو. چونکە  وتم ئەوە
عومرێکی درێژە من دیلی ناو ڕەنگی خۆمم!
من لە گۆشەی ئەو تابووتەی تیا بووم
هاتمە دەرێ و زریکانم.
ئەم بەیانییە ڕۆژباشم لە ترس نەکرد.
وەکوو جاران من ئەم بەیانییە ڕۆژباشم
لە ڕەشەباو مردن نەکرد.
وێرام لەگەڵ خۆمدا بدوێم
وێرام ئیتر پرسیار بکەم
وێرام ئیتر گومان بکەم
وێرام ڕووناکیی قاچاغ و تیرێژی قاچاغ بدوێنم.
لەگەڵ شەماڵ و پەپوولەدا پیاسە بکەم
لەگەڵ هەموو جوانیەکاندا شیعر بخوێنمەوە..
وێرام ئەستێرە بژمێرم و
گومان لە خواکانیان بکەم
سەری خۆم بە ڕوونیی
لە زۆر ئاوێنەدا ببینم!.
بەڵام ئەم وەرچەرخانەم جەستەم
ئەداتە دەست نادیار. ڕەنگە لوولم بدەن و
لە شەوێکمەوە بپێچن و بمفرێنن. ڕەنگە

هەموو خەونەكانم لە بەردەمی خۆمدا بشكێنن و
وردە شووشەی ئەو خەوانەیش بكەنە كالانەی
چاومەوە. ڕەنگە هەردوو گلێنەیشم بخەنە قولی مشتی ڕەشەباوە.
ئەم بەیانییە شتێك ڕوویدا
لە ڕوودانی بەریەك كەوتنی دوو ئەستێرە ئەچوو
لە ڕوودانی جیابوونەوەی گۆی سەر زەمین لە
پشتێنەی هەسارەكەی. من ئێستا لە فەزایەكدا
ئەخولێمەوە خۆڵەمێشی و پڕە لە دەست و پەنجەی
با بردوو لە ڕەنگی بابردووی ئەوانەی
بڕوایان بە یەك ڕەنگ نەبوو. لە فەزایەكدام
پڕە لە زریكە و سیخناخە لە قریشكە و لە سووتانی
بەردەوام. پڕە لە حەقیقەتە ئاوارەكان.
من لێرە و لەم هەسارەیەدا هەموو ئەو ڕوخسارانەم
بینیەوە كە لە هەزاران ساڵی ڕۆژ ژمێری جەنگەڵەوە،
ڕۆژ ژمێری بت و بتەوانەوە، دەربەدەر كرابوون.
بارانی دەربەدەر، هەتاوی سەرگەردان، عەشقی
ناكام. هەندێكیانم ناسیەوە و ئەوانی تر نەء
چ خەوێكی سەیر بوو
خەوێك بوو. خەریك بوو، وەك بەفری
بەر ڕەشەبا شێت بم.
خەریك بوو وەك لمی كەنار زەریا
مل بدەم و بێدەنگ بم.

بەڵام خەو بوو.

"کێ مردنی خۆی ڕەتبکاتەوە و

یەخەی قەدەری خۆی بگرێ و

لەبەردەمی یەك ڕەنگیدا دانەمێنێ

ژیان ئەباتەوە"

ئەمە پەندی خواوەندێکی گریکییە

کە ڕازی نەبوو پەرستن بکا بەپیشەو

ڕازی نەبوو بە تەنها ڕاستییەك بخوێنێتەوە!

هەر دوێنێ بو هاوڕێیەکم ڕەشەبا کردی

بە پاسەوانی گۆڕستانەکانی خۆی. ڕەشەبا کردی

بە زێوانی ئەو گومەزانەی کە باوو باپیرو پشتی

پێشینەی ڕەشەبایان تێدا نێژراو.

هاوڕێکەم ئێستە بووە بە قەلە ڕەشکەیەك،

بەقاژوویەك و لەسەر دارێکی زڕی ئەو

گۆڕستانانە قیڕەی دێ و ئەخوێنێ.

قاژووی ڕەشەبایە

قاژووی مردۆکانە و

چاوهەڵکۆڵی زیندۆکان.

ئەم بەیانییە عومری خۆم کورت کردەوە، ئەوەندەم

کورت کردەوە هەر تاڵەموویەك نێوانی ئەو و مەرگە.

چونکە ئەم بەیانییە درێژەم بە عومری"ئا" نەدا.

چونکە لەو ڕیزانە جیابوومەوە کە تابووت چێکەری

ڕەشەبان. ئەوانەی ڕووباریان بە تۆمەتی زینا
کوشت. دەستەکانی درەختیان بە تۆمەتی دزیی
بڕیەوە و، لەسەر ماچێکی سەوز، جەڵدەیان
لە کچە دارسێوەکان داو، کوڕەکانیشیان لەسەر
قومێ بادە خاکەسار کرد.
ئەم بەیانییە کە هاتمە دەرەوە
بۆ یەکەمجار باران دواندمی و پێی وتم،
ئەوە ئیتر هەر چاوی خۆت نییە
بۆتە چاوی کانییەکانیش.
بۆتە چاوی ڕێگاکانیش.
ئەوە ئیتر هەر دەستی خۆت نییە پێتەوە
بوونەتە دەست و پەنجەی دارەکانیش.
ئیتر ئەوە هەر سەری خۆت نییە بە خۆتەوە
بۆتە سەری منداڵان و کچەکانیش.
بۆتە سەری کێوەکانیش.
چەند هەنگاوێ لەولای بارانەوە
دەرۆزەکەرێك پێی وتم:
ڕەنگە ئیتر بۆ لەمەودوا
بە یەکەوە جیهان تەیکەین!
تۆ بۆ ڕووناکیی و
من بۆ نان!
لەو بەیانییە تازەیەدا..

که یەکەم شەقام بینیمی ئەویش پێی  وتم:
پێ ئەچێ لەسەر سنگم خاچێکت بۆ داکوتن و
هەر لەسەر سنگیشم خۆڵەمێشەکەت بە با بدەن و
پێ ئەچێ تەمەنت لە تەمەنی گوڵ کورتترو
بۆ دواجاریش گەواڵەهەورێکی بەهارە
لە ڕێژنەیەکی خێرادا لاواندنەوەت بگرێتە ئەستۆ
"تەمەنی گوڵ چەند کەمیش بێ
بۆنێکی خۆشی بە خۆشەویستی بەخشیوە"
لەبەرئەوە نە دڵتەنگم و نە دڕدۆنگم
ئەزانم من ئەو سێبەرەی دوێنێ نیم
لەو بەیانییە تازەیەدا ئەوەی سەرسامی کردم
ژنێکی سەرتاپا سووری گەڕەکەکەمان بوو، نازانم
چۆن گوێی لەم چرپە چرپەی ناو من بوو.
چۆن گوێی لە دەنگی خەونەکانم بوو. نازانم لە
پڕ هاتە بەردەمم و هەموو لەشی بە گوڵی ژاڵە
داپۆشرابوو. ئەبریقایەوە. ژنێکی سەلار،
ژنێکی گولاڵەیی، چاوی تیژ. لەناو قوتویەکی
داخراودا. کلاَفەیەك قژی پێشکەش کردم و
وتی: ئەوە ڕەشەباکەت هەڵیکەند. ئەوە
دەستی ئەو دەسکەنەی کرد. ئەمە دوا یادگاری
"جوان"ە با لای تۆ بێ بۆ ئەوەی بە تیری
عەشقی گرفتاربی. با لات بێ بۆ ئەوەی هەر تالێکی

کوشتارگەیەکت بیر بخاتەوە. با شەوانە هەر تاڵەو
حیکایەتێکی نامۆیی خۆیت بۆ بگێڕێتەوە ئینجا بنوویت.
من کەمێك گریام.
بەلاّم ئەو زۆرم پێ پێکەنی!
ژنەکە وتیەوە:
بەلاّم هەرکەس ئەو قژەی لابێ
حەرامی لایە.. حەرام.. حەرام
من ئیتر ئەو تاڵەمووانەم، ئەو قژەم،
لەسەری خۆمدا ڕوانەوە!
ئێستە خەو لە بێداریدا ئەبینم
چاوەکانم کراوەن و خەویش ئەبینم
هەروەك گۆمێك چاوی زەق و خەویش ببینێ
هەروەك ئاگرێك بسووتێت و خەویش ببینێ.
من بەیانییەکی تازەم لە چاودایە
هاوڕێکەم بووە بە قەلەڕەشکە
بیری ئەکەم و خەفەتیشی بۆ ئەخۆم
من بڕوا ناکەم جارێکی دی ئەو هەرگیز بگەڕێتەوە ناومان.
بگەڕێتەوە ناو خەونەکانمان و
ناو خۆشەویستیمان و
ناو ئاوێنەکانمان و ناو باخچەکانمان!
ئەم بەیانییە
بوومەلەرزەیەك ڕوویدا

له پێشدا منی ژێرەوزەبەر کرد
منی هەڵتەکاندو منی تەخت کرد
بوومەلەرزەیەك لە پێوانەکانی ڕیختەر سەروتر.
لەناو مندا ئەو شارە خاپوور بوو کە تیایدا لە دایك بووم.
ئەو شەقام و گۆڕەپان و دروشم و هۆڵ و شانۆیانە
نەمان کە منیان لە چوارچێوەی خۆیان گرتبوو. نەء
ئەو شارە نەما کە منی تێدا لە دایك بووم.
من لەژێر بوومەلەرزەوە گەڕاومەتەوە.
من لە هەناوی بوومەلەرزەوە هاتوومەتەوە.
لە دروستبوونەوەی ئەستێرەیەکی تازەدا
لەدایك بوومەوە.
دەرەوەی خۆم
هێشتا وڕوکاس و سەرسامن و تێم ناگەن.
ئەوان هێشتا هەر گوێ لە دەنگدانەوەی
دەنگی بیابان و سەدای غەزاکان و خەلیفەی
لم و چۆڵەوانی ئەگرن. ئەوان هێشتا هەر
عەبدی پەیڤە بە بریق و باقەکانی ئەو زمانەن
لە ڕواڵەت زیاتری نەخوێندۆتەوە. ئەو
پەیڤانەی ترسیان لە نووکی ڕم و پەیکانی
ڕمەکاندا هێناو لە بێشکەو گزنگەوە چاوترسێنی
پرسیارەکانیان کردو گومانیان هەر لەناو سەردا کوشت.
من ئەم بەیانییە

لەم بەیانییە تازەیەوە
لەم هەسارە تازەیەوە
باڵندەکان منیان کردۆتەوە بە هێلانە
پرسیارەکان منیان کردۆتەوە بە مرۆڤ.
ڕووبارەکان منیان کردۆتەوە بە ئاوەڕۆ.
قەلەڕەشکەکەی هاوڕێم
جارێکی دی نایەتەوە  ناومان.
من ئێستا ئاو هاوڕێمە.
پەڕەسێلکەیەك هاودەم و
باخچەیەك هاوسەرمە
کە هەموو ڕەنگێکی لێ ئەزێ.
حەیف بۆ هاوڕێکەم. حەیف بۆ ڕەشبوونەوەی!
ئێستا خۆشەویستی من و ئەم شارە
لە لێبوردن و گونجاندنەوە
سەرچاوە ئەگرێ. لەم شارەدا
ئێستا هەر ڕیشێك بەرێکی نەبێ و بەرێك نەدات
ئەخرێنە تەنەکەی خۆڵەوە.
خۆشەویستی ناگوێزرێتەوە و هاوردە ناکرێ.
هەزار ڕەنگی هەق خوازیی هەن
هەزار بۆنی نوێخوازی هەن و
نە ڕەنگێك سەرداری هەتاهەتایی و
نە دەنگێك پەیڤی هەتاهەتایی!.

ڕەشەباکانیش لێرەبن یان لەهەر شوێنێ
ناچارن. ناچار. دوای ئەو بوومەلەرزەیە
یان ئەبێ سەرکزکەن. یان خاو بنەوە و
لە بەردەمی ناسکترین گوڵدا
بنووشتێنەوە!
لەم ساتەوەختەدا و لە دەفتەرەکەمدا
(با)یەکی شینی هێواش هەڵیکردووە.
سەرانسەری بوونم. سەرانسەری خەیاڵم
لە دەشتێکی کەسکی ڕاکشاو ئەچن. ڕاکشاو
لەبەردەمی ڕیزە چیایەکی بلووریندا،.
سەری ئەم(با) شینە، پەپوولە
دەوری گرتووە. من ئێستا چاوم لێیە وشەکان
یەك لە دوای یەك ئەتروکێن و ئەبن بە زنە یان
وەنەوشە لە دەفتەرما، ئەمە کەرنەڤاڵی
هەموو ڕاستیەکانە. کەرنەڤاڵی هەموو خەونەکان و
شارەکانە. ئەم کەرنەڤاڵەی ئەمڕۆ، لە یادی
تیرۆرکردنی قەسیدەیەکدا ڕێکخراوە کە لە بەیانییەکی
دووری  وەك ئەمڕۆدا.
ڕەشەبا ڕیشەکێشی کرد.
قەسیدەیەك کە لە بەیانییەکی دووری وەك ئەمڕۆدا
خەریکی ئەوەبوو بەسەر قەلأی هەولێردا هەڵگەڕێ و
پەیامی بوومەلەرزەیەك ڕابگەیەنێ، لەو بەیانییەدا،

لە پشتەوە پێکراو قەسیدە خلّتانی مانای خۆی بوو
خلّتانی خەیاڵی و خلّتانی خوێنی وشە بوو.
ئەم کەرنەڤاڵە لە یادی هاوارێکدایە
کە هێشتا سەرەتای شەقژنی بوو، ئەو هاوارەی،
کە لە یەکەم کۆلاّنی تاریکی ئەو قەلاّیەدا کوژرا!
ئەم کەرنەڤاڵە بە یادی هەموو ئەو ڕەنگانەیە کە لەبەر
جودایی ڕەنگ تەفروتونا کران. ئەم بەیانییە
لەم کەرنەڤاڵەدا قژی هەموو قوربانییەکانمان
کردووە بە پەنجەرەی ژوورەکانمانەوە.
قژەکان داگیرساون.
قژەکان لە پاڵ لاولاودا ئەڕوێنەوە!
هەر بۆ ئەوەی بەردەوام سەری ئەوان
لە ناخدا بجریوێنن و بیرنەچنەوە.
ئەم کەرنەڤاڵی خۆگۆڕینە
بەو دەمامکانەوە یاد ئەکرێنەوە
کە نیشانەی پەیمان تازە کردنەوەن
لە نێوان ئەم بەیانیە و هەموو مرۆڤەکان و
هەموو ئاژەڵەکان و هەموو باڵندەکاندا.
دەمامکەکەی لە سەرم هەڵکێشاوە
سەری ئاسکێکە
کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەو پێدەشتە جوانانەدا
ئاوێنە بوون بۆ عەشق و

هەر لە بەر عەشقیش سەربڕڕان!
کەرنەڤاڵی دەمامکە
ئەم دەمامکەیشیان.. سەرو ڕوخساری ئەو کچەیە
ئەو حەرامەیە.. بەسەر حەرامێکدا بازیدا و
لە دواییدا حەلاڵێکی ڕیش درێژ گرتی و لە پەنا
دیواری مزگەوتێکدا بێ بنی کرد! ئەمە بۆ یادی
ئەو حەرام و حەلاڵەیە.. کەرنەڤاڵ ئەخایێنێ و شەو دادێت!
لەشەودا بە بەیانییەکانی خۆمدا ئەچمەوە! من شەوم
ئەوەندە خۆش ئەوێ تا ئەمداتە دەست ئەستێرە
مێیەکان و لەگەڵیاندا ئازادانە جووت ئەبم! لە شەودا
بە خەوشەکانی ڕووناکیدا ئەچمەوە. هەندێکیان لە
دەفتەرەکەمدا ئەسڕمەوە هەندێکیان بۆ پەندو
عیبرەت ئەهێڵمەوە، بۆ ئەوەی شایەتی سەعاتەکانی
ڕابوردووم بن. لە شەودا پەردەیەك لە نێوان من و
گەردوون و خوداو هەموو عەشقەکاندا نامێنێ. سەربەستانە
خۆم ئەکەم بە ماڵی هەموو حەرام و حەلاڵێکدا، نەترسانە
لە بەردەم هەموو ئەو پرسیارانەدا ئەوەستم کە ڕەنگە هەر
لە زاری بەیانییە خەساوەکانی خۆمەوە، بەیانییەکانی جارانم،
شەرمەزارم بکەن، بەڵام ئەوەستم بۆ ئەوەی جوانتر لە
هەموو ڕاستییە جیاجیاکان وردبمەوە. بۆ بترسم! لە کاتێکدا

من هێشتا توانای ئەوەم هەبێ شتێك بگۆڕم.. شتێك

ئەگەر ئەوەندەی مێرووڵەیەکیش بچکۆلە بێت. خۆ من نەبووم
بە قەلەباچکە و زێوانی هیچ ڕەشەبایەك و هیچ تارمایی و
هیچ خواوەندێکی دەسەلاَت.. بۆ بترسم! لە وەختێکدا
کە من بزانم پاشەڕۆژ لەگەڵ ئەم یاخیبوونەی مندایە کە
بزانم نە هەڵقوڵێنم وشك ئەکاو نە بوومەتە بتەوان و
نە هیچ کام لەو ڕەشەباو بتانە ئەپەرستم!
بینابیم لە ئازارەکانی خۆمدا ڕوون بووەوە.
بینابیم دوو باڵندەی ئەزموونی لەشمن.
کەرنەڤاڵی دەمامکە.
دەمامکەکەی دەم و چاوم
سەری تەوارێکە..
کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئاسماندا
مێیەکی بە شکۆ بوو. ژنە باڵندەیەك بوو
بەلاَم بە گەردنی منارەیەکەوە فاقەیان بۆ داناو
گرتیان و لە جەژنی قورباندا سەریان بڕی.
ئێمە بە یادی ئەو عەشقانەوە
میوانداریمان لەم کەرنەڤاڵە کردووە و
ئێمە بە یادی ئەو تەوارەوە
وا خەریکین فڕینێکی تازە ئەفڕین..

2002/2/24

# ڕۆژی ژن..
# ڕۆژی گوڵەبەڕۆژەکان!

من ئەمڕۆ لە تەوقەسەری ئەم یادەدا
لە تەوقەسەری بە گیاو گوڵ و
بە پەپوولە تەنراوی ئەم جەژنەدا
مۆمی خۆشەویستیەکی نازدار
نازدارتر لە کچە پچکۆلانەکەم و
نازدارتر لە یادگاری
مێخەك بەندەکەی دایە خانم..
دائەگیرسێنم!
مۆمێك بە قەد بەژنی دایکم!
ئەوەندەی ڕۆحی ئەویش سپی و بێگەرد.
ئەوەندەی شەوقی پەیڤ و قسە خۆشەکانیشی گەش!
مۆمێك لە شیعرا دائەگیرسێنم..
مۆمێك لە زمانی کوردیدا..
مۆمێك لە عەشقاو.
مۆمێك لە خەمەکانتاندا..

**من ئەم ڕۆژەم**

**بە قەد کیژۆڵەیەکی جوانکیلەی خوێن گەرم و**

**بەلاّم چاو غەمگینی گەڕەکی ڕەحیم ئاوای**

**کەرکوك و ئەوەندەی ژنە نان کەرێکی دەست و پل**

**بلۆق کردووی گەڕەکی خانووە قوڕەکانی**

**ئێرەیش خۆش ئەویٚ!**

**ئێوە نازانن من ئەم ڕۆژەم چەندە  خۆش ئەویٚ؟!**

**نازانن لە چاوەڕوانی ئەودا..**

**چۆن  وەك گوڵ خەندەران ئەتریقێمەوەو**

**کە هات وەکوو لاولاو تێی ئەئاڵێم و**

**چون گوڵەنازەنینێکی**

**بەردەم شنەبای کۆسارێ سەما ئەکەم و**

**چون دڵۆپەکانی شەونمیش**

**لە سینەو بەرۆکیا ئەتوێمەوە!**

**من ئەم یادەم کردووە بە گوڵەبەڕۆژەیەکی گەورە و**

**گوڵەبەڕۆژەیش لەگەڵ چاوەکانی ئەودا ئەسوڕێتەوە!**

**من ئەم یادە ئەگرمەوە.. ئەیکەم بە خەنەو**

**لە دەست و پل و قاچ و قولی هەشتی مارتی ئەدەم و**

**ئەیکەم بە تریفە و لە ئاوی تریفەی ئەخۆمەوە!**

**ئەمڕۆ من ناوم**

**"شێرکۆ شەفیقە" یە!!**

**تکایە با لەم یادەدا گوڵ و وشەو**

بازن و موستیله و گەردانەکانی ژنان
هەر بەو ناوەوە بانگم بکەن  و لە دەفتەری
خۆشەویستی خۆشیاندا هەر بەو ناوەوە
بمخوێننەوە و بمنووسنەوە.
ئەم ڕۆژە دایکمە..
بە کۆڵوانەیەکی مۆرو
سرکەییەکی گوڵ گوڵی و
لاگیرەیەکی کەمێ شۆڕەوە!.
ئەم ڕۆژە دایکمە..
بە قسەی دانار داناری و
دایکمە بە ئارەقەی شین و مۆری ڕەنجە وە و
دایکمە بە گوڵە هێرۆیەکی ناو ئەگریجەوە و
دایکمە  وەختێ هەشت جار هەشت چرا
لەم شەودا دائەگیرسێنێ و
هەشت یاقوت ئەدا
لە قژی هەشت گۆرانیی و
هەشت کەڕەتیش
لەسەر لاپەڕە کەسکەکانی پێدەشتێ
بە قەڵەمی تریفە و یان بە چوکڵەی گزنگ
ناوی پیرۆزی"ژن" ئەنووسێ!.
با ئەم ڕۆژە پرچ درێژو مل کەڵە
بکەین بە ڕۆژی شارە پریشکی پرسیار و

ئەشكەنجەی ژن و هاواری ژن و هەقی ژن و
دەنگی ژنی تیا بوروژێنین!
با شارە پڕیشكی پرسیار بەهەر چوار لادا
پزیزكەكانی كەڵە وشە بهاوێ
لێنەگەڕێ.. زوڵم هەروا سانا دانیشێ
لێنەگەڕێ.. قریشكەی جەستە خاوبێتەوە
لێنگەڕێ.. پیاوی هۆزی تۆڵە و فەتوا..
بەو خوێنەی لەبەر
دار گێلاسەكانی لەشی ژن ئەڕوا
دەس نوێژ هەڵگرێ و
پرسیار و پرسیار و پرسیار
لە تەرازووە لاسەنگەكەی دادگا
لاسەنگ بە یەك لەسەر سێ و
لاسەنگ بە یەك سمێڵ و چوار ژن و
پرسیار.. لە بڕبەندەكانی یاسا
لە تەزبیحی دەنك گەورەی
بریقەداری ئاڵاو لە خەنجەری بەر قەد..
پرسیار پرسیار.. لەو دەقانەی
كە شیشی پەنجەرەكانی زیندانی
گیان و جەستەی ژنیان لێ دروستكراوە
پرسیار لەو قانونییە ئاسەنگەرانەی
بڕگەیان كردووە بە كۆت و

مۆڵەتیان داوە بە مردن
مۆڵەتیان داوە بە کوشتن
هەموو ئاسمانیان داوە بە پیاو و
هەموو زەمینیان داوە بە پیاو و
تەنها کولانەیەك بە ژن!
من ئەمڕۆ سەرلە نوێ
چرکەو دەقیقەو سەعاتی ئەم ڕۆژە
لە دەربەندەکەی ڕانییەدا هەڵئەشێلمەوە.
لەم هەویرە نوێیە.. لەم هەویری ئازادییە
گەورەترین نانی خۆشەویستیی.. بۆ ژن لێدروست ئەکەم.
لە ئاگری ئەو ئازارانەیشدا ئەیبرژێنم..
کە ساڵەهایە جەستەو ڕۆحی ژنی تیا ئەسووتێ..
ساڵەهاو ساڵەهایە..
قرچە قرچ و قرچە قرچ..
ڕەنگ و دەنگ و هەست و نەست و
چرپە و عەشق و پێکەنین و
پەپوولەکانی ئەوین و
کۆترەکانی سینەی ئەوانی تیا هەڵ ئەقرچێ..
لەم هەویری ڕووناکییە..
لەم هەڵ شێلانەوەی مێژووە
لەم ڕووباری مانگەشەوە
گوڵەژن دروست ئەکەم..

لەسەر بۆنی دزراوی ڕاپەڕێ
درەختە ژن ئەخولقێنم..
لەسەر مەلی کوژراوی ڕاپەڕێ
قەڵەمەژن دروست ئەکەم..
لەسەر وشەی دیلکراوی ڕاپەڕێ
زریانە ژنیش ئەخولقێنم..
لەسەر هەتاوی دزراوی و
لەسەر بارانی دزراوی و
لەسەر وجودی دزراوی
ڕاپەڕێ
ئەمڕۆ بۆنی هەق لەم ڕۆژە دێت.
ئەمڕۆ بۆنی دڵداران و بۆنی شیعری وەنەوشەیی و
بۆنی مامز لەم ڕۆژە دێت.
بۆنی گڵەسووری دوای وردە باران.. لەم ڕۆژە دێت.
بۆنی سمڵ و بۆنی ڕەشەڕێحانەو
بۆنی ئازادیی لەم ڕۆژە دێت!
من ئەم ڕۆژەم لە ئاوێنەی بیرەوەریدا
کردووە بە ورشەو پرشەی گوڵ ئەستێرەیەك و
لە بەرچاوم بزر نابێ.
هەروەکوو چۆن هەر دوو سنەوبەرم
لە پێش چاو ون نابێ..
سنەوبەری باخچە و شەقام و کەژەکانمان و

ئینجا ئەو ژنە سنەوبەرەیش
کە لە زەمانێکی بێ ڕەنگدا
قەڵادزێی ئاڵ هەڵگەڕان!
ئەز لەم ڕۆژەدا هەر شیعرە مێینەکان ئەخوێنمەوە.
هەر ڕەنگە مێینەکانیش ئەپۆشم.
بەقەڵەمێکی ناسکی مێینەیش ئەنووسم.
من ئەمڕۆ هەوڵ ئەدەم بچمە ناو قوڵایی
ئازارە مێینەکانەوە لەگەڵ زەردەی خۆرنشینی
خەمەکانیاندا بدوێم. هەوڵ ئەدەم بچمە ناو
ساتە ژانی منداڵبوونی ژنەکەمەوە.
هەوڵ ئەدەم شانۆنامەیەکم
بکەم بە بێوەژنێکی ئەنفال.
بە ژنە هەڵەبجەییەکی ڕۆژی 3/16
بەقیژەی دایکێکی خێڵی حەمە.
هەوڵ ئەدەم بگەمە
ئەوپەڕی دنیای ژنان و
لە ئەمەریکای لاتینەوە بۆ ئەفریقا،
فرمێسکەکانی ئەوان کۆبکەمەوە و
دەریاچەیەك
پەخشانیان لێ دروست بکەم!
هەوڵ ئەدەم زریکەکانیان بکەمە
پەیکەرێکی بەرجەستە و

لەناو ژوورەکەمدا دایبنێم..
هەوڵ ئەدەم مەملەکەتێ بخوڵقێنم
لە ژنە شاوە تا گەدا لە خۆیان بێ!.
من ئەمڕۆ بەیانیی کە لە خەو هەستام
یەکەمجار
چوومە ناو باخچە مێیەکەمەوە..
یەکەمجار ڕۆژباشم لە بولبولێکی مێ کرد
لە دواییشدا من بۆم خوێندوو
ئەو گوێی گرت!
من لەم ڕۆژەدا هەموو کێژۆڵە بچکۆلەکان کۆئەکەمەوە
بۆ ئەوەی وانەیەکیان پێ بڵێمەوە
وانەی خوێن لێ چۆڕاوی
ئەو زوڵمانەی لە ڕەگەزەکەیان کراوە..
وانەی ئەو سێوە لاسورانەی
لە دەمێکەوە نیوەیان خوراوە.
وانەی ئەو تەیرانەی ئاسمانیان لێ قەدەغەکراوە.
وانەی زوڵم..
زوڵمی پیاوە بەردینەکان.
یاسا ئاسنینەکان،
زوڵمی مێژووی چەقۆ..
مێژووی جەڵدە
باسی دەم بەستن و ڕەنگ کوشتن و

به درێژیش باسی بەندیخانەی جەستە و
عەقڵەکانی خەڵووزان و شەوەزەنگی پەچە و
لە دواییشدا باسی عەقڵی
چراخانی قاسم ئەمین و بێکەس و ئیبراهیم ئەحمەد و
بە درێژیش باسی
لەیلا زانایان بۆ ئەکەم!.
ئەو کیژۆڵانە فێرئەکەم
هەتاو بخوێننەوە هەتاو
وەختێ هەتاو ئەبێ
بە ڕەنگی ئازادیی.. هەتاو
وەختێ ئەبێ بە ئەنجێلاو بە مارییا و
وەختێ ئەبی بە بەیانیی بۆ هەڵفڕین
فێریان ئەکەم چیتر بە جێ پێی
تارمایی و ئەرژەنگەکانی نەریت و
خەنجەرەکانی تۆڵەدا هەرگیز نەڕۆن.
فێریان ئەکەم لە تەوار بچن.
لە سروودە جوانەکان و
لە شیعری یاخیی بچن.
من ئەمرۆ 3/8 پێشانگەیەك لە گەلەری
دڵما ئەکەمەوە. پێشانگایەك تایبەت بەو
وێنە فۆتۆگرافیە ڕەش و سپیانەی مێن.
بە پۆرتەریتی کۆمەڵێ لەو ژنە ڕێچکە شکێنانەی

کە زەمانی پیاویان لەرزاند و
دیواری بێ دەنگییان ڕوخاند و
سەروپرچیان داگیرسان و
بوونە مەشخەڵی ڕێگەوبان.
پێشانگەیەك لە گەلەری دڵما
پێشانگایەکی گەڕۆك
پێشانگەیەکی بێ ڕیش و سمێڵ.
گەلەریەك لە دڵما
چوومە هەر شوێنی بەرامبەر خۆر ئەوەستم
هەر چوار دەرگای گەلەریەکە ئەکەمەوە
ئەیانخەمە سەرگازی پشت..
تا زۆرترین ژمارەی بینەرانیان لێوە بێنە ژووری.
پێشانگایەك بۆ خولیا سەردەق شکێنەکان
بۆ ژنان لە دۆزەخدا.. دۆزەخی پیاو
بۆ ژنان لە یاسادا.. یاسای پیاو و یاسای
قامچی. بۆ ژنان لە قەفەزدا . قەفەزی ماڵ و
قەفەزی وڵات و قەفەزی لەش!.
پێشانگایەك لە ساڵۆنەکانی دڵما
دە فەرموون بۆ دانیشتوون
ئێوەیش هەستن  و لەهەر چوار دەرگای
ئەم گەلەریە تازەیەوە وەرنە ژووری!.
تا وێنەی ئەو ژنانە ببینن

که له پەچەوە تا پەنجەی پێ..
بوون بە درەختی ئاگرو
بوون بە شەتاوی ئاگرو
هەستانە پێ!.
ئەز ئەمڕۆ سێ بۆینباخم ئامادە کردووە
هەر یەکەو ڕەنگێ.. ڕەش و زەرد و سپی
هەر یەکەیان بۆ ماوەی یەك سەعات ئەبەستم
ڕەشەکەیان لەبەر هەموو
ژنە دار ئەبەنووسەکانی دنیا
زەردەکەیان لەبەر هەموو
ژنە دار لیمۆکانی دنیا
سپیەکەشیان لەبەر هەموو ژنە
پێست بەفرینەکانی دنیا
هەر بۆینباخەو بۆ یەك سەعات
ئەشێ ڕەشەکەیشیان بەیادی هەموو
ئەو ژنە باڵندانەیش ببەستم
کە بە ئاسمانەوە کوژران و
لە دواییدا بوونە ڕەژوو.
زەردەکەیان بە یادی ژنە کۆیلەکان و نامۆکان.
سپیەکەشیان بۆ ئاشتی و ژنە دڵدار و
ژنە ڕووناکیی و گوڵی سپیی بەرباران،
من ئەمڕۆ کورتیلە چیرۆکێکتان

**دەربارەی دوو ژن بۆ ئەگێڕمەوە:**

**ژنێك هەبوو هەر خاوەنی چرای جوانیی لەش بوو.**

**ژنێکی دی هەبوو، جوان نەبوو، هەر خاوەنی**

**چرای عەقڵێکی گەش گەش بوو.**

**کە یەکەم کەوتە گەلاڕێزان و ناو تەمتومان،**

**تەمەن تاریکیی کرد.. چراکەیشی کوژایەوە.**

**دووەمیان ئەویش گەیشتە گەلاڕێزان،**

**بەلاّم چرای نەکوژایەوە..**

**دووەمیان دەستی یەکەمی لە تاریکیدا ئەگرت و**

**هەر لەبەر ئەو چرایەیشدا..**

**بەیەکەوە**

**بەهاری ڕابوردووی خۆیان.. ئەخوێندەوە!**

**ئەمڕۆ هەر کە ئێوارە هات و**

**بە جلەڕەشەکانیەوە گەیشتە کۆلاّنەکان و**

**سەرشەقام و بەردەم مالاّن.**

**ئیتر بە خۆم و پەردەیەکی سپیی سینەما و**

**ئامێر و سەدان سلایدەوە**

**ئەچمە ناو گەڕەکە ماندووەکانی شارەوە.**

**ئەو گەڕەکانەی کە پیاوەکانیان**

**بۆنی هەژارییەکی شێدارو**

**بۆنی تەڕە پیازو**

**بۆنی دووکەڵی جگەرەی قامیشیان لێدێت و**

**ژنەکانیان بۆنی دڵپاکییەکی ساکارو**

**بۆنی سێوی بن عەرد و**

**پونگەیان لێدێت و**

**منداڵەکانیشیان بۆنی شەمامەی خۆڵاویی..**

**ئەچم و لەسەر ئەو پەردەیە**

**ئەو سلایدە ڕەنگا و ڕەنگانەیان نیشان ئەدەم**

**کە مێژووی کوتەك و دارو**

**جەڵدەی تەرخان بۆ لەشی ژنان ئەگێڕنەوە..**

**مێژووی ئەو قامچیانەی**

**کە پیاو لە چەرمی جەستەی ئەوان دروستی کردن.**

**مێژووی باوکانی چەقۆ،**

**مێژووی برایانی ناو جەنگەڵی تۆڵە.**

**یەکەیەکە ئەو سلایدانەیان نیشان ئەدەم:**

**سلایدی تایبەت**

**بە لووتە بڕراوەکانی ژن.**

**سلایدی تایبەت بە زیندانیی کردنی ژن**

**لە کونە حەمامی ماڵدا.**

**سلایدی تایبەت**

**بەو ژنانەی کە بوون بە خەڵووز ئینجا کوژانەوە.**

**سلایدی تایبەت بە دەم درونیان.**

**بە کوێرکردنیان بە کەڕکردنیان و**

**سلایدو سلایدو سلاید**

خوێن و ژن و ژن و خوێن و

ڕووباری زریکەی دوورو درێژ!

من ئەمشەو ئەو ئازارە ئەکەم بە چراوگ و

ئەیدەمە دەست ژن بۆ ڕاپەڕین.

من ئەمشەو ئەو هەقە نیوە خوراوە،

ئەو هەقە زنجیرکراوە،

ڕائەچڵەکێنم با بە خوێنەوە

بەر دەرگای ڕیش و سمێڵ و

خەنجەری بەر پشتێن و

هۆزی نێو ئەم جەنگەڵە بگرێ.

هەشتی مارت: جەژنێك

کە هێشتا دووکەڵ لە پژوپۆی هەڵئەسێ!

جەژنێك کە هێشتا

پرشنگەکانی ئەکوژرێ و

جەژنێك هۆن هۆن گوڵە

فرمێسك هەڵئەڕێژێ!..

هەشتی مارت..

ئاوڕدانەوەی بڵێسەیەکە لە خۆڵەمێشی ژن.

ئاوڕدانەوەی زەنگێکە

لەو بێدەنگییەی کە ئەبێ

بە پڕاوپڕی ڕاستی بزرنگێتەوە.

با لەماڵەکانمانەوە پەنجەرە

بۆ ئەو هەقە بکەینەوە، با لە سەرمانەوە،
لە یەکەم هەنگاوی
حەرفە بچکۆلەکانی قوتابخانەوە.
لە ئەلف و بێ وە،
مۆمەکانی
هەشتی مارت داگیرسێنین و
بەر لە هەمووانیش
سەری ژن خۆی،
دەنگی ژن خۆی،
زامی ژن خۆی،
قەتارە ببەستن و ترس ڕاونێن و
بێدەنگیی وەك پەچە بسوتێنن و
سەربەرزانە
وەك ئاوێنەی بەرهەتاو بریسکێنەوە!
من ئەمشەو درەنگانێ..
کە سەعات ئەکەوێتە وەنەوزدان و
ئەو وەختەی هەمووتان ئەنوون..
گڕی چرای سەرم خۆشتر ئەکەم و
بیرئەکەمەوە لەوەی چۆن سالێکی دی
جگە لە هەشتی مارت
ڕۆژێکی تر بە نێوی(ڕۆژی ژنی کورد)ەوە
بکەوێتە نێو ڕۆژ ژمێرەکەی سالمەوە و..

لەمشەوەوە درەنگانێ بۆ ئەو ڕۆژە
پەخشانێ بکەم بە دەشت و
چاوی ژنی ئەم وڵاتەیش
بە چراکانی دواڕۆژو
بە بەرایی زەردەخەنەی
هەزاران گوڵەبەڕۆژە!

2002/2/18

# مردن به جلکی سەربازییەوە!

مردن خۆی گۆڕیبوو، مردن
بەجلکی سەربازییەوە، پۆشتەو پەرداخ
بە هەموو نەجمەو  نیشانەو نۆطە کانیەوە
بە کۆلاّنێکی نەخۆشی پایتەختا ڕەت ئەبوو.
منداڵێك پیایدا هەڵڕوانی و هەر هەڵیڕوانی و
لەپڕ هاواری کرد:
"ئەوە مردنە! ئەوە ئەو پیاوە بوو
کە باوکمی کوشت!"
کەس گوێی لێ نەگرت کەس
مەرگ ڕەتبوو!.
هێندەی نەبرد لە کۆلاّنەکەی پشتەوە
قیژە لە ماڵێکی قوڕین هەستا
قیژە لە تاقە درەختی حەوشەکەیان و
زریکە لە تاقە پەنجەرەیان و
هاوار لە دەرگا کورتە بالاّکەیان هەستا!
لەو ماڵەدا لاوێکی باریك

باریك چون دەزوولەكانی خەم و
باریك چون خەیاڵی گیاو
ڕەنگیشی كت ومت وەك زەردەپەڕ.
پێچایانەوە و لە ماشێنێكی زیرەییان
ئاخنی و بردیان.
وتیان كۆمەڵە پیاوێ بوون
بە جلكی سەربازییەوە
وتیان: نیوەی لەشیان لە چەقەڵ بووە و
نیوەكەی تریان لە ئادەمیی!.
وتیان: یەكێكیان لە پێشەوە ئەڕۆیشت
لە هەموویان ڕەشتر، لە هەموویان گرژتر..
وتیان: ئەوە ئەو پیاوە بوو
كە لە كۆڵانەكەی ئەودیو
منداڵەكە ناسیبوویەوە و
هاواری كردبوو:
"ئەوە مردنە! ئەوە ئەو پیاوە بوو
كە باوكمی كوشت!"

2002/2/15

# مەرگی گۆرانییەکی سپیی

بۆ فادیمە شاهیندال

لەو ئێوارە سپییەدا، سپییەکی غەمگین،
سپییەکی سارد سارد.. ساردتر لە تەنیایی تاراوگە و،
ساردتر لە جێ نسێی سالآنی تەمەنی بە شەختەبووی
دوورە ولآتی و.. ساردتریش لە مەوسیمی
جودایی ئاشقان و کۆچی ناوەخت و زەمانی لێکدابڕین!.
لەو ئێوارە سپییەدا، سپییەکی غەمگین..
لەساتەوەختی زەردەپەڕێکی بەحاڵ نووزە تیاماوی
ئێوارەی ئەو شارەدا، لە ئێوارەیەکی لێو لەرزۆکی
تەزیودا، تەزیوتر لە پەڕوباڵی زوقم گرتووی
نەورەسە باریکەکانی کەنار ئاوی شەپۆل لەگۆ کەوتووی
بەر سایەو سێبەری ئاویلکەی خۆرنشین..
لەو بوولێڵە بەفرینەدا
لەو ئێوارە خەمبارەدا
کە توێژاڵێ لە تەم و مژی کورتە بالآی
درێژ درێژ ئەکردەوە تا ئەوپەڕی ئاوێنە دەشتی
ئۆپسالاو تا ئەو شوێنەی هەتەر ئەکا بینین.

لەو ئێوارە سەرسوڕماوو لەو ئێوارە واق وڕەدا،
کە کت و مت لە ژنێکی باریکەلەی ڕەنگ پەڕیوی
مل بە کوێنی کۆستێ ئەچوو.. چون دارسێوێ،
دەمی چووبێتە کلیلەی دوای داڕنین و هەڵوەرین..
لەو ئێوارە ترساوەدا
لەو شارەدا
کە هەر لە کۆترێکی سپیی
زارە تریك بووی بەردەم چەقۆیەك
ئەچوو وەختی سەربڕین!
لەو ئێوارە سپییەدا
سپییەکی غەمگین غەمگین
غەمگینتر لە ئێوارە کوژراوەکەی
سفێ ڤێگنی پێش بیست و شەش ساڵ و
غەمگینتر لە شیعری ناو قەفەزی مەنفا و
غەمگینتر لە مەلێکی جووت کوژراوی،
بێ نەوازو لانەوازی فەسڵی ئەوین!
لەو ئێوارە سپییەدا
لەگەڵ لێدان و زرنگانەوەی زەنگی
کلێسە سووورباو و عومر درێژەکانی"ئۆپسالا"دا
لە ناکاو
پەڵە خوێنێکی دەم بە هالاوی تازە ڕژاو
لە بەردەم ماڵە پەپوی باوکێکی شوومدا

**خۆی گرد کردەوە  و خۆی لوولدا و خۆی هەڵپێچاو**

**ئینجا باڵەکانی کردەوە و بەرە و قوببەی ئاسمانی**

**خۆڵەمێشی ئەو شارە بەرە و بەرزاییەکانی**

**ڕۆحی سپیی و فریشتەی سپیی و خەونی سپیی،**

**کەوتە شەقژن و فڕین.**

**"ئەرێ ئەوە دار هەنارێکی ئامەد بوو**

**وا باڵی گرت؟!**

**یان ئەستێرکێکی یاقوتیین؟!**

**ئەرێ ئەوە گوڵجاڕێکی گوڵاڵە بوو**

**لە پێدەشتی زامەکانی هەکارەوە**

**بەرزبۆوە و بەسەرماندا تیژ تێپەڕی؟!**

**یان کانیەکەی عاشقانی هەڵەبجەبوو**

**زریکانی و ئاڵ هەڵگەڕاو کشاوکشاو**

**دوور دوور فڕی؟!"**

**بینییان.. لەو ئێوارە سپییەدا.. بینییان..**

**بەڵام پێش هەمووان.. کیژۆڵەیەکی کراس سپیی بینی:**

**وا فەنەرێکی سووری داگیرساو**

**لەشێوەی سەری بڕڕاوی مامزێکدا**

**بە بریسکە بریسك و.. چریسکە چریسکەوە**

**لەرزانە لەرزانە.. هێدی هێدی.. پزیزك هاوێژ،**

**بە دەوری سەری وڕی ئۆپسالادا کەوتە خولخواردن ئەیانبینی: سەری بڕراوی مامز،**

هەڵئەکشاو بەرز بەرز ئەبۆوە تا ئەچووە هەناوی
سپیی گەواڵە هەورەکانەوە و لەوێ ئەبوو
بە مانگێکی سووری چواردەی عەشق و ئەوین!
ئەیانبینی: جارێکی دی نزم نزم ئەبۆوە
تا ئەو ئاستەی خاچی تەوقە سەری
کڵێسەی کەمێ خوێناویی ئەکردو
نزم نزم ئەبووە تا ئەو ئاستەی
گوێی لێ ئەبوو: چۆن پڕوپۆی شڵەژاوی
دارستان و، شووشەی پەنجەرەی ماڵان و،
شەقامەکان.. بێدەنگ بێدەنگ هەموو
وەکوو بەفر ئەگرین!.

سەری بڕاوی مامز.. سەری بڕاوی شیعر بوو،
سەری بڕاوی عەشق بوو.. بەکاوخۆ بەدەوری
سەری ئۆپسالاو ماڵاندا ئەسووڕایەوە..
ژمارەی کەڕەتەکانی خولخواردن، بەقەد ژمارەی
ساڵانی تەمەنی مامزی قوربانیی بوون.. تەمەنی:
بیست و شەش دار ئەرخەوان
بیست و شەش مۆمی پەمەیی
بیست و شەش گوڵەباخی سپیی
سەری بڕاوی مامز
لە ئاسمانی "ئۆپسالا"دا دەورانی بوو

گوێیان لێبوو..
بیست و شەش جار بارژنی کردو قیژەی بارژن..
لە دڵی شارداو لە دڵی دنیاداو
تا لە دڵی خوایشدا دەنگی دایەوە.. چاویان لێبوو
بیست و شەش جار.. بەناو ڕەنگەکانی ترسدا.. بەناو مەرگاو
بازڕەقەی بەست و.. بەسەر تخووبی ئاگردا بازی ئەدا
چاویان لێبوو.. بیست و شەش جار، لە کالانەی چاوەوە،
بیست و شەش یاقووتی بۆ عاشقان هەڵدایە خوارەوە.
سەری بڕراوی ئاسك.. بەردەوام ئەسوڕایەوە
لە خوارەوە نەورەسەکان سەریان هەڵبڕی و
بە بەفریان وت: تەماشاکە!
ئەوە سەری مانگەشەوی فادیمەیە
بەگەردنی ئاسمانەوە!

لەخوارەوە.. لەسەر جادەو، لەبەر پەنجەرەی ماڵانداو،
لە یاریگەو باخچەکاندا.. کیژۆڵە بچکۆلەکان بە
چۆلەکەکان و کەروێشکە سپییەکان و بووکە شووشەکانی
ناو باوەشیان وت: تەماشاکەن
سەرهەڵبڕن.. ئەو ئاسکە بە ورشەو پرشەیە
ئەوە فادیمەیە خۆی گۆڕیوەو لە گوڵە هێرۆ
کراسی بۆ خۆی کردوە و ئێستا چۆتە ئاسمانەوە!
کیژۆڵەکان ئەیان وت.. ها.. ها.. ها

**ئا ئەوەیان کەژاوەی پەپوولەکانێتی.. لە پێشەوە ئەڕوا..**
**ئەوانەی لای ڕاست.. گوارەکانێتی و**
**ئەوانەی لای چەپ.. ملوانکەکانی و**
**ها.. ها.. ها.. ئەو شتانەی دامێنیش**
**کتێبەکانی و کراسەکانی و سێدێکانی و**
**ڕەفتەکانین.. بە ئاسمانەوە!**

**لەخوارەوە. سنەوبەری هەموو دارستانەکانیش**
**پێکەوە چاوە سەوزەکانیان هەڵبڕی و بەباڵندەکانیان وت**
**ئەوە بەهارێکی کوژراوی ئێمەیە چۆتە هەورەوە.**
**ئەوە مێرگێکی سووری ئێمەیەو**
**وا لەبەر باران ئەبریسکێتەوە.**
**ئەوە گۆرانییەکی نارنجیی ئێمەیەو ئاوارەیە.**
**ئەوە کچی گۆمێکی ئێمە بوو چوە ئاسمان!**
**لەشاریشدا**
**بورجە چاو تەڕەکەی مەسیح.. قوللە غەمگینەکەی**
**کاتدرایەکەی ئۆپسالاش لەگەڵ سەرهەڵبڕینێکی**
**هێواشدا، بە هەردوو دەست خاچێکی زیوینی**
**برینداری بەرزکردەوە و بە**
**مریەم و بە سڤاریا و بەدنیای وت:**
**ئەوە پەرییەکی نازداری خودایە**
**بووە بە گوڵەباخی هەتاوو چۆتە ناو ئاسمانەوە.**

ئەوە تاڤگەی غەدرێکە لەسەر زەمینەوە

ڕووەو ئاسمان هەڵچووەو هەڵچووە

ئەوە.. مۆمی سەری ساڵە.

بەفرە ئەو وەختەی ئەکوژرێ.

عەشقە ئەو وەختەی ئەسووتێ و

زوڵمە وەختێ دائەگیرسێ

ئەوە سەری فادیمەیە

پرچی ئەوە بە خوێنەوە سەمائەکاو

پێی ئەنووسێ.

غەدر.. غەدر.. غەدر..

لێرەیش شیعرێکی شەلاڵی ئارەقەی شەرمی

شین و مۆری منیش

سەری هەڵبڕی و بە من و بە گشت باوکانی چەقۆی وت:

ئەوە پەڵە عاری ئێمەیە گەیشتۆتە ئاسمان.

ئەوە خەنجەرەکانی تاریکیی و وەسیەتنامەکانی

خێڵی خوێن و جاڕنامەی نەنگیی ئێمەیە گەیشتۆتە

ئاسمان، گەیشتۆتە قوتبی ژوورو، گەیشتۆتە

هەموو جیهان.. ئەوانە قەمەکانی ناو چنگی

ئێمەن ئەبریقێنەوە.. ئەوە هەر سەری مانگە

شەوی فادیمە نییە ئەسووڕێتەوە.. لەم ئاسمانە

مسینەی ئێرەیشدا.. ئەوە کەپووی بڕراوی کەژاڵەو،

مەمکەکانی نیشتمانە و پەنجەکانی مەهابادەو هەردوو

**باسکی پەری خانن بە ئاسمانەوە.**
**ئەوە نەریتی قەتار بەستووی مێژووی ئێمەن**
**دێن و دەچن.. فیشکەکانی ناو عەقڵی بەردستانی**
**ئێمەن ئەبریسکێنەوە..**

**ئەی مانگەشەوە سوورە جوانەکەی سەرو گەردنی**
**فاتیمە بەردەوام خول بخۆ..**
**تۆ کوردستانێکی پچکۆلەی سەربڕاوی منی**
**بەئاسمانەوە.. خول بخۆ..**
**خول بخۆ بە دەوری غیرەتی ئێمەدا بۆ ئەوەی**
**هەمیشە لە بیرمان بێ.. لە کوشتاری**
**هەتاوو گوڵ و ژندا..**
**ئێمە چەند قارەمان و چەندە کوردو**
**چەند مرۆڤ بووین!**

**ئاوا مەبە.. کەژاوەی خوێناویی فادیمە.. ئاوا مەبە**
**با هەروا بەداگیرساوی خول بخۆی**
**بەداگیرساوی شەرمەزارمانکەی؟**
**با لەبەر باڵا ئاوێنەی خۆرنشینتا**
**لەبەر شەختەی سووری لەشتا**
**بە وردی سەیری ڕیش و سمێڵ و کەڵبەکانمانو**
**مێزەرەکانمان و ئینجا سەیری دەم و چاوی نوورانیی و**

بێ گوناهمان کەین!!
ئاوا مەبە.. چرای خوێناویی.. ئاوا مەبە
ئەی سەری بڕراوی حەیران..
ئەی سەری بڕراوی کەمان.. ئاوا مەبە
بەشکوو ئەمشەو لەبەر تریفەی کوژراوتا
لەبەر چل چرای نارنجیی
عەشقی پاکتا
قەسیدەیەك بۆ شەرمەزاریم بنووسم
چکەچکە نەفرەتی لێبچۆڕێتەوە..
چکە چکە عاری لێبچۆڕێتەوە..
هەتاکوو پەنگ ئەخواتەوەو وەکوو خم خۆرك
ڕامئەکێشێ و قووتم ئەدا..
ئاوا مەبە و بە داگیرساوی بگەڕێ و سەیرمانکەو
پیاوەتیمان بەشەوارەی سووری خوێن و چاوت بخە!
ئەی مەرگی گۆرانیی سپیی.. ئاخ فادیمە!
ئای کە ئەمشەو شەرمەزاریم سەرو
چاوم پێ دائەخاو پەیتا پەیتا بەڕەنگی عار
ڕەنگم ئەکا!!
منیش باوکم
چونکە لە هەمان نەژادو هەمان کیفی ئەو شمشێرەم..
چونکە لە هەمان ڕەگەز و هەمان مشتووی ئەو

**خەنجەرەم: کە بەهارو ستران و**

**پەپوولەو خۆشەویستیی و ئازادییان**

**لەتۆدا کوشت!**

سلێمانی
2002/2/7

# ڕازێك لەگەڵ "با"ی تشریندا

ئای "با"ی تشرین!
"با"ی سەرگەردان ومالۆێران!
ئەی دەستگرتوو بە کڵاوی کون کونی هەورو بەپرچە
درێژەکانی بارانەوە! بیگێڕەوە:
لەکام دەراڵی پایزی خۆشەویستی و
لەکام کاولاشی دابڕانەوە هاتوویت؟!
بەکام پلەو ملەی ڕژدو خزی تەماویدا هەڵگەڕایت و
هەڵزنایت و، چۆن گەیشتیتە بناری خەمی من؟!
چۆن گەیشتیتە لای سەرە ئاوارەکەم؟!
لای تەنیاییم؟
لای ئەم وشە چاوتەڕانەم؟!
لای ئەم مۆمە شپرزانەم؟!
ئای "با"ی تشرین!
بای پۆستەچی نێوان من و خەزانەکان!
بیگێڕەوە، با گوێڕایەڵی کزەکانت و سەرسامی بەردەم
شەونامەکانی غەریبیت بین. با ئاگامان لە تەم و مژی
کڕکەوتووی ئەو وێستگانە بێت کە لەم دنیادا

بەردەوام مەراق و ئەشکەنجە هەڵ ئەهێنن!. با
بزانین هەواڵەکانی ئاوی دەربەدەر چییەو با بزانین
کاولاشەکان دوا پەپوویان ناویان چییەو خۆڵ چی
ئەنووسێتەوەو بەردی خوێناویی کێ بە هانایەوە چووەو
تەیرە گومڕاکان ئێستا بەرەو کوێ لە سەفەردان؟!
ئەی (با)ی تشرین.. ئەبێ لادەیت!
لادەیتە لام.. لای ماڵە قوڕینەکانی دەڤەرەکەی منیش!
لای ئەو قاسپە کزانەی لە پێخەفی مەرگدا کەوتوون.
لای ڕۆژژمێری ئەو پەپوولانەی کە تەمەنیان هەرچەند چاو
تروکانێکە، هەرچەند هەناسەیەك و هەرچەند باڵ لێکدانێکە.
من وەك پیاوێکی ڕەنگ پەڕیو.. وەك پیاوێکی سەرمابردەڵەی
ناو کوختی تەنیایی.. بۆم هەیە ڕاتگرم و ئەو پرسیارانەت
لێبکەم، کە نەموێراوە لە خەڵکی تری بکەم. ئەو
پرسیارانەی ڕەجمیان لە دوایەو ئەو پرسیارانەی گومانی ڕەنگاو
ڕەنگ ئەچێنن و زریان ئەوروژێنن! من بۆم هەیە
وەك ژنێکی دەرکراو، شاربەدەرکراو، ئەو پرسیارانەت
لێبکەم کە سەرتاپای جەستەیان بە گوناهە زەردو سوورەکان
ڕازاوەتەوە. من بۆم هەیە. چونکە هەموو ساڵێ لەم
وەختەدا، پرسیارەکانم سەرئەبڕن، وەکو ژن سەریان ئەبڕن.
هەموو ساتێ لەم ڕۆژەدا (با)یەك ئەکەن بە گژمدا کە
لە ئاگرەکەی جەهەننەمەوە هێناویانەو شمشێرێکی بریسکەداری
بە یاقووت نەخشاوی بە دەستەوەیە. ئاخر من بۆم هەیە

**لەگەڵ تۆدا بدوێم و دابنیشم. لەبەرئەوەی ڕەگی هەردووکمان**
**بە قووڵایی یەك ئازاردا ڕۆچووە. تۆ (با)ی هەمیشە غەدر**
**لێکراو و منیش ژن و پیاوی هەمیشە زوڵم لێکراو.**
**ئاخر من ڕۆژانە لە قەراغ شاری جەستەما**
**سەری بڕراوی کچێکم ئەدۆزمەوە.**
**ئاخر من شەوانە لە دەشتە چۆڵەکانی لەشما**
**مانگێك، دووان، سیان،**
**کە خلتانی تریفەی خۆیان بوون.. ئەبینمەوە!.**
**تۆ بزانە ئەو سەرانە چەند پرسیار ئەکەن بە کلێپە!**
**تۆ بزانە ئەو مانگانە چەند پرسیار ئەکەن بە چراو**
**لە دواییشدا چۆن یەکەیەکە**
**لە بەردەم تاریکیدا ئەیانشکێنن!**
**من تۆم بۆ ئەوە ناوێ**
**گێڕانەوەت لەمە زیاتر بمژاکێنێ!**
**لەمە زیاتر بمگرییێنێ!.**
**من تۆم ئەوێ بۆ ئەوەی سەر لەبەرساڵ بگۆڕین!**
**ئەم وەرزانە نوێکەینەوە و ڕەنگ بگۆڕین**
**ئەم باڵندانە لە وەڕسبوون قوتاربکەین.**
**فێرە فڕینێکی تریان بکەین..**
**تۆ (با)یەکی بێ دەسکەوتی تایبەتی و**
**لە بەفر سپیی ترو تەپوتۆز فێری درۆی نەکردووی.**
**بیگێڕەوە: دواجار کام خەونت بینی؟!**

**كام ئاوێنەت دایە دەست ڕووبارو**

**كام ئاوازت بۆ درەختە بێوەژنەكان خوێند؟!**

**ئای چەندم پێ خۆشە ئەگەیتە لام!**

**من ئێستا تەنیایی و شكستیی ژیانیان پڕكردووم لە وڕێنەو**

**پرسیار. هێندەی چاوی ژن سەرسامم. هێندەی لەشی**

**ئەوان پڕ لە كفرو تاوانبارم. من ناتوانم**

**بەم ڕێگەیەدا بگەمە لای (مەولەوی) و بەم ڕێگەیەدا**

**بچمە لای دوورە بەفرێكی هەورامان. من جەستەم مین**

**ڕێژكراوە. هەموو ڕۆژێ دەستی وشەیەك یان قاچی ڕستەیەكم**

**ئەپەڕێ. تۆ پێم بڵێ! سەلامەتی؟!**

**ئای (با)ی تشرین!**

**بەرلەوەی گوزەركەی! بوەستەو بتبینم.**

**با دەستێ وەربدەم لە ئاوی فرمێسكت و**

**دوا پرسیار وەك ئاگر لە عەشقتا هەڵبكەم!.**

سلێمانی
2002/1/2

# هەڵەبجەو

# گەڕانەوەی دار هەنارەکان!

بەیانیت باش؟.. هەڵەبجە!.. بەیانیت باش

ڕۆژباش! زەردەخەنەی یەکەم شەقام و

ڕۆژباش! پێکەنینی یەکەم پەنجەرەی کراوەیماڵان و

ڕۆژباش.. پەپوولەکانی کانی عاشقان و باڵندەکانی گوڵان و هەورەکانی سەر شنرویێ

ئەم کاتەتان باش! ژنانی تازە بە تازە لە هەورەوە دەم و چاو

دەرکەوتوو.. ئەم ڕەنگ و ڕووەتان باش!.. کچانی تازە بە تازە لەودیو

حەساری تاریکییەوە بۆ ئەمدیوی مێرگی ڕووناکیی هاتوو

ڕۆژتان باش..

گەنجەکانی تازە بە تازە لە دووکەڵی سەدەکانی ناوەڕاست

ڕەخساو و تازە بە تازە سمێڵ بزەگرتوو..

ڕۆژباش دارو.. ڕۆژباش بەردو

ڕۆژباش گوڵ هەنارو منداڵەکان و

ئەم کاتەت باش.. هەتاو!

بەخێرهاتیتەوە شیعر.. ئەوە باخ و ئەوە دیوان!

بەخێرهاتنەوە گۆرانیی و مۆسیقاو نامەی گولگرتووی دڵداران!..

بەخێر هاتیتەوە ئەی ئازادیی بۆ ماڵی خۆت!
نەمردم و منیش هاتمەوە
نەمردم و تۆم بینیەوە جارێکی دی و سەوزتریش لە جاران!
ئەو ڕۆژەی لە ئاسمانەوە هەوای ژەهراوییان بۆ ناردی،
ئەو ڕۆژەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، باکوورو باشوورو، چەپ و ڕاست،
بە کۆمەڵ دەستیان نایە بینت.. من ئەو ڕۆژە لە ژێر دوورە
ئاسمانێکی قوتبی ژووروودا باڵندەیەکی کەسیرە بووم، لەو ڕۆژەوە
ئیتر تۆ بووی بە سێبەرو بە خەیاڵی پەرت پەرتی شیعرم.
تۆ بووی بە یەکێك لە گوێچکیلەکانی دڵم. وەکو هەناسەم و
تەماشام لەگەڵ خۆمدا ئەمگێڕای. ئەمخستیتە ناو فەزای
ڕەنگاوڕەنگی هەموو زمانەکانی دنیاوە. پەڕەسێلکە بووی
نزم نزم ئەفڕیت و منیش خۆشخوانێکی هەنسکاویی و
بەدواتەوە و ئەڕۆیشتین. پێکەوە سواری فڕۆکە و ترین و
سواری کەشتی ئەبووین و ئەچووینە ناو تونێلە دوورو درێژەکانەوە،
لە لەندەن و لە گۆڕەپانی کۆترەکاندا پێکەوە لەگەڵ ئەواندا
کەوتینە گمەگم و هەر لەگەڵ ئەوانیشدا پۆلە هۆنراوەی منیش
هەڵئەفڕین و ئەنیشتنەوەو دیسانەوە هەڵئەفڕین.
لە کافتیریاکانی ستۆکهۆڵمدا و لە هۆڵی کتێبخانەکانداو
لەناو باخەکانی زمانی سویدیدا هەر زوو کردمی بە تابلۆو
بە گوڵدان و بە پەپوولەو بە ڕەنگی عەشق ڕەنگم کردی.
تۆ ناوی من و من ناوی تۆ بووم یەك پێناسەو یەك پەساپۆرت و
یەك دەم و چاو و یەك هاواری پڕ بە دنیامان هەبوو.

لە ئۆسلۆ و لەبەر تریفەی مانگی سەر بەفرو بە ڕێگای
پرتەقالێدا پێکەوە پیاسەمان دەکردو پێکەوە دووکەڵ بووین و
پێکەوە کوانووی بەهارێکی سووتاو.. هەموو جارێکیش
هەر تۆ بەر لەوەی شیعرێ بنووسم جگەرە لە دوای جگەرەت بۆ
دائەگیرسانم.. لە سویدەوە بۆ ئەمریکا و هەر لەسەر یەك كورسی
فڕۆکەکە پێکەوە دانیشتبووین بە ئاسمانەوە وێنە لە دوای
وێنەتم ئەکێشا تا لە دەربەندی پەپوولەدا تۆ بووی
بە دەربەندێکی تری شاخ و داخی نێو شیعرم و لەو
دەربەندەوە ئیتر تۆ چرایەکت گرت بە دەستەوەو
دەراڵ دەراڵی گیانم گەڕای.. هەر پێکەوە بووین،
چون برژانگ و پێڵوم. هیچ کام لە هاوڕێی غەریبی و
تاراوگە ئەوەندەی من نەبوون بەسەرای کۆچت و ئەوەندەی
من قوڵە قوڵ لەچاوانت هەڵنەقوڵین. لە مۆسکۆ و لە ڕۆژانی
هەرەسێکی گەورەی مێژوودا، بەیانییەك پێکەوە گەیشتینە
ئەوێو لە زەردەی ئێوارەدا بە جووتە خۆمان کرد
بە هۆڵەکەی لۆمۆمبادا و ئەمجارەیان پۆشاکی زمانی ڕووسیم
لەبەرکردی و لەنزیك ڕۆحی پۆشکین و چیخۆڤەوە کەوتینەوە
شەقژن و هەوای هۆڵت پڕکرد لە نمەنمەی بارانێکی پاییزەو
گوێگرانت بە ڕێژنەی خۆت تەڕکرد!. هەگبەکەم پڕبوو
لەوردە گەڵای جەستەی تۆ. پڕبوو لەنامەت و وێنەت و
پڕبوو لە یادگاری بەجێماوی تۆ!. لە شارەکەی دانتیش زمانی
ئیتاڵیت خستە گریان. لە ڤینسیا تۆی قومری سەربال شینی

بنارەکەی شنروێ تێکەڵ بە پۆلە نەورەسی ئەوێ بوویت و
منیش لە خوارەوە بەگیتاری وشە دوا گۆرانیی ڕۆژی 3/16 تم
ئەژەنی. هەر پێکەوەبووین. ئەوە ئەلبوومی وێنەکان:
ئەوەتا لەم وێنەیەدا هەردووکمان دەسمان لە ملی یەکدایەو
لەڕۆخی ڕووباری سیندا (با)یەك لە فرمێسك و قژمان
ئەدات و لەولایشمانەوە درەختێکی شەپقە بەسەری بەشێوە
لە بۆدلێر چوو لەگەڵ گوڵەڕەش و بەدەکاندا خەریکی ڕازو گلەیین،
ئەوەتا لەم وێنەیەی تریشدا من دەربەندی پەپوولەم بە
دەستەوەیە و تۆش کراسێکی سووری ئاودامانت پۆشیوەو
وەستاویت و گوڵە هەرمێییەکی کانیی عاشقانت لەقژت داوە!
ئەوەتا لەم وێنەیەشدا من دانیشتووم و تەمێك بەسەر سەرمەوەو
تۆیش لە پشتەوە باوەشت بە ملما کردووەو چەناگەت
خستۆتە سەر سەری تەماویم و پەپوولەیەکی ڕەش بە گۆناتەوە
نیشتۆتەوە. لەبیرتە؟! ئەو وێنەیە کچە شاعیرێ گرتی کە
ناوی تۆی بە ڕەنگێکی پیرۆزەیی لەسەر قۆڵی کوتابوو:
"هەڵەبجە لە بیرت ناکەین" هەر پێکەوەبووین، تۆ چاو و من
بینین و تۆ سینەو من هەناسەت بووم! من جەستەو تۆ سێبەر و من
سێبەرو تۆ جەستەی سەمایەکی ئەزەلیی بووین!.. بە درێژایی ئەو
هەموو ڕێوبانی سەفەرە، بە درێژایی خەم، بە پانی و
بە قوڵیی و بە بارستایی کۆشت، تۆ هەر لەگەڵما بوویت،
وەفایەك بووم لە ساماڵ، وەفایەك بووم لە باران، وەفایەك بووم
لەگوڵی مارت و لە قژی جوانی منداڵان! لە کۆپنهاگن کردمی بە

دوورگەیەك لە برین و خۆیشم بووم بە بەلەم و بە چارۆگەی
بێ ئارامی دەریاوان! لە زیوریخ بە ڕەنگێکی نارنجی غەمگین ڕەنگم
کردیت و شارێك بوویت و کەچی بووبوویت بە هەموو نیشتمان!
لەئەڵەمانیا و لای گۆتەیش گریانی ئەو کوردە ئاوارانەم بۆ کردیت
بە وردە ئەستێرەی گەردنت کە لە دوورەوە هەر هەموویان
باڵاگەردانی خاچەکەت ئەبوون.
هەر لە گەڵتا بووم.. لە خۆڵەمێشتا گوڵ بووم و ڕوامەوە.
واهاتمەوە لات و
نزیك نزیکی چاوەکانت.
تۆ شاری شیعری.. شاری جوانیت، شاری خونچە.
نەك شاری شمشێرو قەمە.
تۆ شاری گۆڕان و ڕووناکیت،
ڕیشی پڕ لە پەپوولەی مەولەویت
هاتمەوە لات
نزیك نزیکی هەناسەکانت.
هاتمەوە لات و ئەتبینم پڕیت لە کانی تازە تەقیو
پەلکی هەڵاڵەیت و ڕەنگت سوور ئەچێتەوە.
ئەبینم! عەنبەر خاتوونت زیندووبۆتەوە
لە جاری جاران گەنجتر و شەنگترو مەولەویش گەڕاوەتەوەو
کاکۆڵی سپی ڕەش ڕەش بۆتەوە!
هاتینەوە لات
چراوگەکانمان لە سیلەی کۆڵانە تەنگ و تاریکەکانتا هەڵکردووە

نەغمەی بەندو جریوەو جووکەی گیراوی ناو
قەفەزەکانمان بردەوە ئاسمان!
گۆرانیی و مۆسیقای زیندانیمان ڕزگارکرد.
دەرگای بزمارڕێژی داخراومان لەسەر پێکەنین کردەوە.
وەردیانی پاسەوان بەسەر عەشق و بەسەر
ڕەنگی جلوبەرگەوە، پاسەوان بەسەر دەم و لێومانەوە،
بەسەر ڕەنگی قژمانەوە، بەسەرنامەکانمانەوە
بەسەر دەموچاومانەوە، بەسەر بوك و بەسەر زاواو
بەسەر دەرگای حەوشەمان و بەسەر جووڵەی دەست و پەنجەمانەوە..
پاسەوانی تاریکیمان لەناو ڕووناکیدا توانەوە!
لەسیا ساڵەکانی تۆدا، ئەوانە چیان بۆ کردی؟!.. عەردی ژانەکانتیان
سەرلەنوێ هەڵکەندەوە. نە پەنجەرەیەکیان لەسەر گوڵە سیسەکانی
دەروونت کردەوە
نە درەختێکی بێوەژنیان دڵخۆش کرد و
نە چاوی کارێزێکیان ڕوونکردەوەو
نە کۆڵانێکی نوتەکی جەستەی تۆیان ڕۆشن کردەوەو
نە ئاورێکیان لە شەقامی شەقار شەقارت دایەوەو
نە گلۆپێکی تازەیان لە ژوورسەری کتێبخانەیەکدا هەڵکرد و
نە پۆلێکیان بۆ حەرفە بچکۆلەکانمان کردەوەو
ئەوان گوللەیان ئەچاند و.. تێزابیان ئەگرتەوە..
هاتینەوە لات
بەڵام من داوای.. تووڕەبوونت لێ ئەکەم

لە ئێستە بەدواوە مەهێڵەو مەهێڵە دابنیشین و سرەوت بدەین
ئەگەر بە تەنها هەر حیکایەتی ڕابوردومان بۆ کردی و
سبەینێمان خستە پەراوێزەوە.. ئەگەر لە باتی نان هەر دروشمان
دەرخواردایت و هەر بە تەنها ڕۆژنامەمان بۆ خوێندیتەوە..
تووڕەبە، مەهێڵە، دەرمانکە، مەمانگرەخۆ، ئەگەر بینیت ئێمەیش
هەروەکو عاشقە درۆزنەکانت، زمانی لووست بۆ ئەخەینە کار..
دەرمانکە، مەمانگرەخۆ، ئەگەر ئێمەیش هەر لە ڕووبارە
لیخنەکان و لە قەلەباچکە فێڵبازەکان و لەسیاسییە لەنگەکان و
لەشاعیرە موزەوەرەکان بووین!
دەرمانکە، تووڕەبەو هەڵبکەو تووڕمان دە
ئەگەر ئێمەیش وەجاخێکی کوێر و دارێکی زڕو شەرێکی دیکە
بووین بۆ تلانەوەت!
هاتمەوە لات..
بەڵام بەرلەوەی سەربکەم بە هەناوتا.. هەر لەبەر دەرگاتەوە
زایەڵەیەك لایدام و لەگەڵ خۆیدا بردمی بە دەشتی
گریانێکدا بردمی..
بۆ ئاوایی خێڵی حەمە
لەوێ ئیتر:
فوویەکم کرد لە خۆڵەکەی خێڵی حەمەو
تۆزێکی سوور لە دیوانی نالی هەستا
پریشکێکم بەر ئازاری ئەوێ کەوت و
ژان تەنییەوەو پێدەشت گرتی و شاخ هەڵگیرسا

**من هەر مشتێك خۆڵەمێشیی ئەوێم هەڵگرت**

**كردم بەسەر شنروێدا و دوند داگیرسا**

**من قەمسەڵەی شەهیدێكم لەبەركردو**

**ئیتر هەرچی دارو بەردە ئاڵ هەڵگەڕا**

**ئەوان ملی سی و پێنج مۆمیان بڕیمەوەو**

**بەڵام ئێمە هێشتا شەوبوو خۆرمان هێنا**

**لەوێوە، لە ئاوایی خێڵی حەمەی خڵتانی غەدرەوە،**

**لە دەروونە خاڵیەكەی نالییەوە كە وەك نەی ئەناڵی و**

**وەك ناخی وەلیش قرچە قرچ ئەسووتا، لەوێوە لە**

**سەرچاوەی تەقیوی بە لووزەی لەشمانەوە خوێنیش**

**بازرەقەی بەست، خوێنێك بە خوڕڕەم هات و بوو بە سێڵاوو**

**باڵای وەرزێكی كەڵەگەتمانی داپۆشی.**

**قیژەیەك لە وشە هەستا**

**قریشكەیەك لە خاكەوە بەرزبۆوە، هەوری ڕەوەندو شڵەژاوی**

**گریان و بارانێكی ڕەش ڕەش ڕەشتر لە غەدری كەربەلاو**

**ڕەشتر لە دووكەڵێكی ئەنفال و ڕەشتر لە تاوان باری..**

**غەدر.. لە شێوەی تەورێكی ڕیشندا**

**غەدر.. لەشێوەی نیفاقێكی دەمامكداردا**

**تاریكیی بەرەو ئاوایی ڕووناكیی.. دزەی كرد**

**تاریكیی شمشێرێكی ئەفغانی هەڵكێشابوو**

**غەدرو شەوەزەنگ پێكەوەهاتن.**

**تاریكیی بەرەو ئاوایی ڕووناكیی دزەی كرد**

**دەرختەکان نەیان ئەناسین، گردۆڵکەکان نەیان ئەناسین،**
**گژوگیا و تاشەبەردو بنچکەکان ڕوویان لێ وەرئەگێڕان!**
**نامۆبوون بە خاك و خۆڵ..**
**غەریب بوون بە گوڵ و منداڵ و باڵندەو**
**غەریب بوون بە خۆشەویستی و.. ڕەوە ڕقێ بوون**
**بێڕەگ و بێ ئاسمان و بێ نیشتمان!**
**بەناوی خوداوە هاتبوون.. بەناوی کتێبی خوداوە**
**بەڵام هەر لەبەرچاوی خوداو.. لە بەردەمی خوداو لە**
**میحرابی خودادا**
**کتێبی ئەوین و وشەی فریشتەیی و**
**سورەتی بێگوناهی منداڵانیان سەربڕی!**
**لەغەفڵەتا پۆلێك لە چراو**
**پۆلێك لە پەروانە و پۆلێك لەسروودیان کوشت**
**لەغەفڵەتا چوونە سەر ڕووناکیی..**
**وەختێکیش ڕووناکیی شەڵاڵی غەدر بوو**
**لەگەڵیا خاك و لەگەڵیا دەشت و لەگەڵیا هەق ڕاپەڕی!**
**لەئاوایی خێڵی ڕووناکیی**
**ئەو شەوەی تاریکیی دزەی کرد**
**ژنێك، ژنێکی لەگوڵەگەنم جوانترو، لە ئاوی پلووسکێکی**
**هەورامان بێگەردترو، لە تەوار بەچنگترو لە سروودی مەشخەڵانیش**
**گەرمتر**
**هاواریکردو پرسیی:**

**ئەی خێڵی تاریکیی:**

**ئەو دەمەی باهۆزەکەی ئەنفال هەڵیکردبوو.. ئەو**

**دەمەی ژنە درەخت و گوڵی منداڵ و پەڕەی قورئان و**

**هاوارەکانی ماڵی خودای ڕائەماڵی..**

**دەست و شمشێری ئێوە.. لە کوێ بوو.. ناوونیشانتان لەکوێ بوو؟!**

**جیهادتان کام بەتانی ئۆردوگای ئەدا بەخۆیداو**

**لەبەر کام ئاوێنەدا ڕائەوەستان و**

**سەری کام کفرتان ئەبڕی؟!**

**کە هەورامان سیاچەمانەی ئەکوژراو مەلەکانی بێ باڵ و**

**نان ئەگریاو ئاو ئەکڕوزایەوەو بەڕوو بێ کڵاوو**

**مەرگ ئەباری**

**دەست و شمشێرتان لەکوێ بوو..**

**ئەیپرسیی.. ئەو ژنە ئەیپرسی**

**نە دارمان نە بەردمان نە درەخت و نە ئاژەڵ و نە پیرەکانمان نە**

**منداڵمان.. ئێوە ناناسن**

**ئەی خێڵی تاریکیی ئێوە لە کوێوە هاتوون؟..**

**ئەو شەوە توایەوە هەڵبەستم و**

**توایەوە خەیاڵم**

**دووکەڵ بووم ئەڕۆیشتم و زەڵمیشم لەگەڵدا**

**ئەو شەوە زریکەی عەنەب بووم، ئەگەیشتمە**

**لای خوداو مانگێکی کوژراوم لەگەڵدا..**

**ئەو ژنە هاواری گەڵابوو ئەوەری**

ئەو ژنە ئەیپرسی و ئەیپرسی:

ئێوە کێن؟!

کوڕی کام تاریکین؟

وا دەستتان بەخوێنی خۆرەتاو سووربووە؟!

ئێوە کێن؟ کوڕی کام دۆزەخن..

کوڕی کام جەنگەڵ و ئەهریمەن؟!

ئەو شەوە تاریکیم خواردەوە..

بۆ مەرگی مۆمەکان ئازارێ جۆلانەی گیانم بوو

بێ وچان ڕایژەنیم..

ئەو شەوە فریادم نەگەیشتە هەتاوم و

مردم و نەمردم..

تا دواجار لەزامما ڕۆژبۆوەو

لە ژانما خۆرهەڵهات..

ئەو ژنە چووە سەر منارەی قوربانیی..

منارەی سی گەردن.. لەوێوە قیژانی:

کۆبنەوە کوڕانی ڕووناکیی

کوڕانی سروودی مەشخەڵان

کۆبنەوە بۆ ئەوەی کە خەوی سبەینێ

منداڵان

نەسوتێ و بۆ ئەوەی کوێر نەبێ چراخان!

ئەیقیژان:

وەرنەوە.. بێنە ناو برینی شارەزوور

وەرنەوە.. ئاو تینوی ئێوەیە وەك نالیی و

وەك بادی خۆش مرور

بازێكیش وتی:

دزێوترین ڕەنگی ژیان ڕەنگی شەڕە

ئێمە خۆمان لەو بە دوور دوور دوور ئەگرین.

ناخۆشترین دەنگی ژیان دەنگی چەكە

ئێمە پەنجەمان لەو بەدوور دوور دوور ئەگرین.

تەنگترین شوێنی ژیانیش ناو سەنگەرە

ئێمە خۆمان لە چوونە ناو ئەویش دیسان بە دوور دوور

دوور ئەگرین!

بەڵام ئەوكاتەی غەدر غەدر لەپشتەوە ئامبازمان بێ

پاڵ پاڵ پاڵمان پێوەبنێ.. ئەوسا ئیتر ئەو ڕەنگە ئەكەین بە تۆفان

ئەو دەنگە ئەكەین بە لەرزەی بوومەلەرزەو

ئەو سەنگەرەیش ئەكەین بە شوێنی خۆرەتاو.

ئەی جوندەكانی تاریكیی!

هەر لە پاییزی غەدرێكی بۆرەقنەی ڕیشندا بوو.. دزەتان كرد

هاتنە ژووری و ڕیزێ زنەو ڕێزێ جۆگەو

ڕیزێ دێراوتان سەربڕین.. بۆیە خاك و خۆڵ ڕاپەڕی.

پۆلێ گوڵ ئەستێرە و پۆلێ بەستەو

پۆلێ گۆرانیتان كوشتین.. بۆیە هەموو چراكانمان

بۆیە هەموو پەنجەكانمان كۆبوونەوەو.. دەست ڕاپەڕی.

ئێوە پۆلێ لە تەواری بێوەژنتان بۆ جێهێشتین

**بۆیە ئیتر هەرچی هەڵۆی سووری تۆڵەمانە**

**گردبوونەوەو هەڵفڕین و کێو ڕاپەڕی..**

**ئەی ئاواییەکەی ڕووناکیی خێڵی حەمە.. دایکی نالی**

**لەو تەمەوە کە سەرپۆشتەو هەر لە ڕەنگی ئەم کۆستەتە..،**

**بۆ پێکەنینی شنروێ و بۆ گەڕانەوەی شەهیدان بۆ**

**هەڵەبجە سەرهەڵبڕەو**

**ئیتر مەگری!**

2001/10/30

# لەچاوەڕوانی بوومەلەرزەیەکدا!

**ئیستاکە.. ئەوەڵی خوێندنی**
**ستڕانی لەرزۆکی پاییزەو**
**ئەوەڵێن داگەڕان بە"زەرد"دا بۆخواریۆ**
**یەکەمین خەزانی قژی گوڵ لە باخداو**
**سەرەتای دابڕان لەنێوان ئاسمان و سامالّدا!**
**ئیستاکە لەودیوی تەمەوە**
**لەودیوی هاژەوە**
**لەودیوی زەریاوە..**
**لەکەنار تافاوی[1] ئەتڵەسی و لەئاسۆی**
**مەعدەنیی ئەوێدا..**
**لەشێوەی تەپڵێکی گەورەدا**
**هەورێکی برۆنزیی هێناوە.**
**نزیکە زۆر نزیك..**
**نزیکە باهۆزێ لەشێوەی حوچێکدا**
**هەستێتە سەرپێیانو ئەو تەپڵەلێبدا!**

---

(1) تافاو: ئاوی بەهێزو گوڕ. شەتاو.

نزیکە دیرۆکە بارانێ
لە شێوەی تۆفانی بارووتو قوڕقوشما
بگاتە سەر بەغدای حەللاجو
بلەرزێ و بتەقێ وبناڵێو
بەخوڕڕەم داڕژێ و دابکا!.
ئەوتەپڵی زریان و تۆفانە، خەریکە لێبدرێ
دم. دم. دم. نزیکە لێبدرێ!.

هەنووکە.. خەفتیانە[2] و کۆتایی لەپشکۆ ترازان.
یەکەمین سڵاویش لەپشکۆ..
وائێمەیش لەژووری پاییزو لەژووری
پرسیارو ڕاماندا، لێرەوە، چاوێکمان لە هەوری
مەعدەنیی سەرکەلی ئاسنین بڕیوەو چاوێکمان
وا لەسەر ترۆپکی ئەبەدیی شاخانە!. ئەپرسین:
کام مەرگ و کام ژیان لەسەر ئاو، لەسەر بەرد،
لەسەر دار، ئەنوسرێو؟ لە لۆچی کام شەودا
چارەنووس ئەجوڵێ و باز ئەداو دێتە دەر؟! کام
ئەسپی ئەفسانە وگەردەلوول بەرەو لای سبەینێ
ئەئاژوێ و چ ڕەنگێ ئەزێت و چ ڕەنگێ ئەمرێتو
کام پەڕەی ڕۆژ ژمێر، بەڵێنی ڕۆژەکەی تۆفانە؟!
تەپڵەکە ئامادەو خەریکە لێبدرێ

---

[2] خەفتیان: ساردە پایز.

دم. دم. دم. نزیکه لێبدرێ!.

ئیستاکه ئەوەڵی باگژەی
پاییزەو ئەوەڵی.
تەمێکی لوول خواردو لەچاوی جیهاندا..
لەوێوە لەڕۆخی نەهێنی و بەندەری
ئەتۆمیی نیویۆرك و لەجێگەی کاولاشی
دوو بورجا و لەقەراغ کلاوی ساروخو
زەڕڕەوە. لەوێوە لەشێوەی کەڕەناو
بۆقێکی گەورەدا. هەورێکی سورباوی هێناوە.
نزیکە و نزیکە
بوولەرەی مێژوویەك ڕووبداو
ولاتی گلگامش بقلێشێو
ئەنکیدۆ بێتەوە سەر ئەرزو
مردنیش هەڵبێت و ڕابکا!
کەڕەنا ئامادەو چاوەڕێی فوویەکەو
نزیکە ڕەشەبای ئەتڵەسی بەسواری
بڵێسەی فڕیوو ئاسنی باڵگرتوو بەرەو خوار
مل بنێ و دیرۆکێ ڕامالێ و دیرۆکێ هەڵسێنێو
نزیکە گرمەیەك لەشێوەی لەتبوونی دۆزەخا
جیهانێ کەڕبکا!.
هەنووکە، ئەوەڵی لاچوونی کاژێکی پاییزەو

ئەوەڵی هاتنەوەی باڵندەی كۆساران. ئەوەڵی
ترسی سارد. سەرەتای جودایی پەنگرو كزەبا،
ئەوەڵی ورتە ورت لەنێوان پرسیار و خەوندا،
لەنێوان ئایندەو ئیستەدا. سەرەتای هاتنەوەی
قوربانیی و سەرەتای كزبوون و وەرینی دار ژەهری
جەللادو، هەنووكە، ئەوەڵی هاتنەوەی گۆرانیی
جوانەمەرگ.. ئەوەڵی روانەوەی سەر لەنوێی درەختی
گوڵ سپی هەڵەبجەو ئەنفاله!
تەپڵەكە ئامادە و خەریكە لێبدرێ
دم. دم. دم. نزیكەی لێبدرێ!
هەنووكە، ئەوەڵی هەڕەشەی كەشێكی ئاڵۆزەو
چووینەتە ناو ژووری "تیْ ڤیْ"وەو، سەرەتای
هاتنی بۆكزی هەواڵی چوارقوڕنەی دنیایەو لەزۆر
شوێن ڕەشەبای دەنگ و باس گڤەی دێ، ڕابوردووی
زۆر دوورو ڕابوردووی زۆر نزیك، لەوێنەی
گڕگرتووی شریت و ئارشیفدا، لەوێنەی دوو جەنگی
"حەجاج"دا، لەلی كەنداو و قاقڕی نەزۆك و
لەشڵپەی شەپۆلی خوێناودا. لرفەلرف كڵپەی دێ!.
ئەبینم: پەل و پۆی درەختم وەك جەستەم ئەسوتێ،
جەنگ.. جەنگ.. جەنگ، چووینەتە ناو چاوی
تیْ ڤیْ وەو، ژنەكەم كۆترێكە شپرزەو لە نیگای
كامێرای ناو دۆزەخ ئەترسێ!

لەودیوی زەریاوە لەودیوی هاژەوە
لەشێوەی دوو بورجی ڕوخاودا، دووکەڵ و بڵێسەو
غوبارو تەپ و تۆز، پێکەوە، هەورێکی مسینیی
قورس قورسیان هێناوە!
تەپڵێکە لەچەرمی زەمانی تیرۆرو
تەپڵێکە لەپێستی گای ئەتۆم
دم. دم. دم. خەریکە لێبدرێ
لەودیوی زەریاوە
لەودیوی هاژەوە
کاریزمای سۆپەرمان
پیاوێکی گلێنە لێزەریی..
بە پاڵتۆی درێژی ئاسن و بە شەپقەی پۆڵاوە
سەروملی کۆنکرێت لە هەوراو
وەك یانزەی سێپتەمبەر هێشتاکە
گەرداوی هەرەسی مێژوویەك
لە سەریاو، گەردەلوول لە چاویاو
چەخماخە لە دەنگیاو
بەرامبەر ڕۆژهەڵات.. وەستاوە!
هەورێکی هێناوە
لە شێوەی تەپڵێکی گەورەدا
دم. دم. دم. خەریکە بکوترێو

نزیکە لێبدرێو تۆپەکەی سەر زەمین
ئەستێرەی سەرسامەو هەورێکی هێناوە
زۆر نزمەو شان ئەسوێ لەبەرقو
ئێستاکە بۆنێك دێ لەدنیا..
بۆن تیژەو.. بۆن بۆنی تۆفان و لافاوە!
چووینەتە کاسێتی ڤیدیۆوە
چوینەتە ناو چاوی تێ ڤێ وە:
سەر ڕێژین لەکۆست و لەبۆنی 3/16
سەر ڕێژین لەفرمێسك لەنسێ
لێوان لێو لەتەعزێ
لێوان لێو لەژەهرو لەمردن
سیخناخین لەنووزەی پەلکە گیا
سیخناخین لەقیژەو زریکەی دەربەندو پێدەشتەو
سیخناخین لەڕەنگی بێوەژن!

چووینەتە ناو چاوی تێ ڤێ وە:
هەنووکە ئەوەڵی غوربەت و وەرینەو، هەڵەبجە
لەشێوەی ژنێکی سەوزەڵەی ڕاکشاو لە(با)دا ئەبینم
پەپوولەو مێلاقەو هۆنراوەو مۆسیقا، بەکۆمەڵ لە بەژنی
ئاژاری[3] ئالاوەو پەنجەرەی برینی بێ خوێنی لەسەرپشت
پڕ هەتاو!

[3] ئاژار: بەهرەو دەرامەتی زەوی.

هەنووکە هەڵەبجە لەشێوەی هەورێکی خڕکەلەی
دووگیاندا ئەبینم لە(با)دا ڕاوەستاو.
ئەبینم: باوەشی پڕ گوڵی هەنارەو. پڕ تەرزەو
ئەگاتە ناو ژووری پاییزەی دەروونم و
لەبەردەم ئاوێنەی شکاوی خولیامدا ئەوەستیٚو
پڕووشەی خۆرنشین لەبەردەم شەوقێکی نارنجیی
مەراقما ئەوەستیٚ و ئەوساکە ورد ورد ورد
وەك کلووی دەم کزە دەست ئەکا بەسەما؛
پێم بڵیٚ:
چۆن تاسای.. هەواکەم؟!
چۆن کپ بووی.. قەسیدەم؟!
چۆن مردی.. شەماڵم؟!
چۆن خنکای.. ئاوی ڕوون؟!
کیٚ تۆی کوشت
کیٚ تۆی کوشت
کیٚ تۆی کوشت "هەنارم؟!
بەدەستی ئاوی دڕ؟! شەپۆلی ئۆقیانووس؟!
بەدەستی تاوێری شاخ و داخ؟!
چ تەپڵێك لێدراو؟! کامیان بوون
هاتنە سەربەیانیت
ئەوەندەو لەناکاو بەیانیت درنجیٚ لەشێوەی
کەنداوو دوورگەدا قووتیدا؟!

کامیان بوون؟! زۆر لەژوور منارە و قوبەکەی
ماڵەکەی خوداوە. هەورێکیان بەردایە خوارەوەو
ئەوەندەوگرمەیەك. بۆنێك و. ڕەقبوونێ لەجێدا!
کامیان بوون؟! کام تەپڵ لێدرا؟
بەدەستی کام هەور دەرمانخوارد کرایت و
ئەوەندە و بەفری لەش لە بنار خەونێکی کەسکدا
شین شین شین هەڵگەڕا؟!
کامیان بوون؟ کولۆمبس؟! ئەدیسۆن؟!
غوباری هیندوسی و یەزدانی بوزی بوو
کامیان بوون؟! ئەوان بوون
یان هەوای مردنی خەلیفەی ئەمەوی؟!
چووینەتە ناوچاوی تێ ڤێ وە:
ئەچمەوە بەردەمی نەفخی سوور
ئەچمەوە ڕۆژەکەی قیامەت
ئەچمەوە ناو حەشری سەحراکەی هەشتاو هەشت
"ئای خودای بێباکم!
هەشتاو هەشت.. هەشتاو هەشت
ئەو ساڵەی لەدوورگەی کوللەوە.. لەدوورگەی دووپشك و
لمەوە لەوێوە لەخوارێ، "الاعراب" هاتن و
شەریکیان بۆ پەیدا کردیتو شەریکیان بۆ هێنایت
بۆئێرە، بۆ فەوتی بێچارەی بەندەی خۆت "الاکراد"!.
شەریکیان بۆ هێنایت بۆ حوکمی مردنی بەجوملەی

**ناو زیلی ئەکرادی لە نەوەی درنج و ڤالۆنچەو جنۆکەو**

**بۆ ئیمزای هاتنی بە پەلەی ڕۆژەکەی قیامەت!**

**ئای خودای بێباکم!**

**گوناه بوون مەعشەری بەندەی خۆت "الاکراد"!.**

**وای لە من. وای لە خەم. وای لە تەم، وای لە لم. وای لە زیل.. زیل و**

**زیل، وای لەبای شایەتی تاڤانەو.. وای لەپاچ**

**وای لە چاڵ، چاڵ و چاڵ.. ڕێچکە چاڵ، تا تخووب، دوای تخوب، تا سعود!**

**ئای خودای بێباکم! هەشتاو هەشت.. هەشتاو هەشت**

**مەگەر هەر، زاتی تۆو کوردەکەی عەبدی خۆت**

**بزانن چۆن بوە هەشتاو هەشت!!؟**

**ئەچمەوە ناو حەشری سەحراکەی هەشتاو هەشت**

**هەنووکە لە شێوەی قەتارەی هەورێکی لۆچ لۆچ و**

**ژاکاوی درێژدا زۆر درێژ، ئەوسەری لە ژانی**

**بەفردا و ئەمسەری لە کۆشی ژیلەمۆی ناو لمدا..**

**زۆر درێژ: کاروانێ لە غوبار، کاروانێ لە ڤیژە،**

**کاروانێ لەخەونی لەت و پەت، هەنووکە لە چاوی**

**تێ ڤێ دا ئەبینم: هەر حەرفی خۆڵاوی شیعرمەو،**

**هەر پارچە ئاوێنەی شکاوی دیدەمەو هەر جەستەی**

**پێدەشت و هەر پەنجەو هەردەست و هەر کەللەی**

**چیامە و بایەکی گڕاوی ئەیانبا بۆ ڕۆژی قیامەت!**

**"چۆن ڕۆیشتن پاییزە ئازیزان؟! بەچی چوون؟!**

**چۆن چوونە لای خوداو گەیشتنە بارەگای بێ خەمی و،**

چۆن چوونە بەردەمی قیامەت..
بەر لەوەی قیامەت ڕووبدات؟!
پاییزە ئازیزان؟! بەچی چوون؟!
بەسواری کام ئەسپی بۆراق و کام فیلی حەبەشەو
کام سوخۆی ڕوسیاو کام حوشتر؟!
گەیشتنە بەردەمی نەفخی سوور
بەر لەوەی نەفخی سوور لێبدرێ.. پاییزە ئازیزان؟!
بەسواری شمشێرو لەخودەی ئاسندا
تالای خوا یەك بەیەك، سەفەرتان سەلامەت
پاییزە ئازیزان؟!
بەسواری بڵێسە دەشتاو دەشت گەشتاو گەشت
یەك بەیەك بەخێرچن بۆ بەهەشت.. ئازیزان؟!
کاروانچی و پێشەنگی..
ئەم کۆچی نێوانی زەمین و ئاسمانە!
سەرقافڵەی ئەم ڕەوی نێوانی گوناە وتۆبانە..
ڕێبەری نێوانی عەرعەرو ئەو ئاخرزەمانە
کامیان بوون؟!
کارڵ و مایکڵ و یەسوع بوون؟!
یان سەعد و قەعقاع وموعتەسەم؟!
لەودیوی زەریاوە
لەودیوی هاژەوە.. وەك قیژەم بەپڕتاو
لەشێوەی تەپڵێکدا هەورێکی مەعدەنیی هێناوە

تەپڵەکە بەرەو خوار مل ئەنێ و
دم. دم. دم. نزیکە لێبدرێو
شەست. شەست. شەست. خەریکە دابکاو دارژێ!
نزیکە زۆر نزیك لەخوار ڕا
سەرەتای ڤافڵەی پاییزە ئازیزان..
ڤافڵەی ئاسك و مۆمەکان.. تێکەڵاو دەرکەون.
لماوی و تەماویی و خۆڵاویی.. بریسکەو چریسکەی مامزو
چاوی مۆم تێکەڵاو دەرکەون و بێنەوە بۆ ئێرەو بۆلامان!.
نزیکە زۆر نزیك لەسەر ڕا..
کەژەکان، شاخ و کۆ، دانەون و هەڵەبجە
بەباوەش هەلگرن و بیخەنە سەر شانو بیبەن و
یەك ڤۆناغ بەرێگەی دەربەندا هەر بە پێش برۆن و
نەوەستن لانەدەن
تا شارو تا مێژوو
تا دنیای بێ حەجاج!

# کۆنسێرتێ بۆ پاییز..

# پاییزێ بۆ دایکم!

وەك ئاگری بەردە ئەستێیەك و شەوقێکی خێرا..
کە چۆن لە ناکاو تاریکە شەوێ دائەچڵەکێنێ..
لانەی کەروێشکێ، فۆزاخەی کرمێك، چاوی ئاژەڵێ،
کونە مێروویەك، پێستی تەنکی جۆگەلە ئاوێ، دەستی
تووکنی سوورە چنارێ، بە شەوارەی تیژی ناوەخت ئەخات
خەیاڵی شیعرم بەو جۆرە هات و
باڵای پاییزیش بەوجۆرە دەرکەوت،

وەرزێ لەدوا سەمای گەڵاو، پاییزێ لەدوا هەناسەی
ماڵئاوایی و، ڕووناکییەکی تەڕی نوستوو، لەنێو کلۆرە
دارێکی بەئارامداو، سمۆرەیەکی دزی زیت بەگوێزێکی
ناو چنگییەوەو، لەرزینی سەری درەختێ ئەو وەختەی
کەئیتر تەمەن بیرەوەری ئەڕنێ و پیرێتی هێشووی
هەتاوی لەدەست ئەخاتە خوارەوەو سێبەر خەوی لێ ئەخات و

ڕەشەبا ئەیترسێنێ. ئەو وەختەی کە ئیتر خەزان،
چون پیرێژنێکی ڕەقەڵەی تەنیای ژێر هەرزاڵێ لەبەر خۆوە
هەر بۆڵە بۆڵێتی و کە ئەیشرِوا قاچ لەگەڵای مردوو ئەخشێنێ!
وەرزێ لەبێهودەیی..
پاییزێ لەنووکە نووك
لەولای ترەوە، بە بەرزی حەسرەتی شاخێ
قەڵبەزەیەکی سپی کە(با) یاریی بەدڵۆپ و
پرژەکانی ئەکات و ئەیەوێ تامانگ لەسەفەری
نێو بێشەی هەورەکان و لەگەشتی زیوینی خۆی ئەگەڕێتەوە،
تا پڵپڵەکانی تریفە بەسەریا شۆڕئەبنەوە، گەمە بەو
پرژانە بکات و وەخت بەسەر بەرێ. پاییزێ لەژانی
هەڵبزرِکاوی پەلکە گیای بەردەمی ئەشکەوتێ کەشێت بووە
بۆ چنگێ هەتاوی پشت نسێ و نەفەسی گەرمەسێرێ.
پەلکە گیا وەختێ ئیتر ئەبێ لەناو دەستە زبرەکانی
چارەنووسێکی شوومداو
لەناو درِکەزیدا ڕاکشێ و دەرزی ئاژن لەوێدا بێ
هەتا ئەمرێ!.

پاییزێ لەقژی بژی سروشت. لەدەوەنی سەرمابردەڵە!.
لەئەگریجەی تاك و لۆ کەوتووی
سەر لاجانگی دار بییەکی ڕووتەڵە
دار بییەك چاوی کزکز و بەهەزار حاڵ، ئەتوانێ
دابنەوێو دەم و چاو بنێ بەڕوومەتی ئاوەوە

بۆ ئەوەی دێرێکی لێڵی شەپۆل، نامەیەکی قوڕاویی
ئەوبەری کەناری دابڕاو ببینێ..
دار چنارێك لەزەردە.
پاییزێ لەخەنینەوەی هێواشی ئازار.
پەڕەسێلکەیەك لەغوربەتی ڕەش و سپیی
گژە بایەك لەهەناسە سوارەکانی ڕەوەزو
هەورازێکی پشت شکاوی بەدبەخت..

پاییزێ لە شەرم
پاییزێ لە کۆچ
دار چنار شەرم ئەکات بەڕووتی لەبەرچاوی پەڕەسێلکە
خۆی لەگۆمەکەدا بشوات و پەڕەسێلکەیش ئەوەی لەخەیاڵیا
نەبێت لەشی ڕووتە. ئەو هەموو مەراقی داغان و ڕێ
ڕێ بووی لای زەمانی کۆچە. دارچنار یادگار جۆلانەی
خولیایەتی و ئەو بەتەنها ڕابوردووی کردووە بەشمشاڵ و
ئەیژەنێ. پەڕەسێلکە لەعەزرەتی کۆچ و گەیشتن بە
دڵدارێ. خەریکە ببێتە شاعیر و شیعر لەسەر پەڵە هەورو
لەسەر چۆم و لەسەر بەرسنگی بنووسێ. گژە بایش
پۆستەچی دەربەندێکە، تەتەری ماندووی ماهی و پلەی
لووس و خەرەندێکە کە هەموو جارێ تا ئەگاتە ناونیشانی
چەند تویخێ لە دەست و قاچی، چەند تویخێ لە وژەی،
لێ ئەبێتەوەو لەڕۆژێکدا سەدجار ئەمرێ و ئەژێتەوەو ئەمرێ..

پاییزێ لەکڵاوی کون کونی مەزرا
کە مەراق دەنك دەنك لێوەی دێنە ژوورێ.
پاییزێ لەکراسێکی زەردی ئاودامانی شیتاڵ شیتاڵ
کە بارێزەی ژنە خەیاتی کووڕی بەر سەرما
وای ئەدووری!
پاییزێ لەبۆنی تەنیاییەکی شێدار.
پاییزێ لە کزەکزی دووریەکەی دایکم و وەرینێ لە
فرمێسکی سەرچاوە ڕوون.. چون ئەو دلۆپانەی
بەسەر گەڵاوە ئەوقی مانگەشەو ئەبن و تا بەربەیان نانوون!
پاییزێ لەدایکم، ئەو دەمەی گوڵ خەندەران ئەکا بە
حیکایەتی بێدارو، بە تاق تافکەرەی دڵدارو، بەزیکەزیکی
سیسرکێ و بە دەشتێ و ئەیگێڕێتەوە. گۆرانیی ئەکا
بەئاوی تانجەرۆو بەدەشتی وەیس و بەدارەکەی
پیرمەسوورو، بەکانی باو
بەدەم پینەکردنی تاقە پانتۆڵی قوتابخانەمەوە
بۆم ئەڵێتەوە..

پاییزێ لەگەڵای دایکم
وەختێ گەڵا چاوی پڕە لە تەمێکی سپی سپی و
لەودیو تەمەوە بەهارێك بەحاڵ دیارە.
پاییزێ لەگەڵا ڕێزانی وێنەکانی ساڵ لە دوای ساڵی
ئەو دەمەی زەمان وەك پیاوێکی بەردینەی بوغزن

سێوی وێنەو لیمۆی وێنەو هەناری وێنە
لەقوڵی مشتیا ئەگوشیٔو
ئەڕوات و دوای خۆی لەبنی گۆزەیەکی مل شکاودا
تڵپەیەك لە وەزەن[1] تڵپەیەك لە هیوا
تڵپەیەك لە خەوبینین بە جێدێڵێ.
ژوورێ لە پاییز.
دەرگایەك لە قوڕ.
حەسیرێك لە خۆڵ
سەقفێ لە بولێڵ.
گاگۆڵکێی وشەم لە پوولی دووداو
خشەخشی گەڵایەکی ترساوی هەیوان و
چرایەکی منگە منگکەرو بێزار لەدیوار.
میاومیاوی پشیلەیەکی یەك چاوو.
یەك جووت گۆرەوی دووڕەنگ و
نووزە نووزی پنەیەك و
هێڵنجی قاپێ شێوی ترشاو و
سەرەویرێکی کۆنی ڤیرسچمەو
ئەسپی بۆراقێکی بێ ئیش و تەمەڵ و
ئەشکەنجەی باخن![2]
پاییزێ لە دایکم

---

[1] وەزەن: ئازار

[2] باخن: شوێنێك کە بای لێوەدێ.

یان دایكم له پاییز
له هەتەری بینینێکی سەرابیدا، تووڵەڕێیەکی خۆڵاویی لەئاسماندا و. مانگێکی دەردەداری کەوتوو له پێخەفی چڵکنی هەورداو، پۆلێ له قاز و قولنگی بەزیو له دوا شەڕی هاویندا‌و. تیلماسکێ له خوێنی (با)ی بریندار!.

پاییزێ له دایکم..
باڵەبانێ له شایی گریان
گریانێك له ئاو
ئاوێك لەدیدەو
دیدەیەك لەناو بێباکی خوادا.

دایکم له پاییز..وەکوو دەوەنی کەوێڵی شاخێ
ئەو دەمەی کزه لەجەرگی ئەدا..
دایکم له پاییز.. واته له ڕەنگی بێ ڕەنگی تەیرێ
که هەرچی وەرزه ئاوارەی ئەکا!
پاییز له دایکم،
وەکوو کۆڵوانەی پڕ لەسێبەری، خەیاڵەکانی
سرکەیی سەریو ئەو مێخەك بەندەی
که بۆنی مردوو له گۆشەی عومری گرمۆڵە بوودا
وەك بالیفەکەی یەك قسه ناکات!

پاییزێ له خۆم!
باپووسکەیەکی بەفراوای بزێو لەناو قڕداو لەناو شیعراو.

خلبونەوەی یەکەم پەپوولە پاییزە بەناو ڕاڕەوەکەی
عومراو. کۆکردنەوەی پووش و پەڵاشی یادگار بۆ کردنەوەی
یەکەم ئاگری تەنیاییەك هەر خۆم و خۆم لەشەوانی
ساردی ڕووتانەوەی پەرووباڵدا.

پاییزێ لە خۆم
شکستێ لە خۆم..
ئەو وەختەی کچێ لە گوڵە هەنار قەسیدەم نەبێ
لەشم بۆن ناکاو ئەوەم پێ ناڵێ کە ئاگری خەفەی
جەستەم ئەیەوێ!. ئەو وەختەی کچێ لە داری چواڵە
هەر ڕۆحی ئەوێ و ڕۆحیش وا لە ناو هەناوی
باداو پەنجەم نایگاتێ. ڕۆح ڕاناکشێ و ڕۆح
بێ جێگەیەو جەستەیش پێم ئەڵێ: جووتبوونم ئەوێ!. کچی
دار چواڵە هەروا دوور بە دوور ئەمکا بە دارتووی
مامێکی خۆی و هەروا دوور بە دوور ئەمکا بە
مامی دەم و لێوی خۆی. پەنجەم لە دەست و
لێوم لە دەم و جەستەم لەگڕەی بژۆگ[3]
دەرئەکا!

پاییزێ لە خۆم
خۆم لە ژنێك و
ژنێك لە بای سارد

[3] بژۆگ: ئارەزوو. ڕەغبەت

**بای سارد لە شاخ و**

**شاخیش لە ساڵی سەهۆڵبەندان و**

**سەهۆڵ لە جەستەی بێوە ژنان و**

**پاییز لە دایکم و**

**دایکم لە کوردو**

**کورد لە تەنیایی و**

**تەنیاییش لە خوا!**

# داگیرسان و کوژانەوە

جار بە جارێ
بە سواری گەڵا هەنجیرێ
منداڵێك دێتە ڕۆحمەوە
لەو کەلەوە هێواش هێواش هەوری پاییز
ئەیهێنێت و لە حەوشەدا دائەبەزێ
وەکوو پەموو نەرم نەرم هەنگاو ئەنێ
دەست ئەبات و درزێ ئەکاتە خەیاڵم و
لەگەڵ تاڵە تیرێژێکی کەسکا
دێتە ژوورێ!.
جار بە جارێ..
بە سواری گوڵە ژاڵەیەك
منداڵێك دێتە ڕۆحمەوە
وەختێ ئەگات چون پەلکە گیای بەر پلووسکێ
قژی تەڕتەڕ.. لەشی تەڕ تەڕ
کە باوەشی پێدا ئەکەم..
ئەوسا ئیتر تەنیایی منیش تەڕئەبێ و

**له گۆشەیەکی دیواندا بۆ هەردووکمان**

**ئاگرێ لەناو ئاگردانی هەڵبەستێکما ئەکەمەوە**

**ئەچینە بەر تینی وشەو گڕی ڕستەو**

**پرشنگێکی پرتەقاڵی**

**ناو شیعرەکە لێمان ئەداو**

**هەڵمی خەیاڵێکی زیوین**

**لە سەرتاپامان هەڵئەسێ**

**ڕەنگی پێست و ڕەنگی چاوو**

**ڕەنگی کاڵامان ئەگۆڕێ..**

**هەر بە پێوەین.. بە حەواوە پەیڤ و**

**پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ ئەگرینەوە**

**هەر بە پێوەین.. هەتاکوو وشك ئەبینەوە!**

**ناو بەناوێ**

**منداڵێك دێتە ڕۆحمەوە**

**بەداری گرنج گرنجی دڵە ڕاوکێ و**

**بە تانۆکی[1] بەر پەخشانما هەڵئەگەڕێ**

**منداڵێکە لە پرژەی ئاوی قەڵبەزە لاسارترە**

**لە هەڵمات و لە کارژۆڵەو لە دەنکە تەرزەی سەر تاوێر**

**بزێو ترە!**

**هەموو جارێ لەگەڵ خۆیدا..**

**مشتێ جریوەی چۆلەکەو، چنگێ بارژنی مامزو**

---

[1] تانۆك: دیواری نزمی لەشووڵ و دار دروستکراو.

هەندێ لە گزنگی باخ و
پڕ گیرفانی کراسەکەی: پێکەنینی دارسێوێك و
هەندێ لە وردە هەتاوی دارستان و
لەگەڵ خۆیدا هەندێ تریفەی ڕژاوی
سەر سەربانم بۆ ئەهێنێ!

ناو بەناوێ، درەنگانێ، شەوانە دێت
وەختێ کە من بێزاریم بۆتە توتڕکێ و
پەڕیوەتە ناو ڕۆحمەوەو
لەسەرەوە بۆ خوارەوە
خێرا خێرا بەنینۆکی تیژی گڤە
وەك پاییزبم.. دامئەڕنێ!
جار بەجارێ، درەنگانێ، پاییزە شەو
لە پڕێکدا پەیدا ئەبێ
وەختێ کە من وەڕس وەڕس
بووم بە گردی پرسەداری پاڵ دەغڵ و دانی کوژراوو
تەم دامئەگرێ!

ناو بەناوێ شەوانە دێت پاییزە شەو
وەختێ کە من
بێ تاقەتیم، ڕاکشانی سەعاتەکانی تەمەڵیم
وەکوو خڵتەی بەجێماوی بنی کوپێ

**یاخود قەوزەی ڕیشاڵ لینجی**
**قەراغ حەوزێ،**
**ئەویان کڕکڕ لەبنی ڕۆحما ئەنیشێو**
**ئەمیتریان مەلاس مەلاس بە خەیاڵمەوە ئەنووسێ!.**
**وەختێ کە دێت**
**بە ئەسپایی هەنگاو بەسەر ڕۆحما ئەنێ**
**دەست ئەبات و لە تاقی بچکۆلەی دڵیا**
**مۆمێکی سپیی دەردێنێ. سووك سووك ئەڕواو**
**ئەیباتە ناو کونجی تارو گۆشەی شێداری**
**ناخمەوەو مۆمەکە دائەگیرسێنێ.. دیسانەوە**
**دەست ئەبات و ئەمجارەیان توترکەکە**
**دەرئەهێنێ و لەجێگەی ئەو گوڵێکی سپیی**
**دائەنێ، دیسانەوە دەست ئەبات و بە**
**دەسرێك لە ساماڵ و بە پارچەیەك لەخۆرەتاو**
**ڕۆحی تەماویشم ئەسڕێ!**
**هەموو جارێ ئەم منداڵە کە بەشێوە**
**لە زەردەخەنەی شەپۆل و لە لەرزە لەرزی ئاوازو**
**لەگمەگمی شیعر ئەچێ..**
**هەموو جارێ گرژی و مۆنیی گەورەبوونم**
**لەبەردەمی خنەخن و بێ گوناهیی و پاکی خۆیدا**
**تەریق تەریق ئەکاتەوە..**
**ئەمکاتەوە..**

به یەکەم ئاسۆی بینین و باڵەفڕێی یەکەم جارو
جێم ناهێڵی تا بەدەنووك لەڕووناکیی و
خەوبینینم نەخواتەوە.
★
تۆ ئەی منداڵی "با"ی سپیی و
ئەی جۆگەی پەنجە بزێوی کەنار تەنیاییەکەی شەوم!
ئەوە سەرم: مێرگێك لە یاد بۆ گەمەت و
بۆ ڕاکردن بەدوای تیشکاو بەدوای ڕەنگداو
بۆ گرتنەوەی تۆپێك لەوبەر خەیاڵمەوەو
بۆ هەڵدانی گوڵە چەترێ لەسەر پاییزەکەی عومرم!.
تۆ ئەی منداڵی "با"ی سپیی!
(با)ی من ئیستە خۆڵەمێشیی و،
تۆ ئەی ئاوی ڕوونی ڕوانین!
ئاوم ئیستا نیگای لیخن!

هەموو جارێ ئەوە من جۆگەو تۆ قرژاڵ
وەرە ناوم.. ڕوون ئەبمەوە!
هەموو جارێ ئەوە من مێرگێکی پیرو تۆ کارژۆلەو
وەرە ناوم و سەوز ئەبمەوە..
هەموو جارێ ئەوە من شیعرێکی خاڵیی و من کاولاش و
وەرە ناوم و پڕ ئەبمەوە و بە بڕشت و بمکەرەوە بە ئادان.[2]
وەرەو مەهێڵە بسرەوم! وەرەو سەعاتی جەڕەسدار

---

[2] ئادان: زەوی بە پیت و بەرەکەت.

لەناو تەمەڵیما دانێ و بۆ نووسینی پەلکە گیایەك

یان نووسینی گوڵە گەنمێ یان نووسینی کەروێشکێك و پەپوولەیەك..

سەد جار خەبەرم کەرەوە..

★

ماوەیەکە من کاغەزم خەونابینێ.. کاغەزم زڕ.

ماوەیەکە بە بندینی[3] ڕووبارەکەی عەشقی مندا

نە ماسییەك.. نە وشەیەك

نە حەرفێك هات و چۆ ناکات.. ڕوبارم زڕ.

مودەتێکە ڕۆحم وەك خەیاڵم بەتاڵ.. بەتاڵ.. بەتاڵ

نە نووزەی دەنکە چەوێك و

نە باڵە فڕێی هزرێك و

نە خشەخشی خەمێك و

نە ورتەورتی پاییزێ..

لە من نایە

چونکە ئەو منداڵەی ڕۆحم بزربووەو

ئیستە نایە!

---

[3] بندین: بن و تەختی چۆم و ڕووبار.

# میوان

میوانێك هاتووە، پاییزە میوانە.
وەك كزە باریكەو
وەك تەیری ئاسمانی دوای ئەنفال
بێ ناوونیشانە!
میوانێك هاتووە، خەزانە میوانە
بێ مۆڵەت
چون پووش و پەڵاش و،
پەپوولەی "با" بردوو،
گەڵای وێڵ..
هاتۆتە ماڵەوە!.
لەخۆوە بێ پرس
هەروەكوو مامری ماڵ ونكەر
وەك دزەی زەردەیەك بەدرزی دەرگادا
هاتۆتە ژوورەوەو
بێ ڕەنگە دەوەنی خۆڵاویو
بێ دەنگە ئەستێركی ئەنگۆرەی ئەبڵەق و

**له گۆشەی خوارووا**

**سێبەرەو گرمۆڵەو**

**تررووشکەی کردووە!.**

**وا ئێستایش**

**ئەشکەنجەی قژ بژەو**

**دانیشتووی دالآنە!.**

**ژنێکە..**

**لە گوندو ئاوایی ژانەوە هاتووە**

**داربییەو هاتووە**

**لە دەشتی سەرسام و کەناری چۆمێکی**

**ئەوگاری[1] خەمەوە هاتووە..**

**هەر ئەڵێی ئاوێنەی شکاوو**

**قوتیلکەی ماندووە!.**

**هاتووە**

**لەوێوە چەند فرسەخ بە سواری تەنیایی و**

**لەوێوە چەند فرسەخ بەسواری ئاگرۆکەی[2]**

**"شارەزوور" هاتووە!**

**ژنێکە**

**چون پەیژەی بانیژە**

---

[1] ئەوگار: سیس و زەرد هەڵگەڕاو.

[2] ئاگرۆکە: بای گەرم کە گیاو سەوزە وشك دەکا.

پلژیان[3].. پلژیان!.
ژنێکە
پڕ لە تەم.
پڕ سەراب.
پڕ سوتوو.
ژنێکە
لە کاسەو کەوچکی داریینەو
لە ڕەشکەو لەکونجی و
لە چڵە ڕێحانەی لارە مل سادەتر!
میوانم.. ژنێکە
بەشێوە لە هێشووی قرپۆکی
ڕەزێکی بێوەژن.
لە شیعری ڕنراوو
شمشاڵی سووتاوو
لە کانیی لیخن و لێڵ ئەچێ!.
میوانم.. ژنێکە
هاتووە بۆ شتێ.. بۆ دو شت. بۆ سێ شت
نازانم.. "بەخۆم وت:
ڕەنگە نان مانگی ناو
ئەندێشەی سوتاوی سەری بێ!
یاخود ڕەنگ بۆ بەری درەختی ڕووتاوەی!

[3] پلژیان: کزو بێ تاقەت و هیلاک.

یان ئاگرێ بۆ خەمی تەزیوی!
یان خەندەی چرایەك
بۆ ژووری گریانی تاریکی!"
-نا.. نا.. نا
بۆ هیچیان!.

ژنێکم میوانە
هاتووە بۆ دوو دێڕ هەناسەم
بۆ دوو قوم لە وشەم.
بۆ چنگێ لەخەون و خەیاڵم.
هاتووە بۆ مشتێ لە هەوری ناو شیعرم
هەتاکوو بیخاتە ناولکی فەقیانەی شرۆڵ و
بیخاتە سپێنەی چاویەوەو
دوور بیبات..
ژنێکم میوانە
هاتووە بۆ شیعری سەر کێلێ
بۆ ئەوەی بەدەمی بڕندەی حەسرەتێ
ڕۆحم و ڕۆحی خۆی
لەسەر بەرد پێکەوە هەڵکەنێ!.

★

خودایە!
خودایە!

چەند باڵای ناوبانگ و شیعری من
لە باڵای ئازاری ئەم ژنە کورتترە!
خودایە!.. خودایە!
تکایە
کەنەفتی سەر جێگەی
کاغەزی بێ شیعرم نەکەیت و
گەر کردت.. پێش ئەوە
خودایە!
بە گوڵە خەنجەری ئەڤینی ئەو خەڵکەو
بەلاسکی وەنەوشەی خەمانی
ژنانی ئەم خاکە
بمکوژە!!.

# لـــەژم

**من ناوم پاییزە میوانە**

**دەستێکم تریفەو**

**دەستێکم قەسیدەو**

**سەریشم ئاسمانە!**

**بەو دەستیان شەوانە خەرمانە لە ڕۆحی تاریکدا ئەچێنم و**

**بەم دەستیان ڕۆژانە تان و پۆم لە ڕێزەی ڕێژنە ئەچنم و**

**سەریشم قوببەیەك لە گەلاَی خەزانە!**

**من ناوم پاییزە میوانە**

**دەستێکم لە دەستی تەم دایە و**

**دەستێکم لە قژی (با)دایە و**

**سەریشم گەواڵەی گومانە!.**

**ڕامانێ لە چاوما کەوتۆتە بریسکە دووراو دوور بەهێشوو**

**نەهێنیی شاراوە کێش ئەکاو لەو دیوی هەسارەی بوونەوە**

**گەردوونێ ئەدوێنێ لە خولگەی ئەستێرەی نەناسراو.. ڕامانێ لە**

**نادیار، لەتۆڕی شەبەنگی وجودو هەزاران پرسیاری بەجێماو،**

**ڕامانێ لە چاوما کەوتۆتە بریقە، پلووسکی تەماشای پڕ لە نوور،**

ئەو نوورەی لە عەشقی ژنەوە بژنگی[1] ئەپرژێ و ئاوازی
ئەلەرزێ و شەتاوی ئەسووتێ و ڕامانێ سەرانسەر بێدەنگیی
پێدەشتی ڕوانین و ڕامانێ فڕینی توانەوەی لە خەمی مرۆڤدا
بێ سنوور!
من ناوم پاییزە پرسیارە
دەستێکم کۆچ ئەکاو هەڵدێت و
دەستێکم تەیرێکی سەرسامەو ئەترسێ و
سەریشم دەریاچەی هەڵچوون و هەژانە..
ڕووناکیی ئەشکەنجە: تریفەم. زمانی باوبۆران: ڕۆمان و قەسیدەم
لەتوونی ئەم سەرە گەرمەیشدا، نێڵەنێڵ، گلۆڵەی ئاگرۆکەی
گومانم لرفەی دێ و پرسیارم پڕێتی لە هەڤی هەپڕون و لە
خەونی لەت و پەت، لە ئەوقێ گیرخواردوی بەردەمی دۆش دامان.
ڕووناکییم ماندووە ئەوەندە هات و چۆی بەنێوان گەواڵەی
نەبارو بەڕۆحی تاریکدا کردووە. تریفەم دەفتەری دڵدارەو
پەپوولە حەرفێتی و دێڕیشی شاباڵی باڵندەی خەیاڵی پاییزەو
شکستی دیرۆکێ لە سەرپشت لەناویا نوستووە!.
ئیستاکە من ناوم پاییزی یاخییە
دەستێکم گوناە و دەستێکم تۆبەیەو
سەریشم لەنێوان گوناە و تۆبەدا
پلیکەی زەمانی تاوانە..
من ئیستە نیشتەجێی سەفەر و پاییزو تەنیاییم. جێنیشتەی بێ وڵات

[1] بژنگ: پریشك

هەر خۆم و خولیایەك لە عەشقی دەرکراو. لە عەشقی
ڕاونراو. لە عەشقی بەر ڕەجمی کفرو بەرد.
بەر ڕەجمی ئەو دارو جەڵدانەی لە شاری
حەرام و لەمێژووی نەفرەت و لە بەردەم خەلیفەی دنیادا بەسەرما
بارین و لێمدران!. لە جەستەم دەرکرام. پرسیاریان وەك دەمی
بەراز و شووشەی مەی قفڵدام. پرسیاریان حەواڵەی بەردەمی
شمشێرو شیر کردم. پرسیاریان لەئاگری دۆزەخی کتێب و لە لەژمی
گوناه و لە لەژمی تاوان و موشریکین هەڵکێشام.
ئیستاکە من ناوم پاییزی یاخییە.. یاخیبوون لە ڕەگی درەختی نەزۆکم،
یاخیبوون لە تەرمم ئەو وەختەی کە لەشم ئەبێتە ئاوێنە بۆ مەرگم،
یاخیبوون لە وەسێت ئەو دەمەی کە وەسێت ئەبێتە تابوتێ بۆ لەشم.
من ناوم پاییزی یاخییە.. ئەمجارە من سەری قەسیدەم نادەمە دەست
(با)یەك کە ئەسڵەن لە باوەش وەهمێکی ناو لم و جادوودا هەڵیکرد.
ئەوەتا دەستێکم کراوە بە جەڵدە بۆ خۆم و
دەستێکم کراوە بە تابووت بۆ خۆم و بۆ ژنم و
بەڵام من ئەم سەرەم
هەر سەری خۆم نییە و
سەرێکە من لەلای خواوەندی ڕووناکیی و
خۆرەکەی عەقڵەوە هێناومە!

# ئەو وشانەی کوشتمیان!

شیعرێکی چیرۆك ئامێز

**درەنگە گریانی، پاییزەو**
**یەك شەممەی ئەوروپا چۆڵ و هۆڵ**
**لە منداو، وەك جادەیش لە دەرێ.**
**درەنگە سەفەری، پاییزەو**
**یەك شەممەی ئەم شارە تەڵخە تەڵخ**
**لە منداو، چون ڕەنگی غەریبان لە دەرێ.**
**ڕوخسارم بنچکی گەڕۆك و گەواڵەی بێ ماڵی دەم (با) یەو**
**لە خۆوە خول ئەخواو لە خۆوە سەر ئەکا بە قوللەی ناوتەمداو**
**بە کوچەی ڕەشەبا و بە شەوی بەفردا و تووناو توون خەیاڵی**
**ترافیەی[1] ئەڕوات و سەرگەردان ون و وێڵ پووشوەو باویلکە و ئەگەڕێ.**
**ڕوخسارم ڕۆژنامەی پرسیاری قەدەغەی بێ خوێنەر.**
**هەناوم چون ناخی بەتاڵی گیتارێ کپ کپ و تاساوو**
**وائیستەیش دوو هەنگاو لەولاوە ئەبینێ:**
**لەشێوەی پارچەیەك کۆنسێرتی مۆسیقای بەخوڕدا**

---

[1] ترافیە: غوربەت

بارانێك ئەبارێ. ئەبارێ و ئێوارەی بەردەمم هاژەی دێ.
بارانێك شێت بووەو لە بەریا هەڵدێت و ڕائەكا شەقامی
شپرزەی بێ چەترو، ئەشڵەژێ درەخت و، گزەبای پێش
تۆزێ لەناكاو دڕ ئەبێ. ئەبارێ و ئەبارێ. غەریبیم
كووڕبووەو تەنیاییم لە ئاودا شڵپەی دێ. لەپڕێ:
چەرداخی ژنێكی گوڵفرۆش، چەرداخی دوكانی سێ گۆشەی
هانایەو بەفریاو ڕامئەگرێ. ژنەكە خۆی سیس و لە دەشتی
پەژموورەو تەیمانی شكاوو گیایەكی زەرد ئەچێ. بەڵام گوڵ
ڕیزە گوڵ، لە زاری دووكانی بچووكدا، وەك چەند ڕیزپێكەنین،
بریقەی گەش گەشی دڵۆپی ڕووناكیان لێوە دێ. لەوێدا
ئەوەستم. نامۆییم لە تەیری تەڕ ئەچێ. لە تەیرێ بیەوێ
هەڵفڕێ و بەڵام باڵ نەیەت و نیوەی لەش گوێ نەگرێ.
لەوێدا ئەوەستم:
ئەوەستم و بارانیش ناوەستێ. ئەبارێ و ئەبارێ
هەڵبەزو دابەزی پەڕەكەی دڵۆپی درشتی سەرزەوی
كاشی ڕێژ، جادوویەك لە چاوم ئەكات و تەماشام
ئەبات و خەیاڵم لە داوی باران و لە ئەڵقەی
دڵۆپی سیحراویی گیر ئەبێ!
""من لەكوێم؟!".. بووم بە پەڕ، بە پووشوو،
"با" كە دێ و بەرەو خوار ئەمبات و هەر ئەمباو،
ئەمخاتە تونێلی گڤەوەو خێرایەو، ڕۆژهەڵات،
خەونی دوور، ڕووگەیەو، كزەیەو، هەناسەو،

فرمێسکەو خۆزگەیەو ناوەستێ!.
"بۆ هاتم؟!" گەوجێتی لە شێوەی تابووتی وڵاتدا
ئەبینم و، خۆم مردووی قوڵایی تابووتێ. یادگار،
بۆنێکی بۆ ساردی ناو خەون و تەمەنەو چارەنووس
باڵندەی قەترانیی ئاسمانی ئەجەلێ!.
خودایە بۆ هاتم؟!
دوای ئێرە هەر تۆی لێی
بچمە کوێ!
"تاکوو کەی؟!" نادیارێ لەشێوەی سەرابدا،
ئیستامە؟! دوا ڕۆژمە؟! نازانم.. ئەو بەشوێن
بڕیارما ڕائەکاو نایگرێ!.
چەخماخەی نزیکی ژوور سەرم هەڵئەبێو
گرمەیەك لەشێوەی وەڵامێك تووڕەدا
خەیاڵم ورد ئەکاو.. خەونیشم
وەك شووشە ئەهاڕێ!
دێمەوە ژێر چەرداخ
ئەبارێ و ناوەستێ و ئەبارێ. تەماشام شڵپەی
دێو بیستنم شڵپەی دێ و ئەبارێ. بەنێوان
ڕایەڵی ئەستووری باراندا لە سەرێ تا خوارێ،
پرسی تەڕ. خولیای تەڕ. تەنیایی کەسیرەم،
وێڵە فڕ، ئەگەڕێ!. هەر لە ژێر گۆپاڵەی بەزەبری
بارانداو لە پڕێ، ڕێکەوتی سەرنجم، لە پڕێ،

شتێکی تازەتر لە باران، لە ئەرزا ئەبینێ:
"لاپەڕەی خوساوی ڕۆژنامە، سەردێڕی
مانشێتێ، هەر ماوەو، چاوانی حەرفی ئەو،
لەجۆگەی ئاویشدا هێشتاکە زەقەی دێ.
مانشێتێ هەنگاوی بینینم ڕائەگرێ. ئەلکێت
بەخەمماو ڕامئەگرێ: تەنیاییم تەنیاتر، غەریبیم
غەریبتر، بێدەنگییم بێدەنگتر، نا پیاویم ناپیاوتر،
ئەکات و.. مانشێتێ لەوێدا بە وشە ئەمکوژێ!!
مانشێتی تفی ئەو لە منەو لە ڕوومەو بەزاری
سویدی عارێکم ئەنووسی و هێڵکاری نەفرەتێ لە
تەختی تەوێڵما ئەکێشێ:
باوکێکی کورد لێرە
کچەکەی بە چەقۆ سەرئەبڕێ!
چەخماخە هەڵئەبێ و شەرمەندەی
بەردەمی بارانم و شەرمەندەی بەردەمی
گوڵفرۆش.. شەرمەندەی بەردەمی
غەریبیم.. تەریقی بەردەمی شیعری خۆم!
یەك گرمە. دوو گرمە. سێ گرمە
لەشێوەی وەڵامدا لێم ئەدەن.
خەیاڵم لەت و پەت ئاو ئەیباو،
دێمەوە ژێر چەرداخ!.
من ئیستە تارماییم، بەڕێکەوت چاوێکم هەڵئەفڕێ

بۆ ئەوبەر شەقام و لەبەینی پژوپۆی باراندا،
ژنێك و سەگەكەی ئەبینم، ئەوانیش
بە پڕتاو هەڵدێن و تارمایین هەر یەكەو لە ڕەنگێ،
ژنەكە زۆر سپی و چەترەكەی گوڵ گوڵی و
سەگەكە قەترانی و ئەگەنە
لای من و لەناكاو سەگەكە ئەگەڤێ، ئەوەڕێ
بۆ دێڵێ هەر لەولای منەوە.. بۆن ئەكاو لمۆزی
هەڵئەبڕێ. دوو سێ جار ئەوەڕێ. كەچی من
هەست ئەكەم، ئەو سەگە، بە من و بە چەقۆی
ناو دەستم و بەكورد و بەڕەنگی خێڵەكیم ئەوەڕێ!
وژەی با هاتۆتە ناومەوەو لوورەی دێ.
خوڕەی ئاو هاتۆتە ناخمەوەو لافاوێ لە شەرما
سەر ئەكاو هەڵئەسێ!.
غەریبیم تێكەڵی قوڕاوەو..
تەنیاییم خەریكە بخنكێ..
بارانەو ئەبارێ و بارانەو ناوەستێ!

# من لەویَ ئاویَكی خنكاوم!

**من لۆش لۆش. من لەویَ. ئیَواران**
**بەویَنەی هەوریَكی نەخۆشی زەردەڵەی بێ تاقەت**
**چۆن خاوخاو ڕێ ئەكاو لارەلار دەس ئەگریَ**
**بەقەراغ چەپەری خۆرئاوای ئاسۆوە بۆ ئەوەی نەترازیَ و**
**بۆ ئەوەی نەكەویَ. ئیَواران من لەویَ.**
**لەسوید وا ئەڕۆم!**

**من لەویَ پیاویَكی دارییناو قوڕینم**
**بەكەسكیش بۆیاخیَ كراوم بۆ جوانیی**
**بەلاَم ئاخ!**
**من سەرم سنووقی خەونیَكەو كلیلی ون بووەو**
**هەر لەڕێ تیشك ئەمریَ و ناگاتە ناو ڕۆحمو**
**من لەویَ ئاویَكی خنكاوم!**
**من لەویَ بەویَنەی پیاویَكی ڕۆبۆتی لەش قورسو**
**سەعاتم تەمەڵەو وەك پڕبم**
**لە پارچە ساچمەو**
**لە وردە ئاسنی ژەنگاوی و**

لە قوتوی تەنەکەی قوپاوو
لە شووشەی شکاوی خواردنەوە.. ئاوەها ڕێ ئەکەم.
من لەوێ، من لۆش لۆش
بەرمیلی خۆڵم و ئەڕۆم و
ڕیکلامی دڕاوی دیوارم و
لایەکم بەربووەو
با یارییم پێ ئەکاو ئەمهێنێو ئەمبات و
نایشکەوم..
من لەوێ. من لۆش لۆش. هەنگاوی نابینام
وەك خەمی گۆترەبم ئەمگێڕێ و لەگیانم ون بووم و
لە لەشم ون بووم و من بەردێ نابینم بمناسێ و
گەڵایەك مەرحەبام لێبکاو..
هەوایەك گوێیەکم لێ بگرێ و
شەقامێك ڕاستەوخۆ بمدوێنێ و بێ ناوم!
من بەناو پاییزێك لەوەرزی وێڵ بوون و
خەیاڵی شکست و
تەمەنی پەشیلما[1] ڕێ ئەکەم
بۆ ئەوەی ئێواران هەر وەکوو لەق لەقێ
دابڕاو لە پۆلی کۆچەران.. بە تەنیا بچمەوە
نێو نسێی کارتۆنی شوقەکەم.
من لەوێ پاییزان

[1] پەشیل: وێران

وەك ئەوەی کە خەزان بە سوغرە بمگرێ
بۆ ئەوەی چی گەڵای وەریوی سەر ئەرزە
یەك بە یەك بەمنی بژمێرێ!
هەست ئەکەم وا ئەژیم من لەوێ!.

*

من لەوێ. درەختی شیعرێکی وەڕسم. ئێواران
ناوبەناو ئەچمە نێو دارستان. دارستان یەك
پەلکی خەفەتم ناناسێ. هەست ئەکەم پێی وایە
دارێکم گول بووم و هەڵاتووم بۆ ئەوێ!
هەست ئەکەم کورسیەکان
حەزناکەن دانیشم لە سەریان!.
بەفرەکەی ئەمبینێ و تەماشای ڕەش ڕەشە!.
ڕۆژنامەی دڕاوی ناو میترۆ..
ڕوخساری لە ڕووی من گەشترە.. ناو بەناو
من لەوێ کە ئەچمە سەر زەریا
ئەو زەریا گەورەیە ناتوانێ..
پووشێکی بێزاریم ڕابداو.. ئەو زەریا گەورەیە ناتوانێ.
تەنیایی یەك ڕۆژم بخاتە سەرپشتی و
ناتوانێ یەك دلۆپ فرمێسکم
لە خۆیدا بزرکا!
هەندێ جار، من لەوێ تەنیاییم هێند چڕە..
هەموو جار، خۆرەکەی، مۆسیقای، سەماگەی تا نیوەی

ڕێگا دێن ئەشکێن و ناگەنە ناو ڕۆحم..
من لەوێ تەنیاییم ئەوەندە تەنیایە..
گەر جارێ بە سەردان.. بیابان
قاقڕیش بێ بۆلای..
هەست ئەکا ئەوجارە. کۆتایی دنیایە!

★

هەر لەوێ جادەکان ڕووناك و ماڵەکان ڕووناك و
بن ئەرزیش ڕووناك و وەلێ من هەورێکی زۆر تاریك.
هەر لەوێ بەرەو دوا کافتیریاو بارەکان ئاپوورەو
بە ژاوەو جماون لە خەڵکا.. وەلێ من شیعرێکی زۆر چۆڵ و
زۆر تەنیا. هەر لەوێ گوڵفرۆش زۆر زۆرن و ژنە
گوڵ زۆر زۆرن و وەلێ من پەلکێکی ناو پاییز.
بەهار دێ و هاوین دێ و وەلێ من یەك فەسڵ و هەر
پاییز. وەلێ من ڕوانینم لیخن و وەلێ من دەقیقەو
سەعاتم ژاکاوو پێکەنین چرچ و لۆچ هەر لەوێ.
جاروبار، هەر لەوێ فرۆکە ئەمباتە ژوور هەورو
خەریکە دەست بدەم لە چوکلەی ئەستێرە..
وەلێ من لەوێ نیم.. لەخوارێم
لای ئێوەم.. پاییزە ئازیزان
هەر لێرە!!

# سی و سێ

# پاییزە میوانی بچکۆلە!

"دەیان لەتە ئاوێنەی شکاوی هەتاوی پاییز. سەدان
وێنەی بابردووی ئەم وەرزە. خەزان لە ژندا و ژن لە
خەزاندا. هەڵوەرین وەک پەند. شیعر لە جەستەی چیرۆکدا،
هەناسە هەرە کورتەکانی سروشت. خوێندنەوەی خەمە وردیلەکان
نووسینەوەی چرکە ساتەکانی ماڵئاوایی. کورتە فیلمەکان.
هەوێنی شیعر. ڕەنگدانەوەی تەنیایی لە عەشقە کوژراوەکاندا.
دارژانی ڕۆمانسیانەو مانگە شەوی نەمرو، توانەوەی هێواش.
درەخت و گەڵا وەختێ ئەبنە مرۆڤ"

-1-

هەموو ساڵێ لە تشریندا
"با" یەك فێربووە بە پاییز
بایەکی دز دوای نیوەشەو دێتە سەرێو
هەرچیەك ئەم هەڵیڕشتووە لە ماڵ و
لەناو ژوورو لەبەردەرگاو لە پێدەشتدا
بە چەند جارێك هەمووی ئەبا.

ئەڵێن ئەم (با)یە یەکێکە
لە چەتەکانی سەرچیا..
چەتەیەکە لە چەتەکانی زستان و
بەر لەوەی زستان خۆی بگا
بۆ دوا چاو ترسێنی پاییز
ئەم دزە بایە ڕەوانەی
خوارێ ئەکا!.

-2-

ئەم پاییزە ڕۆمان نوسێکە عەبەسی
هەموو جارێ فەسڵێ دوو فەسڵ سێ فەسڵ
لە ڕۆمانەکەی ئەنووسێ و لە پڕێکدا نیوە شەوێ
دێ بەسەریا و ڕۆمانەکەی فڕێ ئەداو لە دواییدا
پەڕە پەڕە ئەیدڕێنێو بە "با"ی ئەدا..
تۆ تەماشای ئەو دەشتەکە!
هەر لە خەیاڵی ڕژاوو
گەڵای وشەی هەڵلەرزیوو..
پەڕەی دڕاوی هەناسەو
پەرەگرافی سێبەرو
دەستەواژەی ناو زوقمەوە
چی وەریوەو چی کەوتووە!
تۆ تەماشای ئەو دەشتەکە!

-3-

مەولەوی پاییز بوو

هەرجارێ گورگە زێی باران و خۆرەتاو

لەسەریا تێکەڵی یەك ئەبوون

ئەوساکە

ناوڕیشی پڕ ئەبوو لە وردە پەپوولەو

کانییەك لە ڕۆحیا هەڵئەقوڵاو

ناو دەستیش پڕ ئەبوو لە نوورو لە شیعرو

بەکزەی هەناسە خەیاڵێك

گوڵێکی پاییزە لە دڵیا ئەپشکووت

مەولەوی پێکەوە ئەباری و ئەوەری

پێکەوە ئەوەری و ئەسووتا

ئەوساکە لەسەر ڕا

کاوانی مێزەری، بازنەی تەمێکی

تەنکی ئەگرت و

لەخوار ڕایش

ناو تاق و پەنجەرەو ژوورەکەی

پڕ ئەبوون لە گەڵا!.

-4-

بەرمده! شەماڵێك کە چەمکی کراسی ئاوریشمی

توتڕکێ گرتبووی. وای پێ وت

بەرمده! من ئەچم بۆنێکی ئەو باخە

بۆ عەشقی ئەو کچە ئەهێنم!

بەرمدە! مانگەشەو کە هەورێ
ئەگریجەی گرتبوو. وای پێ وت
بەرمدە من ئەچم ئاوێنەم بەرامبەر
مندالّی هەلّەبجە ڕائەگرم!
بەرمدە قومرییەك کە داوی پژوپۆی
درەختێ گرتبووی، وای پێوت
بەرمدە! من ئەچم نامەیەك
لە بەفری لوتکەوە بۆ گڕەی گەرمەسێر ئەهێنم!

بەرمدە! من وتم!. کە تەمێك بەردەمی
پەنجەرەی گرتبووم. وام پێوت
بەرمدە! من ئەچمە لای پاییز
جوانترین خەیالّی مانگەشەو
بۆ ساتی تەنیایی و ژوورەکەم ئەهێنم!

-5-

لەو شەوە زەنگە ڕەشەدا
گولّ ئەستێرەیەك سەد گەلاّی پەرەوازەی
پاییزێکی لەخنکان و لە نوقم بوون.
لە گۆماوێکدا ڕزگارکرد..
وەختێ ئەوان لەبەر چەپەری تاریکیی
نە کەنارو

**نەبواری پەڕینەوەو**

**نەمردنیان نەئەبینی**

**بەڵام گوڵ ئەستێرەی خۆبەخش**

**بەرامبەریان لەو پەڕەوە**

**چووە سەر تاشە بەردێك و**

**خۆی داگیرسان!**

-6-

**دایکم ئاوەو**

**کە گەورە بووم بووم بە شیعر**

**من ڕۆژێکیان لە بەردەمی شەختە ئاوێنەی پاییزدا**

**ڕاوەستابووم سەیری ساڵم و سەیری دەم و چاوی خۆم و**

**دەست و پەنجەی خولیاکانم و جەستەم ئەکرد!.**

**لە پڕێکدا لە پشتەوە ئاگرێك هات**

**شەختە ئاوێنە توایەوەو.. ئاگر هات و**

**پەلیکێشاو ئیتر ساڵم و خولیاکانم و دەست و پەنجەو**

**دەم و چاوم**

**یەك لە دوای یەك**

**بوون بە نمەی زەنگیانەیی**

**سەر شان و ملی پاییز و**

**بوون بە دڵۆپی زیوینی..**

**سەر گەڵاکانی خەیاڵی و**

منیش وەك شەختە توامەوە
دیسانەوە
گەڕامەوە بۆ سەرچاوەو
تێکەڵ بە دایکم بوومەوە.

-7-

پاییز بە خەتێك ئەنووسێ
کەم کەس ئەتوانێ تێیبگاو
کەم کەس بۆی ئەخوێنرێتەوە!
هەر وتەی سەرو قژبژەو، دێڕی شڵەژاوی (با)یەو
هەر ناوی ڕاڕاو دوودڵەو، ئاوەڵناوی شپرزەیەو،
پەلکە حەرفی ئاڵۆزکاوی ناو دەوەنەو
ئاوەڵکرداری ناو تەمەو...
بەردی نوختەو
کرمی فاریزەی ناوەندەو
هەموو چوون بەناویەکتردا..
پاییز بە خەتێك ئەنووسێ
تەم و مژیی، شکستەیی، گەردەلوولیی
کەم کەس بۆی ئەخوێنرێتەوە..
لەو چاوانەی لەسەر خوێندنەوەی باگژەو
نامەکانی گێژەڵووکەو. قەسیدەکانی چڕستان
لەگەڵیداو، لەسەر خوێندنەوەی پەخشانی

ڕاکشاو لەناو پێدەشتدا.. ڕاناوەستێ
ئەو عەشقانەن
چاویان لە چاوی تشرینی ناکامدایەو
ئەو ئێوارەی نیگایانەن
کە سەرتاپا وەکو ئاوی نێو دارستان
وەکوو کورسیی نێو باخچەکان
وەکو دڵی بێوەژنان
ناکام پۆشو
خەزان پۆشن!

-8-

لە پاییزدا
من ڕووناکیم لە ڕووباردا بینیوە
لەناو سەرما
خۆی بە گەڵای هەڵوەریو داپۆشیوە.
لە پاییزدا
من درەختی شێت و شەیدای وامدیوە
بۆ بینینی
مانگە شەوێ
تا بەیانیی
لە ئاودا هەڵلەرزیوە.

-9-

لەسەرێ بۆ خوارێ

خەزانێ پەلکێکی زەردکی هەڵدایە خوارەوە

چیلکەیەك لە ئاودا گرتییەوەو

کەوتە نێو باوەشی!

پەلکەکە شەرمی کرد!

چیلکەکە سەیری کرد.. ناسییەوە

ئەم پێی وت: ئەمناسی؟!

تۆ کچە دراوسێی لقێکی گەڕەکی خۆمان بووی

ئای خوایە! ئەوساکە چەند جوان بووی، ئێواران

بە کاڵای سەوزەوە لە هەیوان ئەوەستای

کوڕ گەڵای ئەو ناوەت شێت ئەکرد!

لە بیرتە پەپوولەم چەندجار نارد بۆ ماچێ

هەر نەتنارد! لە بیرتە؟!

وا ئیستەیش کەوتویتە باوەشم.. بەڵام ئاخ

لەدوای چی؟ من چیلکە پیاوێکی پیرەمێرد

تۆیش گەڵاژنێکی پیرێژن

"شەپۆلێك شانێکی لێدان و

خەریك بوو نوقم بن!"

چیلکەکە هەناسەی سوار بووبوو.

ئاخێکی هەڵکێشاو..

**ئەمجارە وتیەوە:**

**زەمانە!.. چی بڵێین!**

**دە توخوا حەسرەتە لە دڵما و با نەیبەم بۆ ژێر ئاو**

**بۆ دواجار ئەو ماچەم بدەرێ**

**بەرلەوەی پێکەوە هەردووکمان بخنکێین!.**

-10-

**پاییز شەوی درێژی خۆی**

**کرد بە تۆمار بۆ حیکایەت**

**لە دواییدا کە شەوانە لەسەر چیچکان**

**لەناو تەمێکدا دائەنیشت. تۆمارەکەی ئەکردەوە**

**بۆ هەر شەوەی چیرۆکێکی لە چیرۆکی کۆچ و غەدر**

**هەڵئەبژاردوو.. بۆ منداڵانی ئەنفالی**

**ئەو پێدەشتەی ئەخوێندەوە!**

-11-

**لە دەرەوە**

**پاییزە کورد، هێندە زۆربوون**

**لەخەزاندا، گەر تەماشای جادەکان و**

**کەنار زەریاو، بەرپێی پەیکەرەکان بکەیت**

**فرمێسک ئەبینی گەڵایەو**

**وڵات تەنها خەیاڵێکی زەردە گیایەو**

كە گوێشت گرت

گوێت لە هەناسەی ڕژاوەو

گوێت لە خشەخشی یادەو

گوێت لەو نەورەسانەیش ئەبێت

نزیك ئەوان

ئاخ بەكوردی هەڵئەكێشن!

-12-

لە هاوینەوە بۆ پاییز

جرجەكان و گۆڕهەڵكەنە..

لەژێر شەوی هەوراماندا..

هەرچی كاربێ بۆ هەڵكەندن نەیانماوە

بێ ئیش.. بێ ئیش، لەو بنەوە

بە چوارمشقی دانیشتوون و، گوێیان گرتووە لەسەرێ

تابزانن كەی جوندەكانی ئیسلامی گۆڕهەڵكەنە

هەتاو ئەیانكاتە دەرێ!.

-13-

گەردەلوولێكی پاییزە لە دەشتێكدا و تەپ و تۆزێ.

هەر ئەو ساتە گەردو پووشێك ئەچێتە چاوی بازەوە

لەو وەختەدا كە ئەیەوێ دابنەوێ

بۆ سەر زەوی و چنگی بەرێو

پۆڕێك بگرێ!.

ئەو گەردوو پووشە بچووكە

هەڵمەتی باز پەك ئەخات و
پۆڕیش لە مەرگ قوتار ئەبێ!

-14-

قەپێکی ئامادە بۆ سەری مامرێ
دوو هەنگاو پێش ئەوە.. چقڵێکی پاییزەی سەرەڕێ
لەبن پێی ڕێویەکە ئەچەقێو
ڕێویەکە لە جووڵە ئەکەوێ و دەمیشی داپچڕاو
مامریش ئەڕوات و نازانێ چی ڕوویدا؟!

-15-

لێلاوێك و
باپووسکەیەك
لێلاوەکە ماسییەکی بچکۆلانەی
لە چاوی باڵندەی گۆشت خۆرو دەنووکی بزر کرد!.
باپووسکەکەیش بە بەفرەوە، ڕاوچیەکی
لە ڕێ وێڵ کرد..
وەختێ کە ئیتر نەیتوانی..
نیشانەکەی بگرێتەوەو
ئاسکەکەیش بدۆزێتەوە!

-16-

وەختی خۆی ڕەشەبا هەر نەبوو
ئەم ناوە هەر نەبوو..

له جێی ئەو شتێك بوو، سپی با، شنەیەك
لاواز بوو وەك پاییز
لەسەرخۆ چون گۆم و
هێمنیش وەك بەفر!
وەختی خۆی ڕەشەبا هەر نەبوو
لەجێی ئەو شتێك بوو، سپی با، سروەیەك
ئەم دەنگە لە هۆزی بارانی هێواش و
باڵندەی دڵدارو خەیاڵی ناسکی پاییز بوو..
لە گەوەی چیادا وەکوو ئاو دڵنیا ئەژیا..
ڕۆژێکیان بیابان بۆ غەزا
کە چووە سەر چیاو هۆزەکەی بارانی قڕکردو
بەشمشێر هەتاوی سەربڕی و
بە شمشێر خەیاڵی ناسکی لەت لەت کرد
ئاگری بەردایە باڵندەی دڵداران..
لەتاودا ئەو عەشقە لاوازە ئەو شنە ئارامە
شێت بوو شێت.. نالآندی و گڤەی کرد
یاخیی بوو لە دنیا
لەو چرکەساتەوە ڕەشەبا پەیدا بوو
ڕەشەبا واخولْقا!

-17-

بەرێزەوە..

"با"یەك ئەنووشتێتەوە بۆ پاییز
بەڕێزەوە..
پاییز ئەنووشتێتەوە بۆ عاشق
عاشق بۆ عەشق
عەشق بۆ خەیاڵ
خەیاڵ بۆ من و
منیش بۆ شیعر!

-18-

پۆلە باڵندەی ڕەوەندی
ئاسمانێکی خۆڵەمێشیی لە ژوور سەرم و
دار لیمۆ تاقانەکەی حەوشەی ماڵم و
لە شەویشدا بریسکەی ئاگرێکی دووری گڵەزەردە
هەموو ئەڵێن:
ئەرێ دایکت بێزار نەبوو
لەبای گەرداوێ کە پاییز بە وژەوژی تەڕەوە
لە زەریاوە ئەیهێنێت و هەموو جارێ وەکوو تەیرێکی
نابینا خۆی ئەکێشێ بە پەنجەرەی ژوورەکەیداو
ناهێڵێ تۆزێ بخەوێ..
بێزار نەبوو لە ورتەورتی گەڵاکان بەر لە نووستن
لە چرکە چرکی سەعاتی ناو تەنیایی فرجینیا
لە زیکەزیکی لق و پۆپ تا بەیانیی

له بۆڵەبۆڵی هەورەکان پێش داڕژان
ئەریٚ دایکت بێزار نەبوو.
وەکوو جۆگەیەك بیبەستیٚ
دایکم ناتوانیٚ زۆر بدویٚ
دایکم ئەڵیٚ:
پێیان بڵێن:
چۆن بێزاربم
که من هەر بۆ خۆم خەزان و
که من هەر خۆیشم پاییزم!

-19-

لەمبەرەوە من چەند دەنکیٚ
له برووسکی سەرنجدانم
گرته بەژنی ژنه هەوریٚ
بەری کەوتو
له پاش تۆزیٚ لەناو هۆڵدا بوو به باران!
لەوبەرەوە ئەو چەند تیلماسکیٚ له تەم و
چەند گەڵایه له هەناسەی زەردباوی خۆی تێگرتم و
بەرم کەوت و ئەمجارەیان هەر ئان و سات
لەناو هۆڵدا بوو به خەزان!

-20-

خەریك بوو، شیعرێکم، خەوێکم، گۆمێکم
ئەنووسی بۆ پاییز..

لەناكاو، لەوەوە، پۆستێكم پێگەیشت
پۆستەكە زەرفێكی لاكێشی خۆڵین بوو
بە باڵا هەر بەقەد لاسكە گیای گەردنی
كورتترین چیرۆك و
بە قووڵییش هەر هێندەی قووڵایی
گیرفانی منداڵیی خۆم ئەبوو!
بە سەروو زەرفەوە، دوو گەڵا، دوو پوولی خوێناویی:
برینی، ژنێكی ماردیینی پێوەبوو!
ئەو وەختەی بە نووكی مەراقێ، بێ تاقەت
زەرفەكەم هەڵپچڕی
چیم بینی؟.
هەورێكی بچكۆلە ئەوەندەی سەری خۆم
گرماندی و داباری و هەر یەكسەر
ژوورەكەی پڕكردم لە بۆنی مەولەوی!.
یەك گوڵدان پڕ لە تەم..
كت و مت بە شێوە كەركوكیی!.
دوو پەیڤی حەرام و بریندار.. دوو ڕەنگی
قەدەغەو دوو ئاگری پیرۆزی
مەسحەفی ئێزیدی!
دوو پیاڵە سەر ڕێژبوون..
لە زەردەی خوێندنی دوو سوێسكی
بن سوخمەی كچێكی سنەیی!

پەرداخێك لێوان لێو لە بادەی مەراق و
نامۆیی شەوانەی بێکەس و
هەروەها.. دوو تاڵیش لە قژە زەردەکەی،
بووکەکەی پاییزی گۆران و
دوو هەودای چریکەیش لە دەنگی دیلان و
دوا شتیش لە شووشە عەترێکی خاڵیدا
دوو ماچی قەتیسی دایکم بوون...
بە خۆم وت
کە پاییز ئەم هەموو ژانانەو
ئەم هەموو جوانیانەو ئەم هەموو
شیعرانەی ناردبێ..
تازە من شیعری چی و خەمی چی و
گۆمی چی بنووسم بۆ پاییز
ببوورن من هاتم بۆ ئێرەو
شیعریشم نەنووسی!

-21-

هەریەك جار ڕەنگێکی بەهارە کە هاتە چاومەوە
من ئیتر ناسیومەو دووبارە لە هەرکوێ بیبینم
بۆ چاوم هەر هەمان ڕەنگەکەی جارانە
جارێکیان دوای دە ساڵ.. لێرە نا.. لە دەرێ
پەلکێکی نیسانم بینیەوە.. من پێم وت
ئەوە نیت من ڕۆژێ لە شایی قەشقۆڵی

تۆم بینی لە ئاودا و بە سواری کەڵەکێ.. وتی با..
جارێکیان دوای بیست ساڵ لێرە نا.. لە دەرێ
گوڵێکی بەهارەی چاوڕەشم بینیەوە من پێم وت
ئەوە نیت من ڕۆژێ بینیمی ئەچوویتە
سەیرانی بێخاڵ کوڕێکی موو زەردت
لەگەڵ بوو، شێت بووبوو بۆ چاوت و گۆرانیی
"ماملێ".. وتی با..
کەسك کەسکەو هیچیتر
سوور سوورەو هیچیتر
یەك ڕەهەند لە وەرزو
یەك ڕەهەند لە بینین!
نەهێنیی ڕەنگی تۆ پاییزم ئەوەیە..
لە ئاسۆی یەك ڕەنگتا.. خەرمانێ لە ڕەنگی
جیاوازو لەیەك دێڕ ماناتا.. چەند ڕووبار
لە مانا ئەبینم
"ئەو وەختەی کۆچ ئەکەیت
نازانم کۆچ بۆ کوێ؟!
ئەو وەختەی ئەپژێیت
نازانم پژانی گریانە یان خەندە؟!
لەبیرتە تشرین بوو، بەیانیی بینیمی، زەردباو بوویت
ئێوارە هاتیت و بەڕەنگی برۆنزیی گۆڕابوویت؟!
نەمناسیت!

**لە بیرمە لە کەنار گۆمەکەی دوکان بوو..**
**جارێکیان باگژە تۆی هێناو خۆڵاویی و پەشۆکاو**
**لەپڕێ ئەوەندەی تروکەی چاوانی شەپۆلێ،**
**بینیمیت بە سواری گەواڵەی شەرابیی بارانێ..**
**لە پێشدا نەمناسیت تۆ ئەوی.. تا نەمدی**
**لە کۆڵتا کۆڵوانەی پەپوولەو خەزانێ..**
**سەوز سەوزەو زەردیشە و مۆریشە لە تۆدا..**
**قژی کورت لە ڕۆژتا.. چیرۆکی کورتمەو..**
**هۆنراوەی کورتمەو..**
**ئەو قژە درێژەی شەویشت..**
**قەسیدەی درێژم و.. پاییزم!..**
**من بۆیە ئاوێنەی ڕۆحتم خۆش ئەوێ**
**لە ناویا من کۆچی ئازیزو.. سەفەری**
**ئەبەدیی ئەوان و.. من سیمای دایکم و**
**دیرۆکێ لە ئازار.. دیرۆکی**
**ئازاری باڵندەی کوژراوم ئەبینم!**

-22-

**من هەڵووژەی مەراقێکم**
**لە دار فرمێسکی پاییزێ موتوربەکرد!**
**داری تازە کە باڵای کرد**
**نە هەڵووژەی مەراقم بوو**
**نە دار فرمێسك**

لەنێوانی هەردووکیاندا دارێك دەرچوو
هەندێ شێوەی گوڵ هەڵەبجەو
هەندێ شێوەی دار ئەنفال و
تۆزێ لە ڕەنگی کەرکوك و
کەمێك لە هەوری دایکیشمی لەچاودا بوو!
بە قژی زۆر درێژیشیا
هەر کت و مت لە شۆڕەبی شیعرم ئەچوو!
دارێك دەرچوو
لە داری تر هەر نە ئەچوو
درەختێ بوو لە تاو ئازار
-وەکوو پیاوەکەی هەڵەبجە- قاپووت بەشان!
شێت بوو بوو شێت. درەختێ بوو لە شۆستە هاتبووە
خوارێ و بەسەر شەقامدا ڕای ئەکرد! درەختێ بوو
بە لق لەسەری خۆی ئەداو وەکوو پیاوەکەی هەڵەبجە
هەر ئەڕۆیشت و لەبەر خۆوە قسەی ئەکرد!

-23-

من بەرچنەیەك پەپوولەم..
هەڵڕشتە ناو دۆڵێکەوە، لەو سەرەوە
گوڵە منداڵ بەخلەخل هاتنە دەرێو
بووبوون بە باخی پێکەنین.
باخێك منداڵم پژانە ناو زمانی کوردییەوە
وەختێ زانیم بە ڕیز فوارەی وشەو ڕستە

لەناو کتێبدا هەڵقوڵێن.
سەبەتەیەك لە گۆرانیی شاییەکانی شەهیدانم
ڕژانە ناو خەمەکانی پاییزەوە..
وەختێ زانیم لە کەناری گۆمەکانی سبەینێما
بە سەدان درەخت هەڵپەڕین!.
کە وەختێکیش دەسم بردوو..
من گۆزەیەك شیعری ڕوونم
ڕژانە ناو عەشقی ژن و ئازادیم و هونەرەوە
هەر ئەوەندەو کاتێ زانیم هەوری هێناو
بەسەرماندا بەتەپ و نم بەیەکەوە،
پەپوولەو گوڵ و منداڵ و..
وشەی چاوشین و بەفری سەوز
کەوتنە بارین!

-24-

هەر بێوەژنێ لەو خوارە
دەشتێکی چۆڵ وا لە ڕۆحیا..
نە "با"ی پیاوێ تیا هەڵئەکاو
نە چڵە گیای زارۆکێکیش تیا شین ئەبێ!

هەر بێوەژنێ لەو خوارە خەزانێکەو
ئاسمانێکی چۆڵ لەسەریا..
نە هەتاوێ لەودا ئەزێ و

نە تەیرێکیش پیا ڕەت ئەبێ!.
بێوەژنانی ئەو خوارە، لە ئیستەدا
ئەوەی ماویانە هەر دەمە
دەمیش نە بۆ حیکایەتەو نە بۆ ماچەو
نە بۆ ڕازەو نە بۆ گێڕانەوەی خەمە
دەمەو تەنها بۆیەك شتەو بۆ یەك وشە
ئەویش نانە
"من وام وت و لە ناکاوێ قەلە باچکەیەك
ئارداویی قاغ.. قاغ.. قاغ قسەکانی
پێ بڕیم و هات لەسەر شانم نیشتەوەو هەڵیدایە
-ئینجا باشە ئەیاندەنێ؟!
منیش وتم
-قاغ.. قاغ.. قاغ!

-25-

ئەمجارەیان ڕۆمانسیانە
وەکوو زەردە لەسەر کەلێ
باوەش ناکەم بە پاییزداو
ناو قەدی باریکی ناکەم بە خەرمانەو
نیگام بە هەوری چاوتەڕو تێی بئالێم!
ئەمجارەیان ڕۆمانسیانە..
لەسەر شۆستەی شەقامێك مانگە شەوو
لە سیلەی کوچەی خەزانی نێو باخێکدا

**ڕاناوەستم چاوەڕوانیم**

**گەڵا گەڵا هەڵبوەرێو**

**ڕاناوەستم من تەنیاییم**

**ببێ بەداری ڕووتاوەو**

**وەك تاڤگە لە بەردەمی بارێزەدا هەڵبلەرزێ..**

**هەتاکوو دێ!.**

**من ئەمجارە هەتاکوو ئەو**

**پەپوولەکانی نەنێرێ و گەڵاکانی خۆی نەنێرێ و**

**تکا نەکا من شیعرێکی بۆ بنێرم**

**لە ژوورەکەم ناچمە دەرێ!**

-26-

**درەختێك و**

**گوڵێك و خاڵخاڵۆکەیەك!**

**درەختەکە لەو هەموو کچەی کە هەیبوو**

**هەر ئەو کچە هەر ئەو گوڵەی بۆ مابۆوە.**

**گوڵەکە لە بەربێ خوشکی و.. لەبەر وەڕسی و تەنیایی**

**بێواز بێواز بێ تاقەت بوو..**

**خاڵخاڵۆکە کە سەرمای بوو**

**ئەیویست بفڕێ و بگاتە دارەکەی ئەوبەر**

**بەسەردانێ بۆلای خاڵی!..**

**بەڵام هەرچەندی کرد لە خۆی**

**لەبەر زوقم باڵەکانی نەکرانەوە**

باڵ تەزیی بوون... وای خودایە!.
گوڵە بە لاسکێ ڕایکێشاو
خستیە هەناوی خۆیەوە..
هەرچی گەرمایەك تیامابوو هەمووی دایە.
کە خاڵخاڵۆکە هەڵفڕی و گەیشتە دارەکەی ئەوبەر
گەیشتە بەر ماڵی خاڵی..
گوڵە لێرەوە، ساردبۆوەو، دڵی وەستاو، قاچی خزاو
کەوتە خوارێ و چاوی لێکنا..
درەخت بە تەنها مایەوەو لەو ساتەدا
هەورێك نزم بەو ناوەدا تێئەپەڕی
کە ئەمەی دی لە جێی خۆیدا قەیرێك وەستاو
تۆزێکی تر نزم بۆوەو..
ئەوسا لە گریانی درشت.. چی پێ مابوو
وەکوو پاییز.. هەمووی بەسەر
داری تەنیاو.. داری پرسەداردا داڕشت!

-27-

ئەی کچانی ڕەنگ ئاوریشمین
ئاگاتان لەم پاییزەم بێ!
ئەگەر شەوێکی شەختە بەند لەگەڵ تریفەی
تەزیودا، لەگەڵ خەیاڵی تەزیودا..
شیعرێکی دەم گۆنە کردووم
هاتە لاتان..

وەك بای سەر شاخ دەری مەكەن
چون تارمایی نەناسراوی سیلەی كۆڵان
یان تەمێكی دەمامكدار لێی مەترسن!
با لەبەر دەرگا نەوەستێ و
بێتە ژوورێ
ئەی كچەكانی ئاوریشمین
لەوەرزی پاییزی مندا
تەنها باڵا باڵای كچ و گەڵای كچ و
ڕەنگی كچە.. هەڵناوەرێ!

-28-

لە پاییزدا
ڕۆژێ سەرم كرد بە بێژنگ
ڕۆژێ هەقم لە بێژنگدا
بەقەدەر یەك
ڕەنگەكانی ژنم هێناو
ڕەنگەكانی پیاوم هێناو
تێكەڵم كرد..
بەیەكەوە بێژامنەوەو
سەرم سووڕاو سەرم سووڕا
لەدواییدا
ئەوەی ڕژایە خوارەوە
هەر پیاو بردی و هەر پیاو خواردیو

ئەوەی لە سەریش مایەوەو لە بێژنگدا
بە ژن بڕا!

-29-

من یەك كەسم و دوو سێبەرم لەگەڵدایە
یەك لەشم هەیەو دوو سێبەر!
گەر هەور بێ و باران داكاو.. هەتاو ڕاكاو
شەوق بنوێ و چرا بنوێ و مانگ بزر بێ
سێبەرێكیان وەكوو خۆیشم زۆر بە پەلە
ڕائەكات و بەجێمدێڵێ!.
بەڵام دووهەم لە تاریكی ماڵەكەشما.
لە تاریكی ژوورەكەشما، لەبەر بەفر و لەبەر باران و
بەر هەیوان و بەر ئاوێنەو لە هەر شوێنێ
سێبەرێكە قەت ناڕوات و بەجێمبێڵێ!
سێبەرێكە نووساو بە پێستی لەشمەوە بە قژمەوە
نووساو بە دەنگ و ڕەنگمەوە
سێبەرێكە بەسەر سێبەری یەكەمم و
جەستەیشمەوە ڕاوەستاوە..
من پاییزی هەمیشەیی ئەم وڵاتەم
من یەك ژنم و دوو سێبەرم لەگەڵدایە
یەك لەشم هەیەو دوو سێبەر
سێبەرێكیان جار ناجارو ناو بەناو
بزر ئەبێ و واز ئەهێنێ..

بەڵام دووهەم قەت ناڕوات و
دەست لە دەنگم و
دەست لە ڕەنگم و دەست لەسەرم و
دەست لە بوونم هەڵناگرێ
سێبەری پیاو!

-30-

زۆر نابێ لەو دەشتە مەلێکیان بینیوە
نە بە ڕەنگ.. نە شێوە.. نە خوێندن
لە مەلی تر ناچێ..
پەڕووباڵ لە پەڕی گوڵەباخ.. بەرسنگی
لە گەڵای چناری "سەرچنار"
خوێندنی لە دەنگی شنەباو ئاو ئەچێ
هەموو ڕۆژ ئێواران خۆرنشین یەکدووجار
ئەچێتە سەر کێلی ژوور سەری گۆڕی شەم
ئەلەرزێ و بین ئەگرێ و ئەخوێنێ..
ئەم مەلە کە ئەفڕێ گڕئەگرێ و ئەسووتێ
دوراودوور ناوبەناو بازنەی پڕیشکێ نارنجیی
بەدەوری ئاسۆدا ئەکێشێ و بە کلکی
نەسرەوتی لەسەر هەور لەسەر با لەسەر ئاو
دوو وشە ئەنووسێ
هەموو جار دوو وشەو هیچیتر
-یاسای پیاو!-

**كە وتیان من زانیم ئەو مەلە، هەر هەمان**

**ئەو کچە دڵدارەی دراوسێی ئێمەیەو پار هاوین**

**بەرامبەر خۆرنشین. داخەکەم! لە سەربان خۆی سووتان!**

-31-

**ئەمە چیرۆکێکی کورتە**

**ئەو کڵاوەی کڵاوکووڕە**

**لەسەریایە! هی خۆی نییە!**

**ئەوەی ڕوویدا زۆر دەمێکە..**

**لە ڕۆژێکی سەرماوسۆڵەی پاییزدا بوو..**

**ئەم هەر ئەفڕی و سەر تەزیوو**

**(با)یەکی تیژی سۆراخکەر بە دوایەوە..**

**دار بەڕوویەك بە فریای کەوت**

**بۆ چەند ڕۆژێ کڵاوێکی بە قەرز دایە..**

**بەڵام ئیتر کڵاوکووڕە..**

**ئەو کڵاوەی کردیە سەری**

**داینەگرت و**

**ئیستاو ئەوسایش ئەو قەرزەی خۆی**

**بە داربەڕوو نەدایەوە!**

-32-

**گەڵایەك هەڵوەری.. پەنجەیەك بە دوایدا.**

**پەنجەیەك هەڵوەری.. شیعرێکیش بە دوایدا.**

که شیعریش هەڵوەری.. ئەوینێك بە دوایدا.

ئەو وەختەی ئەوینێك وشکی کرد

وەرزێکیش لەگەڵیا.

ئەو ساڵەی وەرزێکم وشکی کرد

شارێکیش لەگەڵیا.

لە پرسەی شاریشدا..

گریانی وڵاتێك لەگەڵیا..

بۆ کۆستی وڵاتێك

زایەڵەی جیهانیش بە دوایدا.

ئەو وەختەی زایەڵەی جیهانیش

باڵیگرت بۆ سەرێ

بەدوایدا

ڕەهێڵەی گەردونێ داباری و

ئەمجارە خوایش گریا!

-33-

چنارێك بەیەك شەو کۆم بۆوەو لە قاچ کەوت

ئەو ڕۆژەی کە بینی باڵندەی عەشقەکەی کۆچیکردا!.

بولبولێ بە یەك شەو وەك گەڵای خەزانێ

دەنگی کەوت..

ئەو وەختەی گوێی لێ بوو گوڵزاری عەشقەکەی

لە گێژی سێڵاودا خنکاوە..

ڕووبارێ بە یەك شەو توایەوەو لەبندا بزربوو
ئەو وەختەی پێیانووت مەزراکەی عاشقی سووتاوە.
شەماڵێ بەیەك شەو مووی سەری و کاکۆڵی سپیی بوو..
ئەو وەختەی کە زانی کاوانی عەشقەکەی کوژراوە..
دوای یەك شەو لەهەمان وڵاتدا
شاعیرێ پیرەمێرد، باریکتر لە خەمی پاییزو
لە گەڵای خەزانیش چاو کزتر.. کۆماوەیش چون هیلال
لەپڕدا ڕاست بۆوە چون فوارەو
داری پیر.. مووی سپیی ڕەش بۆوەو
هەوری پیر.. بەیەك شەو گەنج بۆوە
ئەو دەمەی جوانترین چوار شیعری تەمەنی
بۆ عەشقی چنارو بولبول و شەماڵ و ئاونووسی!

# ناوەرۆك